


# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە

( مەلا محەمەدی کۆیی )

بەرگی چوارەم

# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە
( مەلا محمدی کۆیی )

**بەرگی چوارەم**

**جوزئی (١٠-١١-١٢)**

**لەسەر ئەرکی بەڕێز مام جەلال سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵ لەچاپدراوە**

# سورەتی (أنفال)

## لە ئایەتی ٤١ تا کۆتایی

﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ﴾ لەهەر حَربیٚ بیٚ. لەو أمره موژدە ئەدا بە فتوحاتی آتیە! ﴿مِنْ شَيْءٍ﴾ هەر چی بیٚ، کەم، زۆر، نامی، جامد. ﴿فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ﴾ پێنجێکی بۆ خوایە! ئەو خُمْسَە خوا ئەیداتە ئەوانەی کە ئەوا ذکر ئەکرێن. ﴿وَلِلرَّسُولِ﴾ بۆ پێغەمبەر. ﴿وَلِذِي الْقُرْبَى﴾ إي رەسولی أکْرَم. ﴿وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ ئەوانەی بیٚ مأوی، یا لەسەر ڕیٚ یان هەلگیرابۆوە، یا سَیّاحیٚ نافِعْ بۆ أُمَّتْ. إختلاف و قیل و قالي فُقَهایان لیرە بە من ذکر ناکریٚ – کەیفم پیٚ نایٚ–! باقی تریش بۆ ئێوە ئەی غانِمین! ﴿إِنْ كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللَّهِ﴾ بە إیمانی کامِلْ! ﴿وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا﴾ لە آیاتی نَصر، وثوق بەوەعدی حەق، مَلَك و رَمي نَبَوي! ﴿يَوْمَ الْفُرْقَانِ﴾ ڕۆژی (بَدر) فارِق (بَيْنَ الخَبيث وَالطيِّبْ)! ﴿يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ﴾ توشی یەك بوون ئێوە و دوشمنتان. ﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وە لیٚرە بە قدرەتی خۆی مساعدەی کردن. ئەگەر صرف بە زۆری بازوی خۆتان با! بیٚ إمدادی مَلَك و مُعجِزەي رَمي، ئەو خُمْسَە تان بۆ ئەمایەوە! طول و تَفصيلي غنيمەت با لە ناو کُتیبان دابیٚ!. .

ئەمرۆ ناشُکری نەبیٚ کوا غَنیمەت؟ هەر سەرومالٚ و ملکی موسلمانانە بە تالآن ئەڕوا!. ئەوە سەیرە (إماميَّة) ئەیکەن بە شەش تَقسیم، سهمی خواو سهمی پێغەمبەرو سهمی ذوي القُربي، ئەدرێتە إمامی قائِمقامی رەسول! سیٚ یەکەی تریش بۆ أیتام و مَساکین و إبن السبیل وآلی محمد! (بناءً علی هذا) سیٚ سَهم ی اِمّام پاش غَيبەتی اِمّامي دوازدەمین وەك (سَیّدي الوسي)

ئەفەرموێ ئەبێ لە سردابی (سامَرّاء) دابندرێ تا تَشریفي مُشَرّفي لەبیر دێتەدەر!! ئەگەر وایان کردبێ أمّامی (مُنْتَظَرْ) مالّی بۆ کۆ بۆتەوە ئەتوانێ حَربی پیێ لەگەلّ (ئەوروپا) بکا!. وابزانم (جَعْفَرِیّە) غَنیمەت عام ئەکەن، هەرچی بە دەست کەوێ، بە حَرب یا بەکَسابَتْ، ئەو خُمسە ئەدرێ بە وکیلی إمامی غائِبی مُنتظَرْ– عَجَّلَ اللهُ فَرَجَهُ –. ئەو سالّەی لە بغدا بوم (١٩٢٣) میلادی شخصێ (حاجی علي) ناو لە أبنای جعفری ئەیگوت پار چومە لای مُجْتَهِدْ رُخصەتم لێ خواست بۆ حج، ووتی: چەند ئەبەی بۆ مَصرەف؟) ووتم: (پێنج هەزار روپیە) ووتی: (هەزاری بۆ ئێمە چوار هەزاریش ببە بۆ حج)، لە نَشْأی قسەی دا بەدەرئەکەوت أمێدی قیامَتی بە هەزار روپیەکە زیاتر بو لە چوار هەزارەکە!!. تأویلی غَنیمەت لە (إبن عباس) نقل ئەکەن حتّا إمّامی (عمر) پێی ئەفەرموو ئەگەر لەبەر ئەو تأویلە نەبایە ئەمکردی بە (والی)، هەزار هەزار رضواني خوا لە إمّامی (عُمر) چەند زاناو تێ گەیشتوو بووە!!!. لە سایەی (إبن عباس) عُلَمای (جعفری) شاهانە ئەژین! مەلای (سُنّي) علی الأكثَرْ ئەوا لە برسان ئەنالّن!!.

حکایەتێکم بیست لە عالمێ شهیر سماحتمآب (مەلا أبوبکر افندی) هەولێری– خودا دەوامی بدا– ئەیفەرموو: (شێخ نِعْمَةْ مەلای) بو لە خانەدانی ((شێخ قادری سنەیی)) شارحی ((تَهذیب)) مَعاشێکیان بۆ تَخصیص کردبو، مَعاشەکەی حەوالّەی صندوقی هەولێر کرابو. ڕۆژێ لەگەلّ جمعێ لام بوون یەکێ لەوان مەلا محمدی ((دێرە بروشە)) بو لەو أثنایە دا قسە لە مسألەێ شرع کرا إیجابی کرد کتێبیان هێنا، شێخ نعمە بە مەلای دێرە بروشەی ووت تۆ فَهرستی جێگایەکە بدۆزەوە أمّا بیدەرە من بیخوێنمەوە، مەلای دێرە بروشە لە شرع زۆر شارەزا بوو أمّا قووەی عِلمی نەبو أغلب عبارەتی نا موافق ئەخوێندەوە، طَبیعي ئەو قسە لە دلّی دێرە بروشەیی گران هات! جێگایەکەی دۆزیەوە خۆشی تِلاوەتی فەرموو– رَغماً علی شێخ نِعمە–، دوایێ بالمُناسبە عَرضی شێخی کرد مَعاشەکەت چەندە؟ ووتی سێ صەد قرۆشە، مەلا ووتی

سَبحان الله ڕۆژێ جَنّة مَكانى سُلطان عبدالعزيز خانى عُثماني بێ لەناو كشت وكێڵ چاوى بەكەرێ گروێ بريندار ئەكەوێ، ئەڵێ: ئەوە چيە؟ عَرضي ئەكەن ئەوە كەرە كەلكى لێ براوە صاحبى بەرەڵاى كرديە، سُلطان زگى پێ ئەسوتێ أمر ئەكا سێ صەد قروش معاشى بۆ ئەبڕێتەوە تا ئەمرێ پێى بەخێو كەن! پاشان مەلايەكانى إسلام بەدڵ دوعايان ئەكرد كەرەكە بمرێ بەڵكو معاشەكەى بەسەر معاشى مەلايەكان دارە بەش كرێ!! فەرموى شێخ نعمە بە مَخْجولى تشريفى هەستا ڕۆى).

ئيتر بزانن حاڵى مەلايانى (سُنّى)چۆنە! ئەوێ ڕۆژێ وا بو ئەمڕۆ ئەبێ كووبێ؟ ﴿إِذْ أَنْتُمْ﴾ لە ڕۆژى التقا. ﴿بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا﴾ لە طَرَفِ وادى نێزيك (مدينە) بوون ﴿وَهُمْ﴾ دوشمنتان ﴿بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَى﴾ أَبْعَد و دوورتر ئەوان لە طرفِ لاى مكەوە بوون. لە قرا تى (زيدى بن على) (قُصْيا) ئەڵێن ئەوە قياسە (قُصْوى) شاذّە، أمّا كَثيرُ الإستعمالە. يەكێ ئەڵێ: (فُعلى ي واوى ئەگەر ببێتە ناو((عَلَمْ))، واو ئەكرێ بە ((ێ)) وەك دُنْيا، ئەگەر صِفَتْ بێ، لەسەر أصل ئەمێنێ!) يەكێ ئەڵێ: (بالعكس). (قُصْوى) لُغَتي (حِجازە)، (قُصيا) لُغَتي (تَميم)ە. لەهەر حالَدا (قُصْوي) كَلمەى فَصيحە. بە ذوقي نا چيزانەم (دونيا) لە (دنوى) خۆشترە وەهەروەها(قُصْوى) لە (قُصْيا).

﴿وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنْكُمْ﴾ لە لاى بەرە ژێرى ئێوە بوو. مَقْصَدْ ئەوە بوو مَوقعى حَربتان باش نەبوو، إى دوشمن باش بوو، علاوەى كەمى وبێ أسبابى ئێوە، زۆرى و بە أسبابى وان. وە بَعضێ لە ئێوە دڵيان لاى كاروانەكە بوو، ئەمەش نَوعە سستيەكى ئەدا، لەسەر ئەو حاڵە ئێوە غالب بوون! فإذاً ئەو غَلبە كأنّە مَحضاً لە طَرَفِ خواوە بوو! كە وابێ دڵ بەتەواوى لە (خُمْس) بەردەن!!

وەحَربەكە لەمَقولەى (صُدفە) بوو، بێ سابقەى إحضارات! ﴿وَلَوْ تَوَاعَدْتُمْ﴾ ئێوە و ئەوان ﴿لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ﴾ چونكى يقينتان بوو ئێوە دەردەستى وان نايێن! ﴿وَلَكِنْ﴾ بێ مواعَدە على سبيل الأتّفاق مُصادفَتان كرد! ﴿لِيَقْضِيَ

اللّهُ أمْرًا﴾ شتێ. ﴿كَانَ مَفْعُولا﴾ لازم بوو بكرێ مُقَرَّرْ بوو، ئەويش نَصْري مؤْمن و كَسْري مُشرك بوو!. دەوامی ً ئەوان لەسەر شوكت و شكوهيان، بەتەواوی ئەبوە مانع لە نَشری دين! ئەگەر خوا وای نەكردبا، چۆن ئەبوو؟ لام وايە (شێخی أشعری)ش ئەو وُجوب و لزومە ئەسەلمێنێ! چونكی دينيە!. ﴿لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَا مَنْ حَيَّ عَنْ بَيِّنَةٍ﴾ بۆ خاطري ئەوەی ئەمرێ، يا لەسەر كفر ئەمێنێ، لە دەليل و بورهانەوە بمرێ، يا بەكافری بمێنێتەوە! (وكَذا) ئەوەی ئەژێ ژيانی مادّی و مَعْنَوي، شُبهەيان نەمێنێ، زێرا ئەو نَصره بلا تَرَدُّدْ مُعْجِزە بوو! ئەوەی لەوان لەسەر شرك و كفر دەوام كا، مُجَرَّد لە عنادەوەيە!! ﴿وَإِنَّ اللّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئاگای لە أحوالّتان هەبوو، دوعای ئێوەی بيست، قبولّی كرد، مَقْصَدی بەجێ هێنان! أمّا ئەبێ إنسان تەماشای مُعامەی جەنابی حەق كا، كاری خوا دەربارەی عباد بەلّكو حَيوانات بە وەقتی ضعف و قوەت ئەگۆرێ. ڕۆژێ بە تەيرۆكە (طَيراً ابابيل) محافظەی (بَيت)ی ئەكرد، ڕۆژێ بە (مەنجەنيق) ديواری (بيت) يان ئەڕوخاند، بە جواب نەدەهات! لە ڕۆژی (بدر) ئەوەی كردی كردی، لە حَربی (أُحُد) وانەبوو! ئەوێ ڕۆژێ موسلّمانان بە قوەت بوون!. لە زەمانێ بێ دەسەلّاتی دوعا قبولّ ئەبێ، پاش ئەوەی موسلّمان لە سێ صەد مِلّيون تجاوزيان كرد، خوا بە دوعا ئيشيان بۆ ناكا!!! مريشك و سائری طَيري تر چۆن مُسَخَّر ئەكا بۆ بەخێو كردنی فەرخەيان، كە پەرەوازە بوون چۆن لە خۆيان ئەكەنەوە؟ فەرخەی إنسان بە دووسالّ بەسەر پێ ئەكەوێ، فەرخەی چار پايان بە چارەگێك! ئەو (مُعين) ی هەيە، ئەم نا!! ئيتر واجبە إنسان ملاحظە كار بێ!! خوا نەكاتە حائل لە بەينی خۆو قَلبی. ﴿إِذْ يُرِيكَهُمْ اللّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلاً﴾ لە خەوندا بەكەمی نيشان دای، وات لەخەوا ديت ئەوانە عَدَداً، كەمن، ديار كەوت ئەو كەمی عددی، كەمی كەيفی بوو، زۆری مغلوب بەكەم حساب كَمِيَّەی مَعْنَوی بەكارە!. تفسيری (مَنام) بەچاو، روءْيَتْ بە روءْيَتي بە خەبەری، يَعنی بە مَحَلّي (نَوم) كە چاوە، يَقْظَةً عَياناً ئەوانەی بەكەم نيشانی توودا، وەك لە (حَسَني بَصْري) نقل ئەكەن!! (ئەو تفسيرە

شتێكه به خەون ئەچیْ! إنساني بەخەبەر ئەو قسه ناكا!) وەحملى (منام) لەسەر نوستن وه تقديرى (مُضاف) يَعني مَحَلّي (نَوم) بۆ تَوجيهي كَلامي (حَسن)دەها دوورتره!! مَعَ أنّه روايات زۆره كه پێغەمبەر بەو نَوعه له خەونيا ديون و خەونى بۆ صَحابان گێراوەتەوه طَبْعاً صَحابانيش وثوقيان بەخەونى پێغەمبەر كرديه! ئەو له أوائلى نُبُوّەت (لا يَري رؤياً الاجاءَ مِثْلَ فَلَقِ الصّبحِ) وەك حضرەتي (صدّيق) ئەفەرمویْ. فكَيْفَ بَعْدَ الْوَحي له زەمانى رسالەتيا؟(إبنُ جَرير) تَعينى ئەو قائله ناكا ئەلیْ: (زَعَمَ بَعْضُهُمْ). (سَيّدي آلوسي) ئەلّیْ: (رجام وايه روايەت له ((حَسَن)) صحيح نەبیْ) ﴿وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيراً لَفَشِلْتُمْ﴾ ئەترسان نەتان ئەواني إقدام كەنه محاربەيان ممكن بوو ئەو خَوفة بهاتبا دلّیْ پێغەمبەريش ﴿وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾ مُخالفەیْ كەيەك نەگرنەوە، مانِعى إتفاقيتان بیْ لەسەر حرب. ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ﴾ سەلامەتى كردن له فشل و منازعه به پەسەنديدەى (إبنُ جَرير) به قَرينەى مَقام و إتّصال، حَقيقةً ئەوه ئاشكرايه. دوو تفسيرى دى نقل ئەكا (إبنُ جرير) بەلاّم پیْ يان راضي نيه! أمّا مَعَ الأسَف من نازانم معناى قسەكانيان چيه! ﴿إِنَّهُ﴾ خوا ﴿عَلِيمٌ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ كَيْفياتي نَفسيّه له ئازاى و ترسنۆكى خۆكوتن و بیْ ئارامى و سائرى صفاتي تر، خوا له صاحبيان چاكتر ئەزانیْ! گەلیْ كەس بەلاف و گەزاف و أشْتُلمْ خۆى به (رۆستەم) ى داستان ئەنوێنیْ، أمّا له هەنگامى مُصادَمه له (فسۆس) پالەوان پوچتر دەردەچیْ! ﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ﴾ ئەوانەى نيشانى ئێوه ئەدا ئەى موسلّمانينه! ﴿إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِيٓ أَعْيُنِكُمْ﴾ رأيَ العَين في اليقظةِ ﴿قَلِيلاً﴾ حتّا (إبنُ مَسعود) لەسەر بیْ هێزى خۆى بۆ تثبيتي خۆى ئەفەرمویْ: (فلان ئەوانه به حەفتا كەس ئەبينى؟ ) ئەويش له جوابا ئەفەرمویْ: (بەصەديان ئەبينم). ﴿وَيُقَلِّلُكُمْ فِيٓ أَعْيُنِهِمْ﴾ له أوّلەوه ئێوەى لەناو چاوى لەبەر چاوى وان كەم ئەنواند! حتّا (أبوجهل) ئەيگوت: (بەچەك شەڕيان لەگەلْ مەكەن! بيان گرن به پەتكان بيانبەستنەوه!) وه ئەيگوت: (أصحابى محمّد بەقەدەر ئەوەندەن فەرخه حوشترێ بخۆن!).﴿لِيَقْضِيَ ٱللَّهُ

أَمْرًا كَانَ مَفْعُولا﴾ وای نەنواندبا، حربتان نەدەکرد، بەسەر نەدەکەوتن! أمّا لەوەقتی قِتال مشرکەکان موسلّمانەکانیان دوو چەندانەی خۆیان ئەدیت، ئەوەش بووە سَبَبْی وَهْن هَزیمەت و هەلاّتنیان. ئەو نَوعە تقلیل و تَکَثْیره إنکار ناکریّ وە تحلیلي بە عُلماي نَظَر لام وایە نابیّ! بڕوا ناکەم کەسیّ هەبیّ لە دونیا خەون نەبینیّ، وعلی ألأکثر موافِق دەر ئەچیّ، ئەگەر چی لەو (حین) هیچ نیە بَعضە خەون تأویل ئەکریّ تأویلی زۆر ئاشکرایە، بَعضی خَفیە! ئەمە چیە؟ چۆنە؟ حَقیقەتی دەرناکەویّ!! مُتَکَلِم و حُکما قسەیان لیّ کردیە، أمّا بەحەق کشف نەکراوە، حتّا بۆ أربابی کشف. حُکَمای عصر خریکن، بەلاّم لام وایە ئەو سرِّە بۆیان عَیان نابیّ. لە آثار دەرئەکەویّ گەلیّ حَیوانات خەون ئەبینیّ. مَعَ أنَّهُ– نَفسي ناطقەیان نیە. وە صِدقی رؤیا علی الإطلاق پەکی لەسەر صَلاح وتَقوا نەکەوتووە. دیومە إنسانی عادی خەونی دیوە بۆمی گێراتیەوە طِبْقاً دەرچووە! بەلیّ إنسانی درۆزن خەونیشی درۆیە! (شێخ أبو علی) ئەفەرمویّ: (عَهدم کردیە بە خیالّیش درۆنەکەم، تاکو خەونیتشم ڕاست بیّ!). دەك بەلاّ لە درۆیان دا، خەون و یَقظەت تێك ئەدا!. (سَیِّدي آلوسي) رحمە الله لێرە زۆر خۆی ماندی کردیە، طول و تفصیلی هەیە، ئەوەی حەز ئەکا، تەماشای کا، خالی نیە لە فائدە، وَلَوْ بە حَقیقەتیش ناگا ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ﴾ نهایت ئەوە، مَبْدَأْ لەوە، أسراری یقظەت و مَنام بەحەق، ئەو ئەیزانیّ، حَقیقةً لە گەلێك جیّ (سَلَفی) إصابَتْ ئەکەن ئەفەرمون: (نُقرٌ وَنَمُنٌ)! ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً﴾ جماعتی، بە حَرب وێك کەوتن، وێیان کەوتن. ﴿فَاثْبُتُوا﴾ خۆ بگرن هەلّمەێن! ﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا﴾ زۆر یادی خوا بکەن، دلّتان بەو مُتَعَلّق بیّ! مَقْصَدْ حَرب بۆ خوا، بە یادو ناوی خوا ئەبیّ!. – وَاللّهُ أعْلَمْ– لام وایە تهلیل وتکبیر و دوعا زۆر مراد نیە! ئەمڕۆ حَرب لە دەرەجەیەکە قَلب و قالب ئەبیّ بە محاربەکان مشغول بن! کَیدی خَصم ئەوەندە وردە ئەبیّ بە غایَتی وردی مُتَرَصِّد بن. حتّا بە ذکریش، چ لِسانی چ قَلبی، نابیّ ئاگاتان لیّ ببریّ!. شخصیّ (کۆی) لە حَربی (چنا قَلمە) ی هاتەوە

باسی خواسی حَربی ئەگێراوە ووتی: (جاریٚ قوماندانی ئێمە أمری کرد بچن بۆ مَوقعیٚ ((گردە لۆکەیٚ)) بووە ئێمە چوین نێزێك بوو بیگەینیٚ، غایَت بە شِدَّەت أمری رجعەتی دا، گەڕاینەوە چەند خَطوەیٚ پاش چەند خطوەیٚ موقعەکە شەق بوو، ئەگەر ئێمە لەسەری باین هەلا هەلا ئەبوین، تومەزانە دوشمن لەغمی لیٚ دانابوو بەبارود و ساچمە ئاخین بوین، کە ئێمە نێزیکی بوینەوە ئاگری دا، قوماندان حِسَّي ئەکا، أمری رجعەت ئەدا)، لەو نَوعە هەنگامەیە ئەبیٚ حِسّ و حَدس و هەموو قوای ئاگاداری حَرب بیٚ، أمّا بۆ مَقصَدي حَرب ئێمە عَرضمان کردن ثابتة لا يَتَغَيَّرَ مؤْمِن ئەبیٚ حَرب بۆ خوا بکا! وە ئەتوانیٚ امْتِثال بکا، گەرچی مَعَ الأسف نەکرا! ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بە ظَفَري دونيا و أجری آخرەت فائز ئەبن! ﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ دەعەوتی وان بۆ حیاتە! ﴿وَلاَ تَنَازَعُوا﴾ إخْتِلاف مەکەن! وای چەندی خودا نهی موسڵمانانی کرد لە مُنازَعە و إخْتِلافْ! گویٚ یان نەدایٚ! بە إختِلاف إختلافیان کردە رەحمەت! بەلیٚ مَيْلي فاسِدْ إصْلاح نەکریٚ، نَزعە نا بریٚ! هەرکەس بۆ لای خۆی نَزع ئەکاو ئەیکێشیٚ، هەر بۆ خۆی ئەویٚ، ئاگای لە مَصْلَحت و مَفسَدەي عالەم نامێنیٚ! ﴿فَتَفْشَلُوا﴾ ئەگەر مُنازعە بکەن، یەك ناگرن، بیٚ هێز ئەبن، ئەترسن، زۆر بە عَیب و دووری نازانن بۆ طَرَفِي آخر ببنە طَرَف دار! دوشمنی ئەوها لەبەینی أُمَّت زۆر بوو، بۆیە بیٚ زەوەر بوون! ﴿وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ بینتان ئەڕوا، بیٚ دەوڵەت و عِزّەت و نفوذي أمر ئەمێنن! یاخود بێکەنیتان ئەڕوا بۆ أطراف دوشمن مُطَّلِعْ ئەبیٚ بەسەرتان، بەسوکی بەسەرتانا غالِب ئەبیٚ. (سبحان الله!) موسڵمان چەن بیٚ گویٚ بون و چیان بەسەر هات! حالاش لە مُنازَعەیان دانەناوە! حتّا لەو دوو سیٚ ساڵانە حکومەتی (مراکیش) لەبەر مُنازعەی خۆ بەخۆی کەوتە ژێر حمایەی (فرنسا) إستقلاليەتیان نەما! ﴿وَاصْبِرُوا﴾ خۆ بەخۆی خۆ بگرن! تَحَمُّلي ایذاي یەك بکەن! لەگەڵ یەك بیٚ ئارامی مەکەن!. لام وایە ئەوە باشترە لە فەرموودەی (سَيِّدي آلوسي): (عَلي شَدائِد الحَرب). ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ چونکی خوا زۆر بە صَبْرە، ئەگەر لەبەر نِهايَتی صَبری نەبا، ئەبا ئەمرۆ کورەی

أرض تارومار كا، ئەوەی فَیضیکی لەم صفەتەی إلاهی هەبیٚ نائِلي مَعیَّتْ ئەبیٚ، بیٚ إتّحادو حُلول و قُربی مَکانی! ﴿وَلاَ تَكُونُوا﴾ (أيها الؤمنون!) لەمڕۆ تاقیامەت ﴿كَالَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ﴾ لە أُمَمي سالفە لە ووڵاتی خۆیان هجومیان بۆ سەر ووڵاتی دوشمن ئەبرد، بیٚ وجهیٚ وجیە ئەچون ﴿بَطَرًا﴾ بە فَخرو مُباهات ﴿وَرِئَاءَ النَّاسِ﴾ ناویان بڕوا، بلێن ئازان. حاصلی ئێوە هجوم مەکەنە سەر خەڵکی بۆ طَمَع و إستِلا ناوو ناوبانگ، وەك بَعضیٚ أمَمي مُسْلمەی سابِقە کردیان، وە آخری تیٚ چوون! حَربی ئێوە مُدافعە بیٚ و بۆ خوا بیٚ! ئەو جێی ئەیگرن چاکی حِفظ کەن! مَعَ الأسَفْ موسڵمانان گەلیٚ لە أممی دی خراپتر بوون، نەك لە حەق دوشمنی دین، لە حەق خۆشیان! تاکو هەمویان ماڵیان وێران بوو. پاش وَقعەی (جەنگیز) و (هۆلاکۆ) لەسایەی دەوڵەتی (عُثماني) موسڵمان زیندو بوونەوە، أوروپایان لەرزاند گەلی دُوَلی إسلامی و مَسیحیان تێك دا، مُلْکیان زۆر واسِع کرد، آخری لەبەر طَمَعي إسْتِلاو و بیٚ سیاسەتی مەلایان لەگەڵ دەوڵەتی ئێران بەگژ یەکا چوون، حَرب درێژەی دایٚ، بەینە بەینە صُلحیان ئەبوو، زوو بە زوو تێك ئەچونەوە، شەڕیان ئەکردەوە! تاکو طَرَفَین بیٚ هێز بوون. دەوڵەتی عُثماني ئاگای لە أوروپای نەما، أوروپا خۆی خرکردەوە، مَحْکَمْ بوو، عاقبەت آسیایان إستِلا کرد! لەبەر رَقابَتی خۆیان نەبا بستە عاردیٚ بەدەست موسڵمانانەوە نەدەما! مەلایانی دی تَفسیریان کردوتەوە بە (کُفّاري قُرَیش) کە هاتن بۆ حَربی (بَدر)، ئەویش خراپ نیە! مُراد نَهي موسڵمانانە لە تَشَبُّە بەو نَوعە کەسانە، موسڵمان بن یا کافری ڕابردی یا حاضِرْ! ﴿وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئەگەر مراد کافری (قُرَیش) بیٚ، ظاهِرە حاجەت بەبَیان نیە وە لە گەلیٚ جیٚ ئەوەی فەرمووە، ئەگەر مُراد موسڵمان بن خۆ بەخۆی لەدەرحەق دوشمن صَدْیان دوو نَوعە:

١) إی خۆ بەخۆی یەکتریان تَکْفیر ئەکرد وایان بۆ رەعیە ئەنواند کە قتالی ئەوانە واجبە مُضِّرن بۆ دین مانِعی تَوْحیدي کَلِمَنْ.

٢) إی دوشمن ظاهر ترە- رەعیە زوو تری پێی هەڵئەخەڵەتیٚ لە ڕێی خوا، کە تَعَدّا نەکردنە (إدارةً) (سیاسَةً) حُسنی جَوارە، بە (حُسنی أخلاق و أعمال)دین خۆشەویست کردنە، بە سووکی لایان ئەدەن. ﴿وَاللّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ عَمَلي ظاهِري باطِني خَفي وجَلي، لەو بزر نابیٚ. ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمْ﴾ بۆ ئەوانەی مَنْعي خەڵك ئەکەن لە ڕێی خوا ئامّادەی فتنة و شەڕوشۆڕن ﴿الشَّيْطَانُ﴾ شَيْطاني مَشهور یا رَجُلیٚ لە رجالی سِیاسَتْ، مُسْلِم غَیرە مُسْلِم، بۆ ئەوان ئارایشی دا ﴿أَعْمَالَهُمْ﴾ ئێوە باشن لەسەر حەقن عادلن بە أمن و أمّانن، ئەوانی دی بەدن تَجاوز لە حەقی ئێوە ئەکەن ﴿وَقَالَ﴾ وەگوتی ﴿لاَ غَالِبَ لَكُمْ الْيَوْمَ﴾ ئێوە بەقوەت ترن. ئەوان با بە قوەت بن، ناگەنە ئێوە عَدَدی و عُدَدی. عَسْكري مُدَرَّب و مُجَهَّز و مُنْتَظَمي ئێوە لە کیٚ؟ إی وان لە کیٚ؟ ﴿مِنْ النَّاسِ﴾ هیچ کەس. ئەوانەی ناویان طَرَف داریان ناکەن، هەموو لەوان بیٚ زارن. ﴿وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ﴾ عهد و پەیمان و وَثیقەتان لەگەڵ ئەکەم من بە هەموو قوەت و قُدرەت و مُکنەتی دەوڵەتی خۆم مُحافظەتان ئەکەم، لَدی الإیجاب خۆم ئەهاوێمە غماری حرب. بەو قسانە هەڵئەخەڵەتێن هەڵئەکوتنە سەر دوشمنیان ﴿فَلَمَّا تَرَاءَتْ الْفِئَتَانِ﴾ مُلاقاتي یەکیان کرد لێك بەدەر کەوتن ئاگری شەڕ هەڵایسا ئەوجا ﴿نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ﴾ پاشە و پاش ئەگەڕێتەوە لەسەر هەردوو پاژنان ﴿وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكُمْ﴾ چ مناسبەم هەیە لەگەڵ ئێوە؟ هاودینتانم؟ هاو مَذهبتانم؟ ﴿إِنِّي أَرَى مَا لاَ تَرَوْنَ﴾ ئێوە لە عالەمی سیاسەت خەبەرتان نیە! ئاگاداری حاڵی دووەلی نین! ئەمن مُداخَلە بکەم، دەوڵەتیٚ دی مُعاوَنَتی وان ئەکا! ئاگری حَرب درێژ ئەبیٚ، ئەوجا خۆ بەخۆی تێك ئەنگژێن! ﴿إِنِّي أَخَافُ اللّهَ﴾ لە خوا ئەترسم. چ خوا لەمن هەڵئەگریٚ بیٚ سوچ و قَباحَت مَحْضاً بۆ خاطري ئێوە بەگژ ئەوانەدا بچم؟ مَسئولیەتی (بین الدوَلی)ش لەویٚ ڕاوەستیٚ!!.

تفسیری (شَیْطان) بە (شَیطانُ الإنس) (إبلیسی سیاسي)، لەم أعصارە موافق ترە لە تفسیری بە شَیطاني بزری جنّي! بەلام بأیّ تَفسیرٍ تَفسیر بکریٚ،

کار بەدەستان خۆیان لێ ناپارێزن! بەکەیفی وان خۆیان ئەخەڵەتێنن! ﴿وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ بێ شك ئەو ظلمە لەو بێ چارانە بکەم، دوو چاری عقابی إلاهی ئەبم! عقابی خوای زۆر بە شدەتە معلوم نیە دەوڵەتم مەحوناکا!. بەلێ ئەو نَوعە شیطانە لازم بوو موسڵمانان خۆیان لێ بپارێزن! بەدرۆ و دەلەسەیان باوڕ نەکەن! ئەفسونیان تَأثیریان تێ نەکا!. حَقاً ئەو نَوعە شَیْطانە ئەمڕۆ لە بشر دا هەیە، شیطاني بزر نَظَر بەوان صوفیلکە یە!! بەلام مَعَ الأسَف گوێ یان نەدا فەرمایشی خوا هەڵخەڵەتان تێ چوون!. وَعَلى تَقْدیر تَفسیري (شیطان) بما هُوَ المَشْهور، مُحَقِّقین بەس ئەیکەنە (وَسْوَسە)! مَجاز و إسْتِعارە لە (إنّي جارٌ) وە (نَكَصَ) دا ئەکەن. نَقّالان حکایەتێ إیراد ئەکەن وە قتاکی قُریش لە (مَكّة) خڕ بوونەوە تدبیر بکەن چ بکەن؟ واردی خاطریان بوو کە ئێمە لەگەڵ (كَنانة) سابقاً عَداوەتمان هەیە نێزیکە ئەگەر ئێمە بڕۆین بۆ طَرَفي (مدینە) شار چۆل کەین، بەسەر (مکە)دا دەدەن تالآنمان ئەکەن ژن و منداڵمان بە وردە و یەخسیر ئەبەن! لەو ئانە (إبلیسی) پڕ تلبیس بە صورەتی (سراقە بن مالكی كَناني) کە یەکێ بوو لە أشرافی قەوم، ئەو ئەفسانەی خوێندەوە ووتی: (من حِفظي ئێوە ئەکەم لە بَنی كَنانە). (قُریش) أمین بوون لەگەڵیان هات تا وەقتی هەنگامە لەواندا دەستی لەناو دەستی (حَرْث بن هُشام) دابوو. کە دیتی ملائکەت هاتن بۆ إمدادی لەشکری إسلام، گەڕایەوە کشایەوە، (حَرث) گوتی چی ئەکەی؟ ئایا مَخْذول مان ئەکەی؟ بەو جەوابە جوابی دایەوە!. کە (سُراقە)ی صُوَري هەڵات لەشکری کفار قلب بۆوە، کە چونەوە (مکە) ئێمەی شکاند ئەو خەبەرە گەیشتە (سراقە) ووتی: (والله خەبەرم لە چونتان نەبووە، تا خەبەری هەڵاتنتانم بیست!). ئەوجا خِلافیان هەیە لە (خَوف)ی (شَیطان) لەچی ترساوە؟ . (سَیِّدي آلوسي) نَقل لە کِتابي (آلتیجان) ئەکات کە ئەو ڕۆژە (شیطان) کوژراوە! (سَیِّد) ئەفەرموێ ئەو قسەی (تاجی سُلطان)، درۆیە!.

ئەمن نالێم (شَیْطان) کوژراوە، أمّا لەم عصرە لە چەنگ جَهَلەی (طریقەت) وَمَهَرەی (سِیاسَت) مەرگی خۆی بە ئاوات ئەخوازێ لە سَفالەت و سَفاهتی ئەوان مَخجولە، لە مَکرو کَیْدی ئەمان مَلولە عاجزە نایان گاتێ وەك کوردی ئەلێ: (صەد فرتی بە فرتێکمان)، ڕەنگە إنسانێ وەك (مۆسۆلۆنی) کە ببینێ هەزار چەمە لۆك لە خۆی بکاو بڵێ: (دەك عەمرت نەمێنێ لای خۆت تۆش إبلیسی!).

﴿إِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ﴾ ظاهِرْ مؤمِنْ بەدڵ کافر ﴿وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ شَك و تَرْدید، یا ترس، کە خەبەریان زانی موسڵمانان فکری شەڕیان هەیە! ﴿غَرَّ هَؤُلَاءِ دِينُهُمْ﴾ دینیان ئەوانی غَرواندیە چاویان سوور بووە خۆیان لێ گۆڕاوە، لەبەر غرور نەبێ عَدَدێ کەم و بێ چەك چۆن بەگژ جمعێ زۆرو پڕ أسباب دا ئەچن؟ ﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ بە تَوکّلي صحیح. ﴿فَإِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ﴾ غالبە مُتَوکّلان غالب ئەکا! لە هەنگامە ئاگاداریان ئەکا! ﴿حَكِيمٌ﴾ بە علم و حکمەتی خۆی کاری وا ئەکا سەرمدانی عَقل و حکمەت تیای مُتَحَیّر ئەبن. لکن زۆر جار موسڵمانان لە تَوارِخي مُتْخَلفة بە تَوَكُّلْ هەڵخەڵەتاون. زاتاً مَعنای حَقیقي تَوکّلیان گوڕی، بۆیە کار گۆڕا! فی الحَقیقةً فَرق لە بەینی تَوکّل واعتزاري بِالدّین بالإعتقادیات لازمە! وەلێك کردنەوەی معامَلەی إلاهي، لە أوائِلی نَشْأتْ و، أیّامی قووەت، غایَتْ مُهِمّە! هەروەکو تَمیزی تَدبیری تَهَوری و ترسی و فکرو بَصیرەتی، گەلێ حَتْمە، بۆأصحابی رأی و تدبیر مُتَأمِّل لە آخری کاران! ﴿وَلَوْ تَرَى﴾ أیُّها الرائي! المُنافِق! المَریضُ القَلب! ﴿إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەمردن بەکوژران ڕۆژی (بدر) ێ. ﴿الْمَلَائِكَةُ﴾ ئەو ملائکە تانە کە (وُکّلَ بِهِمْ)! . سُبحانَ الله! ﴿يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ﴾ لە پێش و پاشیان ئەدان، ئەتزانی خوا چۆن نَصرەت و یارمەتی ضعفاي مؤمنین مُتَوکّلین ئەکا، جارێ تر ئەو هَذَیانەت نەدەکرد! ﴿وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ لە ڕۆژی قیامەت. ئەوەشیان پێ ئەوتن، ئەو بشارەتەیان ئەدانێ. . ﴿ذَلِكَ﴾ ئەوەی ئەیچێژن ئێستا و آخرەت. ﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ بە سابقی أعمالتان بوو. ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾ تَعذیبی

بە مقابلەی کفرو عصیانە. خوا هیچ ظُلُمْ لە هیچ کەس ناکا!. ئەو حُکمە لە بەینی (أشاعِرَ)ە و (مُعْتَزِل)ە مُتَّفَقٌ عَلَیەیە! أمّا (أشاعِرَ)ە ئەڵێن: (هەر چی بیکا ظُلُم نیە) حتّا بۆی هەیە عَذابی مُطیعێ بدا بە عَذابی گوناە کاران). (مُعْتَزِلي) ئەڵێن: (ظُلُمْ قَبیحة هەرچی قبیح بێ کردنی بۆ خوا محالە!). (زُمَخْشري) و (بَیْضاوي) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ هەریەك بە گوێرەی مَذْهَبی خۆی معنا لە آیَت ئەداتەوە. لام وایە هەر فِرقە تەماشای صِفەتێ لە صِفاتی إلاهی ئەکا، ئەو تەماشای قَهر و غَلبە و وَحدانیەتی ئەکا، کمالی قُدرەتی إلاهی لە بێ تَقْیِدیدا ئەبینێ، ئەم تەماشای حَکیمی و عادِلی و شارِعی حضرەتي (حەق) ئەکا وە هەردوو مُتَّفقن بالفعل مُطیع و عاصِي تائِب عَذاب نادا لە عاصِی غَیرە تائبْ خِلافیان هەیە، (أشاعرە) ئەفەرمون: (بۆی هەیە عَفوی بکا، (مُعْتَزِلە) ئەڵێن: (بۆی نیە).

چەند ساڵێ لەمەو پێش لەخەوما (بابم، شێخ عبدالکریم، شێخ معروف و شێخ محی الدینی کوڕانی بابە شێخ بە کۆمەڵەی لە مَوقعێ دانیشتبون منیش نەختێ لەوان دوور لە طَرَفِي شَرْقي وان پاڵم بە پێچکەی طاقێ دابوو لە پشت سەرم تاقێ شکل موغەیریانە هەبوو، دەنگێ هات وأمّان زانی لە جهەت حَضرەتي کبریائی بوو:﴿وَماَ انا بِظَلاّمٍ لِلْعبيدِ﴾ بوو، بابم و وان هەمویان سەریان نوی کرد هَیبەتی خوا إستلای کردن من هەستام بەگریانەوە ووتم: ((کەس حَدّێ نیە بڵێ تۆ ظالِمي! أمّا ئەو قوڕ بەسەریەی بَشر تێی دایە چیە؟))). بە گرین و لەرزەوە لەخەو بەخەبەر هاتم. زۆر نەچوو تعبیر دەرکەوت (شێخ معروف) وەفاتی کرد دوایێ ئەو (شێخ محی الدین) دوایێ (شێخ عبدالعزیز کوڕی شێخ مَعروف) ڕۆی بووە برینی سەر هەموو برینان! تَکیەی (هەڵەجە) مَعَ الأسَف تێك چوو!!.

فاعلی ما یَشاءُ حاکمی ما یُرید ئەوی بیکا ئەیکا کێ دەسەلاتی هەیە؟ عَقل با هەر هاوار کا بڵێ ئەمە خراپە قبیحە کێ گوێی ئەداتێ؟ ﴿كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ﴾ عادەت و ڕەوشتی وان وەك ڕەوشتی آلی فرعون بوو. ﴿وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾

قومی عادو نوح و أمثاليان. ﴿كَفَرُوا بِآيَاتِ اللّٰهِ﴾ كَوني و قَولي. ﴿فَأَخَذَهُمُ اللّٰهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾ أعمال و إعتقادێ كه به عَمَلی قَلبی پێك بێ. ﴿إِنَّ اللّٰهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (مَعَ هذا) كافر تا به كَلّي تَجاوز له حدود نەكا، نظام و أمن و ئاسايش تێك نەدا، به مُجَرّدی كُفر عقابی نادا! ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمە لەبەر چی وایە؟ ﴿بِأَنَّ اللّٰهَ﴾ (سُبْحانَهُ وَتعالی) ﴿لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً﴾ نەبوە بگۆڕێ نعمە تێكی ﴿أَنْعَمَهَا﴾ دابێیو دای نابێ ﴿عَلَىٰ قَوْمٍ﴾ يَعْني له نعمي إجتماعي وەك عِزّەت و شَرف و إستِقلاليەت و دەوڵەت و مُكنەت و قووەت ونظام و إنتظامي مَعيشەت، لەسەر هەر قَومێ بێ مؤمن و كافر! ﴿حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ هەر قومێ كه پێ گەيشتوه، له أساساً به أخلاق و أعمالی چاكه پێ گەيشتوە تا بويتە صاحبی قووەت و مُكنەتێ تەواو! ئەگەر لەسەر ئەم أحواڵەمان، باشە، دەوام ئەكەن! وردە وردە صبرە صبرە زێدە تَوَسُّعی مُلكيان ئەبێ، وا ئەبێ دەوڵەتێ عظيم تشكيل ئەكەن، ئەگەر أوصاف و أحوالاتی نَفسيان گۆڕی زاتاً كه أحوالاتی روحيّە گۆڕا أعمال جَبْراً ئەگۆڕێ– ئەوسا جەنابی حەق لێ یان وەر ئەگێڕێ له أوجي مَجْد و شكۆهو عَظَمَەت ئەكەونە چاڵی ڕەزالەت و مَسْكَنەت و حَقارەت! تەماشاكەن. ئەمڕۆش ئەوەی إستِلای جهان ئەكا له دُوَلِی غَرب و شَرق بەناوی عَدالت و نێكی و إستِخلاصي بَشَر لەشەڕ ئەكا! گۆيا مظلوم له دەستی ظالم نجات ئەدا!. زەواتی قَومی جاهِل اَلحالِيش پێ يان هەڵئەخەڵەتێن.

له باڵ يەک دێنەدەر تا عاقيبەت ڕوحيان ئەكێشن ئەيانكەنە حيواناتی مستخدَم و مسخرا (لا الهَ الاّ الله)! امت له آياتی قرآنی و أكوانی چەند غافلێ بوون! چۆن هەڵخەڵەتان! لێک بوون! چيان بەسەرهات! ئێستاش له سەر ئەو بێ هۆشی و گۆشيە دەوام ئەكەن! (في الحقيقة) آن زيادە اعتقاداتی مزخرفە لێی تێكدان!! خلاصە، ديناً، سياسةً، ادارةً، هەڵفريوان بە ژێركەوتن! ﴿وَأَنَّ اللّٰهَ سَمِيعٌ﴾ بۆ فريادی بێ چارە و دەرماندەگان ﴿عَلِيمٌ﴾ بەحاڵی ظاهری و باطنی ظالمە غدارەكان، بەفريادی مظلومان ئەگا، دەفعی

ظالمان ئەکا ﴿كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ﴾ فرعونی مصر. لەاول تا آخر لەزەمانی چاکی تا خراپی لە بدای تشکیلیان تا تێک چونیان ﴿وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ (وَ كَذامِن بَعْدُهِمْ) تا ئێمە بۆ ئێمە! بەچی پێ گەیشتن؟ ترقیان کرد؟ کەوتنە دەوری تَوَقُف؟ بەرەو ژێر بونەوە بۆ دەوری انحطاط؟ تا لەگەڵ عباد چا بوون، نعمەتی الاهی لەسەر وان دەوامی کرد! کەتێک چوون لێیان تێک چوو! ئەو نعمەتە عظیمەیە زەوالی بوو! عزەتیان بوو بە زللەت؟ گۆڕا! ﴿كَذَّبُواْ بِآيَاتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ﴾ فرعونی آخیر. کە انقراضی فراعنە بە خنکانی ئەوهات!! بەدار عصایکی ئەو بنیانە عظیمە ڕوخا! الاهی گەر ارادە بکەی، ئەو نوعە عاصیانە، بە عصای هیلاک ئەکەی! الاهی بە فریادی مظلومان بگەی! ضربەیێ لەم عاصیانەی ایامی ئێمە بدەی! مظلوم و ظالم هەر یەک بە حەقی خۆیان بگەن!...﴿وَكُلٌّ كَانُواْ ظَالِمِينَ﴾ باریا! الاها! خۆت ئەزانی ئەو ظلمی ئێستا ئەکرێ لە أیامی فراعنان نەبووە!! فلاحی بێ[illegible]ەلات بە سەد حو[illegible] جگەر دەغلێ ودانی خۆی بەناو دێنێ ئەیکا بە خەرمان کەسێ لە کافر خراپتر کبریتێکی لێ دەدا ئەیسوتێنێ، ماڵی هەزار کەس وێران ئەکا! چەند ساڵە ئەو حاڵە دەوام ئەکا! ڕبِّی! الاهی! ڕەحمێ بە ضعفاء بکە! خۆت مدبر الأموری! ئەزانی ئەتوانی بەئاسانی ئەو نوعە کەسانە لەکۆڵ کەیەوە! ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللّهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وەکذا ئەوانەی کفرانی نعمەت ئەکەن، نعمەت لە خواوە نازانن، بەقوەت و قدرەتی خۆیان مغرور ئەبن ﴿فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ با گەلێ کەس بە زارو ظاهر بڵێن ئەوانە مسڵمانن اهلی ایمانن، اما خۆی نیە! یەک دووساڵ حکامی (انگلیزی) لەو وڵاتی ئێمە بوون، کەس کەسی نەکوشت، خەرمان و پاوان و خانوو نەسوتا، حتا (بیتوێن) بە سلامەت دەرچوو، گیسکێ نەدزرا، دیوارێ نەبڕدرا، ڕێێ نەگیرا !. کە ئەوان ڕۆیشتن ئاگری فتنە هەڵایسا دونیا تێک چوو، بووە (هرج و مرج) تو خوا موسڵمانی وایە؟ مؤمن ئەبێ وابێ؟

خوداوەندا! رئیس اعتقادیاتی ئەمانە، لەگەڵ ئەو نامۆمنانە، حشر کرێ!! (معري) ئەڵێ:

و اذا تساوت في القبح افعالنا
فمن التقي؟ و ای هذا الأشرار؟

هایهو! تساوی چی! قبایحی موسڵمانان لە میزانی تساوی دەرچوو!! ﴿الَّذِينَ عَاهَدتَّ مِنْهُمْ﴾ ئەو کافرانەی پیاون و پێکەوە باوڕیت لێ وەرگرتینە. ئەوی مۆمینە زاتاً عهدی لێ وەرگیرایە! ﴿ثُمَّ﴾ پاش تحکیمی عهد ﴿يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ﴾ ئەوەی خۆیان داوەتیان! ﴿فِي كُلِّ مَرَّةٍ﴾ کلی جاری عهدی بدەن هەڵی ئەوەشێنن. ﴿وَهُمْ لاَ يَتَّقُونَ﴾ لە عیب و عار و بەدنامی و بێ اعتمادی عباد لەسەر قول و قراریان، خصوص ئەمە لە عالەمی سیاسەت، باوە! سیاسیونی غرب ئەڵێن: (کارت پێک بێ، بۆ نیلی مەرام، شەرەف و وقار و دۆستی و عهد و پەیام و ناموس، لەژێر پێت دانێ!) ﴿فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ﴾ ئەوبێ تارەتانەی دەست نوێژ ڕانەگرانەت ملاقات کرد، وە بەسەریان غالب بووی. ﴿فِي الْحَرْبِ﴾ لە شەڕو قتال و جەنگ ﴿فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ﴾ ضربەی وایان لێدە ترس و هەراس سرایەت کا! بۆ اقوامی پشت و دووای وان، کە تفرقەیێ کەن! ڕاکەن! وەک وولاغێ لەپەت بەربووبێ، بەنوعی خۆیان نەگرن، خووی ئەوانە نەگرنەوە! ﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ بقیە لەوان، یا متشردینەکان، یادی ئەو حاڵە بکەن عبرت بگرن ایمان بێنن! یا بێ عهدی نەکەن! لە آیتی (انَّ شَرَّ الدَّواب)ی یەوە وەک مقدمەیە بۆ سورەتی (بَراءَة)! ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً﴾ ئەوانەی پەیدا ئەبن، هەر قومی بێ، ئەگەر ترسی خیانتی وانت بۆ معلوم بوو زانیت نەختێ ئەکەن ﴿فَانبِذْ إِلَيْهِمْ﴾ عهدیان بۆ باوێ بۆ لای وانی فرێدە ﴿عَلَى سَوَاء﴾ وەکی وان، یا گەورەو گچکە، یان وێکڕا مساوی تێبگەن! یا چۆن تۆ ئەزانی ئەوانیش با بزانن! یعنی بە ئاشکرای پێیان ڕاگەێنە ئێوە ئەزانم عهدشکێنی ئەکەن لەگەڵ من خائنن! بۆخاطری لە عالەم معلوم بێ تۆ شائبەی خیانەت و بێ

وفایت نیە، تارەت ڕانەگرتن لەلایەن وانە! ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الخَائِنِينَ﴾ وَلَو معاذَالله کەسێ وەک تۆبێ! (جَلَّ الله) خیانەتی چەندلا ناخۆشە! ڕقی لێ ئەبێتەوە، حتا حبیبی خۆی (علی تقدیر الخیانة) لەگەڵ دوشمنی، خۆش ناوێ! ربی! ربی! ئەوانەی خائنن مەحوو نابودیان کەی بە قوڕیان دا ببەیە خوار، مۆمنی بێ دەسەلاَت لە چەنگ ئەو غدّارانە نجات بدەی، کەسیان نیە، تۆ نەبێ! ﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ خائن و بێعهدەکان بە بێدەنگی و غیب و عاری ﴿سَبَقُواْ﴾ با ئەمڕۆش استفادە لە خیانت و بێ شەڕفی بکەن، آخری تێوە ئەگلێن دووا ئەکەون! ﴿إِنَّهُمْ لاَ يُعْجِزُونَ﴾ لە قهری خوا نجاتیان نابێ خوایان پێ بێ هێزناکرێ لە گرتن و عقابیان. ربی ربی! الاهی الاهی! عن قریب قوەی قاهرەی خۆتیان نیشان دەی تارومٲریان بکەی! ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم﴾ بۆ قتالی وان. ﴿مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ﴾ بە ظفری (بدر) مەفریوێن! عادةً خارقەیێ بوو هاتوچوو! (القُوَّةَ القُوَّةَ القُوَّةَ) مادی و معنوی، ئالات و ئەدەواتی حرب لەگەڵ مهارەتی استعمال، و ئالات و ئەدەواتی حرب لەگەڵ مهارەتی استعمال وە الا آلت و ئەدەوات بەقوت حساب نیە! وەک (طۆپی کەللە) بۆخوی شەڕناکا! وای لە جهلی مسلمانان بە آیاتی قرآن بە آیاتی اکوان!.

قوەت بەگوێرەی زەمان ئەگۆڕێ! لەزەمانی (سعادەت) با (تیر) بووبێ، لەزەمانی اسلحەی (ناریە) تیر لە کیلکی تەشی تەشیڕێسان لە تیرۆکی نانکەران بێ قیمەتترە! تیروکەوانە لەگەڵ شەستیر چی پێئەکرێ؟ مسلمانان حربی بە تیرو شیر و رمیان کردە سونتی نبوی، جنود و لەشکری اسلامیان بەو سونتە مقید کرد، بەستەوە (فەڕەنگ) بە طوپی صحرایی بە قنابلی طیارە، (لالۆ) بە طوپە قیرینەی شرینی مقابلەی ئەکرد! ئەوان بە سیارە و طیارە و شەمەندوفەڕ پاپوڕ و سفینەی هوایی نقلیاتیان ئەکرد، (مامم) بە کەرێ شین و حوشتری ناهەموار) وادەرئەکەوێ! (سیدی آلوسی) زۆر بە جسارەت و بێ قید و شکی تجویزی مقابلەی تفەنگ بە

تفەنگ طۆپی بە طۆپ داوە، وائەزاندرێ بعضـــێ وتویانە. ( ئـەمـە تعـذيبي بالنار)ە دروست نيە، بۆيە ئەفەرموێ: (وَلا أري ما فيه من النّار للضّرورةِ إلاّ سَبَباً للفَوزِ بِالْجَنَةِ انشاءَ الله تعالى) سبحان اللهِ العظيم چيان بـه مسلّمانان كرد! بە تعميمی (بدعت) و (سونت) چۆن دەست و پێیان بەستن! تـا بـە ژێر كافرانيان خستن! ئێستاش لەناو (حنابلان) تعميمی (سنت) بۆ عبادەت و غيرە عبادت حكم فەرمايە ئەڵێن: (پێغـەمبـەر خـۆی رم و تيـری دروسـت نەكرد؟ كافرەكانی دوشمنی چيان بەدەستەوە بوو؟ ئـەو ماوانـەی شـەڕی ئەكرد شـەڕ بـە تيـر نـەبوو؟ بـەڵـێ! ئـەوجا بـووە سـنتی لايتغيـرە)! خـوا ئەفەرموێ: (قُوَّةٍ) بۆ تەماشای عمومی عبارەتی قرآن ناكەن؟ با پێغـەمبـەر لەسەر منبر سێ جار فەرمووبيتی: (ألا انَّ القُوَّةَ اَلرَّمي)، نابێتـە مُخَصَّصْ الى يوْم القيامَةِ! بە گوێرەی زەمانی خۆی فەرمووە! مَعَ أنّهُ ئـەفـەرموێ:(اَلرَّمـي) انداخت= هاويشتن، يعنی اعتبار بـە انداختنـە هاويشتنە! نـەبـەداری تيـری! أشْهَدُ بِاللهِ دينی اسلام مانعی تعالی و بەرزبونی نيە! أمّا گەلێ لـە روأسـاكان بوونە مانعی تەرەقی بەرزی، بەڵكو سببی تدنی وە ژێركەوتن! ئەگەر ئەوانـە بە هۆش بان، مقـصديان حفظـی نبظـی اساسـی اسـلام بايـە، ئـەبـا ترغيبـی مسڵمانان بدەن بۆ اختراعی أسلحەی چاكتر لە اسلحەی (فەڕەنـگ)! ﴿

﴾ بەرزەێ بەسترايەوە، بـە خێـوكرای، نـە تـە نهـا بـە پـەت! بـە تعليم و تربيە و تدريب و اصلاحی بۆ حرب و مەيدان داری! ووڵاغی رەوەی، ووڵاغی دابە سترای، كەڵكی حربـی نيـە! وەاسـاس لـەسـەر ربطـی معنويـە!. يەكێ لـەسـەرامـدانی حربـی غربـی ئـەڵـێ: لـە حروبـی آتيـە عـسكری پيـادە قيمەتی نامێنێ، اما لە شكری سوارە لە قيمەت ناكەوێ!) ﴿ ﴾ بـە ئامـادە كـراوەكانتـان بترسـێنن! كـە بكـە و نـەلـەرزە ﴿ ﴾ دوشمنی خواو و دوشمنی خۆتان! زاتاً دوشـمنايەتـی (مـسڵمانان) مـسڵمانان لەگەڵ ئەوانە، لەبەر دوشمنايەتی ئەوان بـوو، دەربـارەی خـوا! ئـەو اعدايانـە (مككە)ی بن يا غيری وان بن! ﴿ ﴾ لـە عـەرەب لـە سـائری

اقوام ـ مِنَ اليوم إلى ساعةُ القيام ـ اذا الْخطابُ عام! ﴿لاَ تَعْلَمُونَهُمُ﴾ نايان ناسن ﷺ خه بيثُ و غدارنْ له حەق ئێوه له حەقی دینی ئێوه! به دۆستايەتيان و معاهده و مصالحەيان مەخەڵەتێن! له اعدادی قوت فرق له بەينی زەمانی صلح و حرب مەكەن! دائماً خەريک بن! ئەوان على الدوام خەريكن قوەت و مكنەت زياد ئەكەن، له اختراع و ابداعی اسلحەی سريع الأنتقال و استعمال ئەكۆشن ﴿اللّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾ مطلعی سرو نهانيانه! خەبەر دارتان ئەكا! ئێوەش دائيماً به خەبەر بن! بعضی تفسيری اعدای (غير معلوم)ه يان به (جنوكه) كرديه، ئەبێ: ئێوه نايان بينن، علمتان پێيان نيه، نايان ناسن!) گۆييا (جنوكه) له حيله حيلی بەرزەماين و ئەسپ ئەترسێ! امام مفسرين (ابن جرير) ئەوەی اختيار كرديه! بڵێم چی! لەو قسه به قسەی جنۆكه داران ئەچێ!! بەڵام له تفسيری (قوة) اصابەی فەرموه!.

هەرچی ﷺ مسڵمانان غافڵ بوون خۆيان به ناو له (سونت) بەستەوه وه رواسای اعتقاديات بێ قوەتی كردن كه ئەڵێن: (قوەت ﷺ نيه! تاثيری نيه، هەرچی هەيه محض به ارادەی خوايه! ئەوەی بەسەرت دێ قضا و قدری الاهيه! رضا به قضا واجبه! ئەگەر خوا حەز بكا ئەو كافرانەمان لەسەر هەڵ ئەگرێ! مەحوو نابوديان ئەكا! خلافی مراد الله، محاڵە! إستطاعه لەگەڵ فعله! پێش فعل إستطاعه نيه!) دوای اعتقاديات تصرفی اوليايان كەرامەتيان، له هەموو شتێ مستضنی كردن! تاكو مسڵمانان بێ هێز بوون، علاوەی عداوەتی خۆبه خۆی، بوونه ژێر چەپەڵۆک، (الحال و الحالة هذه) ئەو اعتقادياته ئەو عداوەته به قوەت تر ئەبن! ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ﴾كەم، زۆر، حسب الأستطاعه! ﴿فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ لەرێی خوا بۆجهاد ﴿يُوَفَّ إِلَيْكُمْ﴾ به تەواوی پێتان ئەگاتەوه، له دونيا پێی بەسەرئەكەون، له عقبا نائلی رضوانی الاهی ئەبن! بۆ حرب ماڵ له اعظمی قوايه، هەموو قوەت لاێكه، ماڵ لاێكه! ﷺ پارچه ارزاق ﷺ البسه. ئەگەر ملت دەوڵەمەند و جوادی فی سبيل الله نەبێ، هيچی پێ ناكرێ! خصوصاً لەم عصرانه دا حرب زۆر گران

بووە، تحملی، قوەتی فوق‌الغایەی ئەویٚ! ئەتوانم بڵێم هەموو مصارفی حروبی زەمانی رسالت پەناه ناکاتە قیمەتی نرە و نیوەی طاقمێکی حربی ئێستا! تدارکی ئەو اسباب و مهماتی حربیە بە قومی دەروێش وصوفی و سلفی و زاهد، تارک الدنیا، بەرماڵ بەکۆڵ، چاو بەکل، سیواک لەبەر پشت، ریش درێژ، سمێر هەڵپاچراو، دەردەدار، لەرِی لاواز، چۆن ئەکریٚ؟ قومی ئەمرِۆ بە آداب و رەوشتی هەزار و سێصد و پنجاو پێنج ساڵ زیاتر مقید بن، ئەمرِۆ هەنگاو بۆ کێندەریٚ ئەهاون؟

بۆ درک اسفل! ﴿وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ﴾ بە نقصی اجر. خوای تعالان ظلم ناکا، مُتَفَقٌ عَلَيه بَينَى الْفَرِيقَينِ - • ﴿وَإِن جَنَحُواْ﴾ قریش، بنی قُریضە، امثالی وان، لەوە وەقتەدا! ﴿لِلسَّلْمِ﴾ بۆ صلح و مسالمە و لێک امین بوون. ﴿فَاجْنَحْ لَهَا﴾ تۆش میل کە بۆلای سلم! (ابوالبقاء) ئەڵیٚ: (سلم موءنثە) بنا بە قسەی بعضیٚ (حرب)موءنثە بە حملی لەسەر ضدی ضمیری (سلم) بویتە ضمیری انثی! ئەو قسە لام سەیرۆکەیە کە (حرب) موئنث بیٚ (سلم) بە طریق الأولی وەیە، وەقابلە بڵێین: (شجعانی عەرەب حربیان بە مونث حساب کردووە، لەبەر آزایی و تشجیع، وە «سلم» رقتی تیایە حەقی انوثتە!) اما توخوا بڵێین (لهُ)،چ بڵێین، (لها)، مرام ئەگۆرِیٚ؟ بەلاّم من حیث المعنی جهەتی انوثتی جوانترە! حاجت بە حملی علی الضد نیە! ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ﴾ ئەگەر میلی وان بۆ مسالمە لەکیدە وەبیٚ، خوا اعلامت ئەکا! کاری خۆت بەو بسپێرە!

بعضێک ئەڵێن: (ئەم آیتە منسوخ)ە بە آیتی (سیف)! بەڵیٚ! بەلاّم (سیف) ئەمرِۆ ناتوانیٚ ئەو حکمە ببرِیٚ!. نەختیٚ قوەت زیاد بیٚ، طبعاً حدەتی شیر زیاد ئەبیٚ، گەلیٚ شتی تریش ئە برِیٚ (ابن جریر) لێرە ئەفەرمویٚ:" هیچ دلیل نەکتاب نە سنة نە فطرەتی عقڵ نیە دلالت بکا لەسەرنسخی ئەو حکمە". لەگەلیٚ جێی ئەو کتابە و غیری ئەو کتابە دلیلمان هێناوە ناسخ نابیٚ الاّ شتیٚ کە «من کل وجە» نفی حکمی منسوخ بکا)

یعنی قابلی توفیق نەبن، متناقض بن بە تناقض منطقی، ئەوجا مجبوراً ئەڵێین: «لا حق ناسخی سابقە والا فلا» (رەحمەتی خوای لێ بێ) لام وایە بەو وەجهە (نسخ) لە قرآن دا نیە! رەنگە (سلف) کە ادنی تخالفێکیان دیتبێ، حکم یان کردبێ بە نسخ! ئەوە باش نیە! دەرگەی نظر و فکر لە آیات و احادیثی نبوی ئەگرێ! ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ﴾ بە همس و خطابیان ﴿العليم﴾ (بما فی الضمیریان)! ﴿وَإِن يرِيدُوا﴾ ئەو بەد عهدانە! ﴿أن يخدعوك﴾ فێڵت لێبکەن ﴿فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّهُ﴾ خوا کافیە بۆ تۆ مبالاتیان پێ مەکە با خدعە بکەن ﴿هو الذی أيدك بنصره﴾ نەت دیت چۆن دەستی دای تقویەی کردی بە نصر و امدادی خۆی بە مشتە خۆڵێ؟﴿...﴾ ناوی ملائکەتان نیە! بەڵێ وایە! اولا (خوا) ثانیا (خۆمان) حسابین! ﴿...﴾

﴿ مهاجر و انصار! انصار خۆبەخۆ! اوس و خزرج زۆر عدو بوون الفەت لە بەینیان بە محاڵ حساب ئەکرا! ئەو معاملەی الفەت کارانە کە انصار دەرحەقی مهاجرانیان کرد بالضرورە ئەڵێن: (محضاً بە تالیفی خوای بوو!) اخوەتی اسلامیە بووە جهەتی (وحدەت) بەو نوعە تالیفی کردن ﴿ ﴾ کشتی ﴿ ﴾ لەبەرشدّەتی عداوەتیان. ایثاری بالنفس، بێ انتظامی و گەورەی و گچکەییان قومی عەرەب و قومی کورد ممتازن لە اقوامی دونیا بۆ نجوەت و تکبر! مەگەر خوا بە محضی قوەت و قدرەت و قهر و غلبەی خۆی خۆ بە خۆی اتفاقیان باوێتە ناو وە إلا محاڵە!! خصوص پاش سستی اخوەتی ایمانی تفرقەی مذاهب و طرایق، نایێتە خیاڵ و وهم!﴿ ﴾ ئەوە بۆ قومێ وەکی عەرەب وەکی کورد حقاً وایە! اما بۆ قومی روحی اجتماعیان هەبێ هەرکەس حەقی یەکتر بزانێ، منافعی شخصیە لە منافعی عومی دا ببینێ، مقصدی عزەتی قومی خۆی زۆر بێ، زوو تالیفیان ئەبێ! ﴿ ﴾ تام القدرتە چی لەبەر عاصی نابێ! ﴿ ﴾ بە اسلوبی حکیمی خۆی شت رێک ئەخا. کەوابێ لە هەمو جێیان (تۆبزم حقی چۆن) نابێ! قدرەت و

حكمەت بۆ ڕێک خستن لازمن! مەردی قوی دانا، ئەوەی بە جێ بێ وا ئەکا! انسانی بە تهور چی پێ ناکرێ! ﴿یا أیها النَّبِي حَسْبُكَ اللّهُ﴾ بۆ امدادی معنوی و اظهاری مکایدی عدو!﴿ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (بَعْدَ التَّأْليف وَ تَمامِ الأستِعداد!) بۆ حرب و مەیدان داری، کافین بۆتو! هەر چەند حضرەتی کبریائی بۆ تابع و متبوع و هەموشت کافیە بەڵام ئەو تعهدەی نەکردیە! ئەفەرموێ لە اسلحەتان غافڵ مەبن حتا لە ناو نوێژ قووەت ئامادە کەن! ﴿یا أیهَا النَّبي حَرِّض الْمُؤْمنِينَ عَلَى الْقتال﴾ ترغیبی یان بدە لەسەر حرب لەگەڵ ئەوانەی مناقضی عهدن! دیارە ئەو دوو آیتە لە زەمانی قووەت نازل بوین! هەرچەند دینی اسلام بە مسڵمان بونی (فاروق) بە عزەت کەوت، اما عددی اهلی ایمان زۆر زۆر کەم بوون، کەڵکی شەڕیان نەبوو، تەنها امر بە تحریض)ی (أنصار) بێ معنایە! بەڵکو عامە بۆ هەمو موءمنەکان! وەخطاب و احوالاتی پێش حربی (بدر) لەگەڵ وەقتی ئەو خطابە دوورە!.. لە جملەی تحریضاتە ﴿

﴿ بیست کەسی صابر ثابت دڵ و قدم لەسەر دووصەد کەس غالب ئەبن!. ظاهراً وەک (زَمَخْشَري) ئەڵێ: (خەبەرێ محضە، اما حەقی وایە لە معنادا امر بێ! ئەوە موافقی معنای تحریضە، یعنی خۆیان نێزیک بکەن لە هیلاک! وەموافقە لەگەڵ تخفیفی آتی، گەرچی جواب ظاهرە، لازم نیە لە تخفیفی آتی، نسخی خبر! تا بڵێین خلافیە، لای اکثر دروست نیە، زێرا مقصد ئەوەیە ئێوە بە شرطی صبری جان سوپاردی شانتان وایە، بیستتان لەسەر دووصەد کەس غالب ئەبێ، وەلازم نیە لە هەموو اوقات وایان سوپاردە بکرێ) خلاصە قولی (زمخشری) نابە جا نیە! ﴿

﴿ حاصڵی ئێوە مجهزن بە قوەتی مادی و معنوی، یەک یەک و بە [illegible] مقابلە بکەن! ﴿　　﴿ ئەوانەی بێ قوەتی تام و رابطی معنوین، هەر چەند حمیەت و استحفاظێکی قومیان هەیە، اما مقابلی متانتی ایمان، سستە!﴿　　﴿ بە تەواوی أُصولی حرب نازانن، مثلی

علیا و غایەی مقدسیان نیە! لە اوغریان روح بەختکەن. بەلآم ئەمڕۆ بالعکسە! مسلمانان مادەی معنویان بێ هێزە اصول و اسبابی جەنگ لە اجنبی وەر ئەگرن، بە تەواوی فێری نابن، قاعدە و ئالات ئەگۆڕن، اختراعاتی نوێ ئەکەن! مسلمان دەستە پاچە ئەبن.

معلومە علت بێ معارضە بێتەجێ، معلول دێتەجێ! ﴿الآنَ خَفَّفَ اللّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا﴾، لە آخری سورەی (بقرە) رابرد کە قولی اهلی ایمان مقابل فەرمایشی الاهی( سَمِعْنا و أَطَعْنا)یە. وەلە عادەتی إلاهی معلوم بووە ملتي تَعَنُّت بکا، خوا باری گرانتر ئەکا، بۆیە مسلمانان لە خوایان خواست ئەو (اصر)و گرانی لەسەر اقوامی سابقەی داناوە، بەو نوعە لەسەر وانی دانەنێ.

الآن کە مسلمانان اطاعەی امری الاهیان کرد، فەرمودەی ویان بە کمالی بشاشەت وەرگرت، جەنابی حەق لطفی فەرموو، حکمی لەسەر سووک کردن، مع انە حکمی سابق مشروط بو بە صبر. لا شک ئەوانەی سبقی اسلامیان بوبو بە طولی صحبەتی رسالەت پەناه، ایمان چو بووە قولآی دلّیان، لەهەمو ڕەگ و خوێنیان گەڕابوو، ثابت قدم و صاحبی صبرو ثبات بوون. ئەوانەی تازە ایمان بێ شبهە ئەو قووەتەیان نەبوو، بەرانبەر دە کەس خۆیان نەدەگرت وە لەو کە امری خوایان بە (بشر) وەرگرتبوو! چەند موافقە لە بعضە قراءت (ضعفاء) هاتووە! اما بێ هێزی رای و تدبیر و عقلّ، حاشا!! اصحابی رای لە یارانی (محمد)ی(صلی الله علیە وسلم) بێ هێز نەبووین، وەهەموکەسیش لە مسلّمانان نابێنە صاحب رای! مسالەی علمی الاهی لاشکە خوا (قبل الواقعە)ئەزانێ، ئەبێ! (حین الوقوع) ئەزانێ، ئەوا بوو! کەڕابورد، ئەزانێ بووە! هەر چەند عینی علمی حەق زەمانی نیە! اما گەلێ لە متعلقاتی، زەمانیە! بۆیە بە ماضی و حال و استقبال، ئەگۆڕێ! اصلی علم وەک خەو نیە! کەسی لە ملت بلێ تا حادثە واقع نەبێ، خوا

نایزانێ، زۆر غلطه! باوڕ ناکەم کەسێ لە اُمت ئاگای لـە قـرآن بـێ، بتـوانێ ئەو قسە بکا.

﴿فَإِن يكُن مِّنكُم مِّئَةٌ صَابِرَةٌ﴾ صبری بە ڕاستی ﴿يغْلِبُواْ مِئَتَينِ﴾ یـەک بـە دوو! نافەرموێ (باذن الله) لەبەر (صبر) ﴿وَإِن يكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ﴾ نافـەرموێ (صـابرة)! ﴿ يغْلِبُـواْ أَلْفَـينِ﴾ وەک ئـەوانـەی (صـابر)، یـەک بـەدوو! لـەبـەر ﴿بِإِذْنِ اللّهِ﴾ چونکی ئەو اذنە اذنی تکوینیە (مربـوطـە) بـە (صـبر)! نـابینی ئەفەرموێ ﴿وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ مَعَ أَنَّهُ (صَبْرْ) دەرەجاتـە، دەرەجـاتی حـرب و ضرب لە صبرا متفاوتن! اما انسانی بێ صبر و ثبات دیارە کەڵکی شـەڕی پێوە نیە! لێرە دوو تخفیـف هـەیـە لـە ده بـۆ دوو، لـە بیـست و صـەد، بۆ صەدو هەزار (فافهموا یا أُولی الأفکار!) وەدیارە مقصود حربی مـعَ الکفـارة! ﴿ما کانَ لنبي أن یکون لهُ أسرَی حتی یثخنَ فی الأرْضِ﴾ نـەبـووە، نـابێ، لـە نبوەت ناوە شێتەوە، لایەق نیە بـۆ هـیچ پێغـەمبـەرێ! لـە بعـضـــێ قـراءت (للنبی)یە، زاتاً لێرە مقـصد ئـەوە، محمده (صـلی اللـه علیـه وسـلم)! بـە عنوانی نبوەتی عام یا خاص بێ! هەتاکو دوشمن بـێ هێزنـەکا، لـە لاشـەی مقتـول و مجروحیـان ارض گـران نـەکـا، بـە نـوعی کـە هـەڵاتنیـان قطعـی (نهایەتی بێ)! نابێ اسیری هەبێ لە شکرێ لەوی لە ئەوائیلی ظفر بە اسـیر گرتنی و غنیمەت مشغول بن! (نبی) و لە شکری قیاسیان لە جیشی رواسـا و ملوک و قوادی دونیوی ناکرێ! ضربەی وان بۆ طمع شەئەکەن، ئێوە نابێ وابن! ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيا﴾ مع انە لە ئێوە ناوە شێتەوە بـۆ مـاڵی دونیـا، کـە عـارضـە دێ و دەڕوا وەک چرکـی دەسـتە، حـرب بکـەن! ﴿وَاللّـهُ یریـدُ الآخِرَةَ﴾ بەڵکو بۆ نشری دین، حفظی شەرەفی بشر و نجـاتی ضـعفاء بێـت! ئەوانەی کە ثمرەیان لە آخرەت دەرئەکەوێ! مادام خواهشی خوا وابێ، ئەبێ خواهشی ئێوەش وابێ! نابێ ئێوە مخالفـەی ارادەی تـشریعی جـەنـابی حـەق بکەن! باوڕ ناکەم کەس لە مـسڵمانان بڵـێ: (مخالفـەی ارادەی خـالق یعنـی ارادەی تکوینی ممکنە، فضل لە وقوع!) (معتزلی) ئـەوەنـدە جاهـل نـین ـــ

مع انه لێیان نقل ئەکەن صفات الله عینی ذاتن! ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ﴾ غالبە لە ئێوه غلبەی حەقی ئەوێ! ﴿حَكِيمٌ﴾ ئێوەش حکیم بن! تەماشای حاڵ و موقع بکەن! هەرشتە، لە موقعی مناسبی خۆی دانێن! ﴿لَّوْلاَ كِتَابٌ﴾ حکمی ثابت و مقرری لا يتغير. ﴿مِّنَ اللَّهِ سَبَقَ﴾ لە ئێستا. کە ئەودینە سەرئەکەوێ رسولی غالب ئەبێ مشارق و مغاربی ارض بە نوری ایمان و توحید رووناک ئەکا. ﴿لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ﴾ لە حین و مەیانی ئەوەی وەرتانگرت لە اسیر و تالان ﴿عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ گەورە. گەورەێ نایەتە قەڵەم! عذابی سماوی؟ نەخێر؟ غذابێ گەورە و گرانترا عذابێ لە دەستی عدو، عذابی إستئصالی اسلام - والعياذ بالله! زێرا زۆر نێزیک بوو لە وەقتی اشتغالی ئێوه بە گرتنی أسرا و غنائم، دوشمن خۆی بگێڕێتەوە، لە ناکاو بەسەرتاندا بدەن تار و مارتان بکەن، نێزیکی هیلاک بن، ئاسیبێ زۆر زۆر عظیم بە وجودی حضرەتی رسالەت بگا، چونکی ئەوەندەیان لێ کوژراو و بریندار نەکرابوو بە تەواوی بێ هێزبن خۆیان نەگرنەوە. لەشکرێ لە نۆصەدکەس زیاتر، بە حەفتا هەشتا لێ کوژراو و بریندار کراو، وابێ هێز نابێ! نهایت خوا حفظی کردن، ترسان خۆیان نەگرتەوە، لە ئاسیبەی متوقعه مصون بوون! تاریخی عالەم شاهده - قبل الرسول و بعد الرسول - لە شکری غالب لە اولەوه بە نشای ظفر مەست بووە، طمعی پاتار خەریکی کردووە، دوشمن بعد الهزیمه بای داوەتەوه سەر تار و مەتاری کردیە. وقعەی سلطان محمدی ثالث بن عثمانی (فاتح)، ئاگری حادثەی (ناپلیۆن) لەگەڵ (روس) مشهوری جهانە، انهزامی ساختەی پڵنگی وەک ناپلیۆنی چۆن کردە رێوی؟ حتا مع الأسف عینی حادثه لە (أحد) بەسەر لەشکری پێغەمبەری داهات. بۆ تامینی خطر جەنابی سیدی سەروەرامری کردە تیراندازان بە هیچ صورەت ئێوه ترکی ئەو موقعه مەکەن، لەبەر ترسی (من قتلَ قتیلاً فلهُ سلبه)، بەڵام اکثریان ترکی موقعیان کرد. دوشمنی هەلاتی گەڕاوە کە قسمێکی پشتی بە مسڵمانان سەند! ئەوەی بەسەر مسڵمانان هات هات! (نعوذ بالله) ئەو

حادثە لە (بدر) بوو با اسلامەتی مەحو ئەبووە! ئەو دوو رۆژە قیاسی لێک ناکرێن! ﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ﴾ بدلی اسری و سائری امتعە ﴿حَلاَلاً طَيِّبًا﴾ نۆشی گیانتان بێ!حلال و زەلالە! ئەو امرە مبارەکە شاهدە عتابی الاهی لەسەر گرتنی اسیرو تالان نەبووە، بەڵکو لەسەر نابە موقعی بووە .. مادام سەلامەت دەرچوون بخۆن، خۆش گوارتان بێ! ﴿ وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ نەکەن جارێ تر بێ مبالاتی بکەن! ﴿ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوجارە عفوی کردن. نەکەن بە مەرحمەتی الاهی مغرور بن!. تحریری ئەو مقامە لە مبتکراتی خۆمە! معنام مخالفی جمهورە! بەڵام عرضی اهلی إنصاف بێ بە عدالەت تەماشاکەن! حقیقەتی روحی آیت و قیمەتی، ئەوەیە کە من عرضم کردن! وە زۆر تاسف ئەکەم کەئەو آیتە عظیمە قیمەتدار، بە خسارچووە! وەئەو ئایە تە لەگەڵ آیتی (حتي إذا أثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَ إِمَّا فِدَاءً) فرقیان بە قَبْلَ الأثخانُ و بَعْدَ الأثخانە! بەڵام اثخان بە قتلی اسیرنا! خوا امری پێ ناکا! زۆر خراپە! عالەم تنفر ئەکا! حفظ و خدمەتی اسیر، یەکێکە بە اسبابی ظفری عسکری! دوشمن ئەگەرلە حیاتی امین بێ،کەبێ تحملی دیت، زوو تسلیم ئەبێ! ئەگەر امین نەبێ، طبیعی مردنی بە شەرف ترجیح ئەکا لەسەر مردنی بەڕەزالەت! بەڵکو صبرو ثبات ئەکا بە تحملی مشاق، نهایت ممکنە غلبە بستێنی! ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾ (صلی اللە علیە وسلم) ﴿قُل لِّمَن فِي أَيْدِيكُم﴾ لە ناو دەست و بەردەستی ئێوەن ﴿مِّنَ الأَسْرَى﴾ لە دیلان! اقارب و اباعد! ﴿إِن يَعْلَمِ اللّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا﴾ وەفا، صفای قلبی، استعداد بۆ ایمان. ﴿يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّا أُخِذَ مِنكُمْ﴾ لە نعمتی دونیا و آخرەت. ئەگەر ئەوانە دڵیان لە زیغی عناد پاکژ بێتەوە، ئەزانن ئەو دینە حەقە، مسڵمان ئەبن، فدیەی اسیران و غنیمەتی حرب بە زۆری وەرئەگرن. یەکێ لە مصداقی ئەم آیتی کریمە، (امامی عباس) بوو. لە غنائیمی (بحرین) تا توانی هەڵی گرت فەرمووی: (ئەوە چاکتر لەوەی لێم وەرگیرا، وەامێدی مغفرەتم هەیە!) ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ غفرانی

رۆژی جزا، مقدمی هەموو انعامێکه. ﴿وَإِن يرِيدُواْ﴾ ئەو دیلانە! ﴿خِيانَتَكَ﴾ نقض عهد بکەن ﴿فَقَدْ خَانُواْ اللّهَ مِن قَبْلُ﴾ خیانەتی مع الرسول، خیانەت کردنە لەگەڵ خوا! ئەو مشرکانە سابقاً نقضی عهدیان کرد، نە جارێ نە دوو جارا ﴿ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ﴾ دەسەڵاتی تووماں، بەسەروان داشکاند مغلوب بوون، دیسان بەسەریان غالب ئەبی، بێ منت بن، با خیانەت بکەن. ﴿وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ کەسێ تابعی زاتێ علیم و حکیم بێ، بە علم و حکمەت رەفتار بکا، بە ئاسانی دوشمنی گورفتار ئەکا. ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ﴾ لە اوّلەوە، ﴿وَجَاهَدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ اعلای دین، اعتلای بشر ﴿وَالَّذِينَ آوَواْ وَّنَصَرُواْ﴾ مهاجرەکانیان گرتەوە، جێ و ماوایان پێدان، نصرەتی رسول الله و مهاجرانیاندا، یعنی نصرەتی دین ﴿أُوْلَـئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ﴾ معین و نصیر و ظهیری یەکن، ئەبێ تاماون، وابن! خوا ئەزانێ لێره [illegible] باس وجێی میرات نیە! وە مقصودیش نیە! بە سنة ثابتە، ثابت نیە! کەیفی خۆیەتی! ئیرە جێی ادامەی ولایەتی سەرو ماڵ دانانە، لە رێی خوا! ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ﴾ بۆلای ئێوە هجرەتیان نەکردیە، تا تقویەتان بکەن! ﴿ مَا لَكُم مِّن وَلاَيَتِهِم مِّن شَيْءٍ﴾ ایمان هینانی وان، بۆ ئێوە، فائدەی نیە (بوجه من الوجوه) نصرەتی ئێوە نادەن، تا هجرت و التحاق بە ئێوە ئەکەن! ﴿وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ﴾ بۆ اموری دونیوی، نا! ﴿فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ﴾ لازمە نصرەتیان بدەن، بە هاواریان بچن! ﴿إِلاَّ عَلَى قَوْمٍ﴾ لە مشرکان ﴿بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ﴾ عهدی خۆتان بۆوان، مەشکێنن! ئەوان ئەبایە مراعاتی میثاقی ئێوە بکەن، بەینی خۆیان لەگەڵیان تێکنەدەن! ﴿وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ چی تیایە، ئەیبینێ، بە تەواوی ئەیزانێ! سرو خفی لێ بزرنیە. ﴿وَالَّذينَ كَفَرُواْ﴾ ولو خۆ بە خۆی عداوتشیان هەبێ، آما نسبەت بە ئێوە ﴿بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ﴾ بۆ سەر ئێوە، ناصر و ظهیرو معین و مقوی، یەکن! ئەوجا ئاگادارین بە دوستایەتیان و دوشمنایەتی خۆبە خۆیان هەڵمەخەڵەتێن! دوشمنی ئێوە مصلحتی خۆی ئەبینێ، وەهەمویان

حەز بە نەمانی ئێوە ئەکەن! ﴿إِلاَّ تَفْعَلُوهُ﴾ ئەو اتحادە نەکەن، یوماً من الأیام، لە بارێەک بێنەدر ﴿تَكُن فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ﴾ هەمو دونیا، ارض السلام، دارالإیمان، خۆ بە خۆی تێک ئەنگژێن ﴿وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴾ (یا کثیر) خوێن رژان، یەغماگەری، تکفیری یەکدی، عداوەتی ابدی مع الأسف هەمووی لەبەر بێ اسلامەتی تێک چوو (رابطەی) رابطەی اخوەتی ایمان ئەمرێ، لەتەنی جار جارۆکە سسترە، اعتمادی مسلمانان بە قول و قەراری اجانب بە قوەت ترە. لە اواخری حربی عمومی زاتێ (احمد نظمی) ناو قوماندانی طابوری نیشانچی بەگریانەوە بە منی ووت (ئێمە خرابین چ المان چ انگلیز، المان غالب بێ بە دۆستایەتی ئەمانخوا، انگلیز بەسەرکەوێ بە دوشمنایەتی ئەمانخوا!) ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ﴾ زاتاً مدار، ایمانە! ﴿وَهَاجَرُواْ﴾ هجرەتی اولی بۆ مدینە ﴿وَجَاهَدُواْ﴾ قبل الهجرة و بعدها ﴿فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ نەک بۆ پاتاڵ و تالان! دەستیان لە قوم و مەفتەنی خۆیان، بۆ خوا هەڵگرت! جدال و شەریان لەگەڵ اقاربی خۆیان کرد ﴿وَالَّذِينَ آوَواْ وَّنَصَرُواْ﴾ أنصاری مدینە﴿أُولَـئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا﴾ هەر ئەوان بە راستی و دروستی بێ لەککەو پەرە بێ غل و غش بێ درۆو رووریا، ایمان دارن! مع انە زۆر اشتغالیان بە ورد و اوراد نەبووە! ختمە و تهلیلەیان نەکردوە، تسبیحیان هەر نەخراندووە! بەرماڵیان بە کۆڵی خۆدا نەداوە! ﴿لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ لە هەر دوو دونیا! ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ مِن بَعْدُ﴾ پاش هجرەتی اولی، یا دوای حربی (بدر)، ئەوە لام خۆشترە! ﴿وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ مَعَكُمْ﴾ لە باقی حروب ﴿فَأُوْلَـئِكَ مِنكُمْ﴾ ئەی مهاجر و انصارینە! ئەوانە لە ئێوە حسابن! حقاً مؤمنن! گەرچی لە لە زیلەت ناگەنە ئێوە! دیسان مەلایەکان ئەچنەوە سەرباسی میرات غیری (تبریزی) کە نایناسم ئەو ئەڵێ: (میراتیان نادەنێ) ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ﴾ خزم ئەوانەی رابطەی قرابەتیان لە بەینا هەیە ﴿بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ﴾ ئەڵێن لە میرات وەرگرتن (اولی)ن لە اجانب. توو خوا ئەوە سەیرنیە؟ بەو آیتە استدلال ئەکەن کە (ذوی الأرحام) (ارث) ئەگرن!

سبحان الله لە قرآن مقابلەی ذوی الأرحام لەگەڵ عصبە هەیە؟ ئەمە اصطلاحی ترە! ■ جێی میراتە؟ ﴿فِي كِتَابِ اللّهِ﴾ ئەڵێن حکمی خوای، یا لوح المحفوظ، یا قرآن! هایهو! چی لە سەر چیە!! بە لێ لە حکمی الاهی، اما حکمی تکوینی، اقارب، بەیەکتر ئەولان! جاذبەی رەحم، رابطەی دم، قربی طینتیان هەیە! وەحکمی تشریعی الاهی، موافقی فطرەتە، یا تعدیلی فطرەت ئەکا! ئەگەر بێ مەیلی و عداوەت نەبایە لە بەینی خزمان حاجەت نەبوو قران تعرضی بۆ بکا، هەروەک وازع و ناهی (طبیعی) مغنین لەوازع و ناهی شرعی، داعی طبیعیش مغنیە لە داعی و مشوقی شرعی، الا انە طبایع لەسەر فطرەت نامێنن! بۆیە احتیاجی بە داعی شرعی ئەبێ! ﴿إِنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ﴾ جزای و کلی، جعلی و وضعی، طبعی و شرعی ﴿عَلِيمٌ﴾ مثقالە ذرەیەکی لێ بزر نابێ! احواڵی روحیە بە حەق، هەر ئەو ئەیزانێ! توفیق لە بەینی شرع و طبع، هەر بەو ئەکرێ! هەم فاطرە، هەم شارعی احکام، طبعی و شرعی، لەوەوەیە!!![1].

---

[1] - تەواو بوو تفسیری سورەی (انفال)، رۆژی چوارشەمۆ ٨ تشرینی ثانی ١٩٢٦ میلادی رومی • چارەمینی رۆژی ماهی شعبان، رۆژی بیعەتی اهلی شام لەگەڵ فاروقی اعظم ساڵی ١٣٥٥ هجری قمری.

## سورەی توبە

سورەی (توبە) مدنیە! صەدو بیست و نۆ آیتە، لای کوفیان سەدوسی لای باقی، گەلێناوی تری هەیە ئەم سورەتە! لە گەلێ جێ عبرەت بە ناوە کە، بە ناونیە! سورەتی مستقلە سورەی (انفال)دائر بە احضارات و تدارکی حەربە، وەک ایامی (سەفەربەری) ١٩١٤م ئێمە، پاش ئەوە جەنابی حەق امری دا بە اعدادی قوەت و رباطی خیلی مرهب، امردا بە نبذی عهدیان، نهی کردن لە منازعە، ایقاظی کردن لە خطر، تامینی اتحادی عسکری نبوی فەرموو! ئەو جا بووە دەوری اعلانی حرب، بۆ عمومی ئەوانە ی عهدیان شکاندیە فەرمووی:﴿بَرَاءَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بێ (بِسمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَحیمْ) زێرا تا ئەوان بالکلیەت تفسداً و تکبراً و حسداً قطعی مناسبە و رەحم و علاقەیان لەگەڵ خواو رسولی خوا نەکرد، اعلانی حرب نەدرا! ئیتر جێی ترحم نەما! مع انە عهدی وان مصدر نەبوو بە (بِسمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَحیمْ) و نقضیشیان بە ناوی خوداوەندی رحمن و رحیم نەبوو! تا اعلانی حرب لەگەڵ وان، بەو کلمە رحمانە بێ! ﴿إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ پێیان راگەیێنن! کە خواو پێغەمبەر لە نقض و نقضی عهدی ئەو مشرکانە ی ئێوە عهدتان لەگەڵ کردینە، مبران! سبحان الله! قبل کل شيءٍ، جەنابی حەق، تبریەی خۆی و رسولی ئەکا لە عهدشکێنی! دیارە عهدی مسڵمانان لە مشاورەو و تدبیر و اتفاقە، اما رفعی عهد، بەوان ناکرێ عائدی رسول اللهیە! و حقیقەتی عهدی کە نسبت بە خواو رسولی خوا بدرێ، عهدی ایمانە! ئەویش نەبوو!! عقدی مداهنە و مسالمە بوو! ﴿فَسِيحُوا﴾ ئەی مشرکینە

بگەڕێن﴿ فِي الأَرْضِ﴾ هەركوێيێبێ ئارەزوو ئەكەن ﴿أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ﴾ پاش تبليغى (براءة).

ئەم امهاله وەک دستور العملى دەوڵە تانە لەوەختى ارادەى حرب، اما خوا زۆر توسعى پێدا، بۆ اعلامى بێ اهميەتى وان! تالە و مدەتە درێژ إحضاراتى خۆيان ببينن، دەخالەت و تشبث بەهەركەسێ ئەكەن، بيكەن! ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّكُمْ﴾ هەرچى بكەن! ﴿ غَيْرُ مُعْجِزِي اللّهِ﴾ بە عجزى رسول و عسكرى . ﴿ وَأَنَّ اللّهَ ﴾ فضل لەمە كە عاجزو بێ دەسە ڵات ببێ ﴿مُخْزِي الْكَافِرِينَ ﴾ ئەوانە ى معهود بە نقضى عهود، رەزيليان ئەكا، ئەبنە اسيرو ديلى مسڵمانان. ﴿وَأَذَانٌ﴾ اعلان و اعلامە ﴿مِّنَ اللّهِ﴾ جل جلالە ﴿وَرَسُولِهِ﴾ ﴿إِلَى النَّاسِ﴾ مؤمن و كافر هەمو بزانن ئاگادار بن! خەبەريان بدرێتێ﴿يَوْمَ الْحَجِّ الأَكْبَرِ﴾ لە مشعر الحرام. ئەو رۆژە حج الأكبر، چونكى عزەتى اسلام ذللەتى شركى تيا اعلان كرا!! وەظاهر بوو ئەوانە ى روحى حماسەتى اسلام ئەمرێنن ئەڵێن: (رۆژى عرفە جمعە بێ، حج الأكبر)پيرێژنيش ئەو قسانە يان زۆر پێ خۆشە!! ﴿أَنَّ اللّهَ﴾ (من حيث كونە) شارعاً هادياً مرسلاً للرسول ﴿بَرِيءٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ﴾لە خۆيان، لە عهديان! اما من حيث كونە خالقاً رازقاً) جێى تبرى نيە!! ﴿وَرَسُولُهُ﴾ ئەويش، بريە! بێ ذمن، لەكن خواو و رسولى خوا! ﴿فَإِن تُبْتُمْ﴾ لە زەمانى امهال، بە ايمان! ﴿ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ لە دونيا و قيامەت ﴿ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ﴾ (كما فى السابق) ﴿فَاعْلَمُواْ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللّهِ ﴾ حتا بە معاونەى شركاتان! ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوبێ عهدانە، ﴿بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ بە دەست مسڵمانان! تعقيبتان ئەكەن، ئەتانكوژن، ئەتانكەن بە ديل! ﴿إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئەوانە اهونن، نوعاً ما بە مرووەتن، ﴿ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا﴾ بە تەواوى محافظەى ميثاقيان كرديە، بێ ادنى نقصێك. ﴿وَلَمْ يُظَاهِرُواْ عَلَيْكُمْ أَحَدًا﴾ معاونەت و پشتيوانى كەسيان نەكرديە لەسەر ئێوە. ﴿فَأَتِمُّواْ إِلَيْهِمْ﴾ خۆڕاى نيە نافەرمونێ (لهم)! ﴿عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ﴾ بەتەواوى اداى عهديان بكەن، تا مدەيان تەواو ئەبێ ﴿إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾

لە بێ وەفایی! ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ﴾ بە نهایەت گەیشتن! تەواو بوون﴿فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ﴾ عهد هەڵوەشێن! ﴿حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ﴾ (مِنْ حلٍ وَمِنْ حَرَمٍ)﴿ وَخُذُوهُمْ﴾ بیان گرن! ﴿وَاحْصُرُوهُمْ﴾ محاصرەیان کەن! ئەگەر لەناو قە لات و تحصنات دابوون! ﴿وَاقْعُدُواْ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾ لەکەمین گاهان! ﴿فَإِن تَابُواْ﴾ ئەوانە ی مان! بە ایمان هینان! ﴿وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ﴾ لام وایە ئەودوو عبادەتانە یان لا زۆر گران بووە! ﴿فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ﴾ رێیان بەردەن! بەرهە لایان بکەن! ﴿إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئێوەش بەگوێرەی خۆتان وابن! سیدی انام ﷺ فتحی مکەی کرد (کعبە)ی لە بیت الأصنامی کردەوە بیت الله و بیت العتیق، گەڕاوە (مدینە) لە موسمی حج، (امامی ابوبکری) کردە امیری حج، (امامی علی) بۆ تبلیغی ئەو آیتانە بە دوادا نارد. ئەوان ادای وظیفەی خۆیان کرد بە رێک و پێکی (کما انزله الله)! چەند آیاتێ لەم سورەتە علی ملاء الناس خوێندرایەوە. لەو رۆژە، گەورەی و عزەت و هیبەت و سطوەتی دینی اسلام، ئاشکرا بوو! دوایێ اهلی (سنة) و (رافضی) بە شەڕهاتن، ئێستاش دەوام ئەکا لەسەر ئەو ناردنە! علمایانیش بە قراءت و توجیهی عطف و اعراب خەریک بوون! وە رؤسای دونیا زاتاً ئاگایان لە قرآن نەبوو!! لەو میانە دوشمن تدارکی خۆی دیت، روحی قرآنی وەرگرت، بە صورەتی قطعی غالب بوون ﴿وَإِنْ أَحَدٌ﴾ هەرکەسێکی بێ! خاصە ئەوانە ی دوور حضورن لە لا ڕا ذەمی تۆیان زۆر بیستوە، لکن اهلی إنصافن بە ئەفسانە ﻫ لناخە لەتێن، ئارە زویانە خۆیان تحقیقی حەق بکەن. ﴿مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ﴾ طلبی جواری تۆی کرد ﴿فَأَجِرْهُ﴾ (وَلَوْ بَعْدَ انْقِضاءِ الأَجَلْ)، وەمدەی عهدی تێ پەڕی بێ! ﴿حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ﴾ تاکو گوێیی لە کلامی خوابێ، زۆریان بە سماعی کلامی خوا ایمان دێنن، گەلێکیان دڵیان لە بغض پاک ئەبێتەوە. اوروپای تا ئەم اواخرە باجمعهم بغضی حضرتی رسول‌الله یان هەبوو بە شدەت. رواسای دینیان وەک رواسای (روافضی)، دڵیان پڕ کردبوون لە عداوەتی (نبوی) . تاکو (مستشرقەکان) ئاگادار بوون

کەمێک لە دینی اسلام گەیشتن، تکذیبی قەشەکانیان اعلانکرد. ئەمڕۆ زۆریان، محبەتی حضرەتی رسالەت پەناهیان هەیە! مقالاتی عجیب لە ستایش فخری کائنات ئەنوسن و طبعی ئەکەن. بێ شک مسڵمانان لە ترجمەی (قرآن) زۆر استفادەیان کرد! خۆزیا گەلێک لە مەوپێش لە طرف سەرمدانی علما و اربابی اقلام بە مکملی ترجمە کرابا ،لکن لەبەر منازعەی خۆ بە خۆی، معتزلی ئەڵێن: دیارە کلامی نفسی نیە چونکی (ئەو)نابیسترێ، (اشاعرە) ئەڵێن: بە تبعیەت دەبیسترێ! واقعیش مقصد لە بیستنی کلام تێ گەیشتنی معنایە - مدلولاتی لغویە نابێ (نزاعی تیابێ، نزاع لە صفەتێکی واحدە کە بە تعلقات و اعتبارات نەگۆڕێ، ئەویش مدلولی لفوی لفظ نیە! مدلولێ استدلالیە! بە دلالتی اثر لە مؤثرە! وەکو (جلالی دوانی)، (مەلا وەسیم)، (مجددی مصری)، (دوعا گۆی ئێوە) تحقیقیان فەرمووە! ئاگامان لە مصالحی عامەی عصری نەماوە، یا نیە!!! ﴿ثُمَّ﴾ پاش بیستن، ئەگەر مسڵمان بوو، فبها! و الا ﴿أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾ و وڵاتی خۆی، تحت المحافظە، رەوانی بکەوە مملکەتی خۆی! ﴿ذَلِكَ﴾ ئەوە بۆ؟ ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ مغدورن، معذورن! خوا رواسایە کانیان بگرێ لە مندالیەوە بە انواعی حیلە بغضی ئەو نوعە ذاتە ئەهاوێنە دەماغیان، وای محکم ئەکەن، بەگەورەی زەحمەت دەرچێ! خلاصە رواسای روحانی و جسمانی بە غیری افسادی فطرەتی بشری، هیچ کاری تریان نیە! لەو چەندانە (برناردشۆ) کاتبی شهیری انگلیزی لە (هند) نطقێکی دابوو خطاب بۆ شبانی تلامیذی مدارس، وتبووی: زۆر ئاگاداری عقڵی خۆتان بن! رواسای مدارس بە غیری ئەمە عقڵی فطریتان لێ نزع کەن، عقڵێکی دی بە ئارەزوی خۆیان بهاوێنە دەماغتان، هیچ مقصدی تریان نیە!). حاکمی سیاسی کۆیە (رەندێل) لەوەختی احتلالی کۆیە تەماشای آداب و سلوک و خواردن و البسەی ئێمەی ئەکرد، تعجبی دەما، ئەیگوت: (هەرچی دەرحەق کوردان بە ئێمەیان گوتووە، افترا بوو! بە منداڵی پێیان ئەگوتین کورد وەحشین، انسان

خۆرن، تربیه و آدابی بشریەتیان نیه!)حکایەتی هەیە عرض ئەکرێن ولو سوءی ادبی تیایه، اما به مناسبەی حبلی رواسای ملتان، زۆر به جایه!! بابم فەرموی: (زاتێ هەبو «نورالدین رودباری» ناو له اهلی فضل و علم، بەینێ لەم و ولاته بوو، دوایێ چۆوه و ولاتی خۆی «نالی» له فراقنامەی (ئەینوسی):

(بۆیلەچاوی روودبارم نوری دیتن وەخته ناری بێ
ئەوەش باماجاری هیجران و دووری رووباری بێ)

به (سنه)دا ئەڕواتەوه، والی (سنه) دەعوەتی ئەکا، ئەبێنێ دوو وێنه به دیوار هەڵواسراون، یەکێ رووت بابۆڵه نان بەدەستەوه قەپاری لێ ئەدا، دەستەکەی تری لەسەر عەورەتی داناوه، ئەویتریان بەشکلی شاهانه لەسەر تەختی دانیشتوه، دەستێکی بۆلای وێنه روتەکه درێژ کردووه. والی ئەڵێ "نازانی ئەمه چیه"؟ نوری ئەڵێ "نا"! والی ئەڵێ "ئەو روته وێنەی عومەره بەو هەیئەته نان ئەخوا، ! ! ئەوی تر وێنەی أمیر المؤمنین علی یه! بەدەست إشارەی بۆ ئەکا ئەڵێ عەیبه"! نوری ئەڵێ وانیه،ئەم صورەته دەستی درێژکردییه ئەڵێ پارویێکم نان بدەیه ئەویش ئەڵێ: مەگەر ئەتدەمێ" والی إنتباهی ئەبێ وێنەکان لائەبەن)! ئیتر عەوامی قوڕبەسەر چی بکا له دەست ئەو رأسایانەی بێ مرووەت و إنصاف؟

﴿كَيْفَ يَكونُ لِلمُشركِينَ عَهْدٌ عِندَ الله وَعِندَ رَسوله﴾ چۆن ئەبێ؟ ئەوان رای ناگرن! ﴿إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ ئەوان رای ئەگرن! لای خوا ولای رسولی عهدیان معتبره! ﴿فَمَا اسْتَقَامُواْ لَكُمْ فَاسْتَقِيمُواْ لَهُمْ﴾ زاتاً بێ وەفایی له طرف نابێ ببێ! ﴿إِنَّ اللّهَ يحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ و لو مشرکیش بێ! که صاحبی شرط و وەفا بێ، بەو خصلەته خوا خۆشی ئەوێ! مراعاتی ئەکا! بالکلیه لێی بەری نابێ! سبحانه الله شارع که خوا بێ، شرع وا ئەبێ! بێ میل و محابا و روو ورپا! ﴿كَيفَ﴾ چۆن عهدیان ئەبێ؟ ﴿وَإِن يظْهَرُوا﴾ ظفریان ببێ. ﴿عَلَيكُمْ لاَ يرْقُبُواْ فِيكُمْ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّةً﴾ دەربارەی ئێوه تەماشای

وە مراعاتی رەحم و قرابت و نمە ناکەن! ﴿يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ﴾ راضیتان ئەکەن بەزارو زوبانیان، قسەی محبت آمێز و دۆستایەتیتان لەگەڵ ئەکەن، گەلێ مسڵمانان پێی ﷺ لێئەخەڵە تێن! ﴿وَتَأْبَى قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیان اباء ئەکا، لە موالات و محبت و ارضای ئێوە! منبعیش قلبە! ﴿وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ﴾ خارجن لە حد و قەیدو بەندی مروت و شەرەفی انسانی، وەک سیاسیونی ئەم عصرە! ﴿اشْتَرَوْاْ بِآيَاتِ اللّهِ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ استبدالی آیاتی خوا بە قیمەتی کەم، هەوێنی رواسای دینی تیایە! ﴿فَصَدُّواْ﴾ وەرگەڕان، عەوامیان وەرگێڕا، بە تبدیل و تاویلی خراپ، وەتحریف و کذب و افتراء ﴿عَن سَبِيلِهِ﴾ لە رێیی خوا، رێیی راست، رێیی امانت و وەفاء! ﴿إِنَّهُمْ سَاء مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ ئەوانە خراپن، ئەوەی ئەیکەن یاکردویانە، بەدە! بەدی یان دینی و دونیوی یە یا عامە مستمرە - الی یوم القیامة- ﴿لاَ يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلاًّ﴾ یا خزمی خۆشیان بن! ﴿وَلاَ ذِمَّةً﴾ نگە داری ناکەن، دوشمنێ بێ مروتن! ﴿وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ﴾ هەر ئەوانن متجاوزن لە حد! چونکی اهلی علم و دینن! ﴿فَإِن تَابُواْ﴾ لە صدود ﴿وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ﴾وەکی ئێوە! ﴿وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ﴾ (حسب الشریعة المحمدیه)! ﴿فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾ برای ئێوەن لە دیندا! تەماشای شدەتی خراپەی وان مەکەن! بەبرای خۆتانیان قبوڵ بکەن! ﴿وَنُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بە گوێرەی فرقی مراد بە خطاب، لەگەڵ اصنافی مشرکین و ئەوانی وەک وان! ﴿لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بزانن! تامل و تفکر کەن، لە عبارات! فکری خۆیان بکەنە تابعی عباراتی قرآنی! صرفی آیات نەکەن بۆ تطبیق لەگەڵ فکری خۆیان! فرقی چەند زۆرە (براءة من الله و رسوله الی الذین عاهدتم من المشرکین) لەگەڵ (ان الله بريء من المشرکین و رسوله)! فەرقی چەند زۆرە (فخلوا سبیلهم) لەگەڵ (فاخوانکم فی الدین)! ﴿وَإِن نَّكَثُواْ إِيمَانَهُم مِّن بَعْدِ عَهْدِهِمْ﴾ ئەگەر ایمانیان نەهێنا و عهدیان شکاند ﴿وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمْ﴾ وەکو علمایەکانی (جوو) و (دیان) مفسد و مهیج و محرکەکان - الی الیوم - غافڵ نین لە قدح و ذمی دین و صاحبی دین!

﴿فَقَاتِلُواْ أَئِمَّةَ الْكُفْرِ﴾ رؤسای دینیان و سیاسیان! (ابوسفیان) و امثالی نظر بەو ابا لسانه بە (امام) ناخوێندرێنەوە! مع انە پاش فتحی (مکە) (ابوسفیان) مسڵمان بوو، ذی غفلت! ئافەرینی خودا لە حضرەتی (حذیفە) بێ ئەڵێ: (تائێستا شەڕ لەگەڵ اهلی ئەو آیتە نەکراوە! نازانم خواکێی پێ مرادە؟ خوا عالم ترە بە مرادی خۆی!) چەند مخلصی ئەو زاتانەم، شتێکی کە بە تەواوی نەیزانن، بفەرمون نایزانین، بەڵام ئەو نوعە مەلایانە زور کەمن! بەڵێ ئەوانە (پطروسی ناسک) و امثالی وین کە ئاگری حروبی (صلیبی) یان هەڵکرد! تصویری حضرەتیی خیر الخلایقیان، بە صورەتی افسق الأنام کرد! دەڵێن: (پطروس) و امثالی وی لە ملوک و رواسای سیاسیون، کە کرانە امراء، عهدیان کرد و عهدیان شکاند! ئەوانە لەمێژە لە (اوروپا) پەیدا بوین، فکریان مەحوی دینی اسلامە! لە تهیجی افکار (آناء اللیل و أطراف النهار) سعی ئەکەن - من کل الوجوه - خەریکن بۆ هەڵگرتنی مآثرو مفاخری دینی (خاتم الأنبیاء)! یعنی بۆ مەحوی شەرەفی بەشەریەت!.

مسڵمانان خۆ بە خۆی خەریک بوون، جسمانی و روحانی، بەگژ یەکا چون، ئاگایان لە کیدی دوشمن نەما، تا سەرنگون بوون! آلان کان کما کان! ناشکری نەبێ مەلایانی (سنی) لەبەر شەڕی (معتزلیان) ئاگایان لە شەڕی رواسای (مسیحی) و (اسرائیلی) نەماوە یا نیە! ﴿إِنَّهُمْ﴾ ئەوان، پێشەوایانی کفرو ضلال و إضلال! ﴿لاَ إيمان لَهُمْ﴾ نەبڕوای بە خواو رەسولی خوا، نەسوێند! مرحوم (شریف حسینی بن علی) ئەو معاهداتی انگلیز و خلفاء لەگەڵیان کردبوو، پاش عهد شکاندنیان، نشری کرد بە جرائد و فەرموی: (نەمزانی ئەوانە وا بێ عهد و پەیمان و وەفان)، من ووتم: (سبحان الله! شریفی محترم هەروەک لە سیاسەت غافڵ بووە دیارە لە قرآنیش غافڵ بووە! خوا شاهیدە ئەوانە ایمان و عهدیان نیە!) سەیری ئەو سەیرە لە سەر ئەو هەموو بێ شەرەفیە کە شرق و غرب ئەیزانێ: ئێستا سوێند بەشرف

ئەخۆن! ﴿لَعَلَّهُمْ ينتَهُونَ﴾ سبحان الله! لەو قرآنە! قسە لێرە لە ائمەی کفرە، منازعەی ائیمەی ئێمە لە یمینی کافر بێ جێ یە! حەق وابوو هەمو مسڵمانان مقابلەیان بکەن! وەحتا ئەوڕۆ با وجودی ضعفی مسڵمانان، ئەگەر بە عمومی اتفاق بکەن، ئەو ائمەی کفر ئەگەڕێنەوە، ناتوانن طعن لە دین بدەن، ئەوەندە بێ مروتی لەحەق اسلام بکەن! بەڵام ئەمە محاڵە! ئێستا سوادی أعظم لە مسڵمانانی تازە (رەسیدە)، ئەوانە یان لە قوم و آباء و اجدادی خۆیان خۆشتر ئەوێ! محبت ولاێنی ئەوان، سەرزارەکیە! هی ئێمە لە عومقی دڵە، پڕبە دڵە! ﴿أَلاَ تُقَاتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُواْ إيمانهُمْ﴾ سوێندی خۆیان هەڵوەشاندیە. ﴿وَهَمُّواْ بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ﴾ وەک (جبائي) ئەفەرموێ: (لەمدینە) ئافرینی خودای لێ بێ! قسە بێ قیل و قالە! ئەگەر لە (مکە) با، ئەیفەرموو: (واخرجوا) ﴿وَهُم بَدَؤُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ لە شەڕو جەنگ و نقضی عهد و حلف. ﴿أَتَخْشَوْنَهُمْ﴾ ئایا لێیان ئەترسن؟ ئەمڕۆ ئێوە لەوانەنین بترسن! حاشا نابێ! یعنی ئەگەر شەڕیان لەگەڵ نەکەن، ئەبێ محضاً لە ترسنۆکیی بێ! ﴿فَاللّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ﴾ نەتوانن مخالفەی امری بکەن. ﴿إِن كُنتُم مُّؤُمِنِينَ﴾ لله الحمد مؤمنین، مؤمنی کامل... خوا خۆی شاهدی دا لە حەق مهاجر و انصار (أولئك هم المؤمنون حقاً)، کەوابێ ئەبێ بڵێن: (امری خوای لەسەر سەر لەسەر چاو، ئەوە سەر، ئەوە ماڵ، ئەوە اولاد، لە رێیی خوا بەختی کەن!) ﴿قَاتِلُوهُمْ﴾ (شەڕیان) لەگەڵ بکەن! ﴿يُعَذِّبْهُمُ اللّهُ بِأَيْدِيكُمْ﴾ بە کوشتن و بردن و بڕین! ﴿وَيُخْزِهِمْ﴾ ذەلیلیان ئەکا، ئابڕوویان ئەبا! ﴿وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ بە نصری قطعی! ﴿وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ﴾ سینگیان تەنگ بوو لەبەر خوفی مغلوبی! ئەوجا دڵ قوی ئەبێ براءتیان ئەبێ لە هەمو دەغدەغە! ﴿وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ﴾ رق دڵی هەمویان ناهێڵێ، ئەیبا، باکوڵ و کۆی خۆیان پێ داڕێژن! یاخود شفای صدریان ئەبێ بە کوشتن و ذللەتیان! رقی دڵیان نایێڵێ دەربارەی ئەوانە ی مسڵمان ئەبن، ولو بێ حد و حساب، عذابیان لە دەست جێشتبن دڵیان ماڵاماڵ بووبێ لە

قینیان، بۆیە ئەفەرموێ﴿ وَيَتُوبُ اللّهُ عَلَى مَن يَشَاء﴾ بالاخره مجبور ئەبن ایمان دێنن، خوا تۆبەیان لێ قبوڵ ئەکا، ئێوەش طبعاً ئەبێ دڵتان لەگەڵیان ئاشت بێتەوە! ﴿وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ئەزانێ ئەو نوعە مسڵمانانە ئەگەر چی لە اولەوە زۆر مخلص نین، بە لام وردە وردە بە برکتی صحبەتی صاحب رسالەت و استماعی قرآن، رەگەشینکەیان نامێنێ! و مقصدیش (لەحربي) ئێوە، هدایتە! ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُواْ﴾ لەسەر حاڵی خۆتان بن، امرتان ناکرێتێ بە جهاد؟ ﴿ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللّهُ الَّذِينَ جَاهَدُواْ مِنكُمْ﴾ بە علمێکی بالفعل، ئەتانەوێت وەک (حواریون)ی (عیسی) خەریکی عبادەت بن؟ دوای هەر یەک بەلایەکدا بچن بە حیلە و دەغەڵی دەعوەتی خەڵک بکەن؟ هەریەک ئاوازەێکی لێ بێ، صەد نوعە کتاب بهێننە گۆڕێ؟ حاشا! دینی اسلام دینی مەردانە یە! بە آیاتی ساطعە و سیوفی قاطعە، لە مشارق و مغاربی ارض، خۆی ئاشکرا ئەکا! ﴿وَلَمْ يَتَّخِذُواْ﴾ ئەو مجاهدانە، لە اشدی اوقاتی ناخۆشی و تەنگانی! ﴿مِن دُونِ اللّهِ وَلاَ رَسُولِهِ وَلاَ الْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً﴾ (معتمد علیە)ێ لە اجانب! غیری خواو پێغەمبەر و مسڵمانان! بەڵێ محکێ تجربە لازمە، تا نقد و مغشوش دەرکەوێ! ﴿وَاللّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ اما غرضی ئەوەیە دەرکەوێ! علمی حەق (لایتغیر)ە، اما تعبیری عبارەتی، بە گۆڕانی زەمانی معلوم، ئەگۆڕێ! ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ ولو مامی پێغەمبەر و اقاریی بن! لایەقی وان نەبوو نەدەبا ببێ! ﴿أَن يَعْمُرُواْ مَسَاجِدَ الله﴾ مزگەوتان ئاوەدان کەن. مسجد الحرام و غیری مسجد الحرام!. بعضێ ئەڵێن مراد (مسجد الحرام)ە جمع بۆ احترامە ﴿شَاهِدِينَ عَلَى أَنفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ﴾ بنۆڕن! کعبەیان کردبووە (بیت الأصنام)، وەچ مساجدی تریان نەبوو، خزمەتی بکەن! وە (شبان) یان ئەکردە خدمەت چی مسجدالحرامیان، بۆ نفعی خۆیان و مباهات! ﴿أُوْلَئِكَ﴾ ئەو عامرانە ﴿حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ﴾ باطل بوو، بێ حاصڵ بوو ﴿وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ﴾ نەبۆ دونیا نەبۆ قیامەت فائدەی پێ نەدان. لە (ضحاك) نقل ئەکەن: (کە حضرەتی (عباس) اسیر بوو،

مسڵمانان تعبیریان کرد بە شرک و قطعی رەحم، حتا برازای یعنی (امامی علی) قسەی غلیظی پێ گوت، (امامی عباس) فەرموی: «ئێوە خراپە ئەڵێن، چاکەمان بزرئەکەن! ئێمە عمارەتی مسجدالحرام ئەکەین! بە رگ لە کە عبە ■ لئە کێشین میوانداری حاجیان ئە کە ین بە ندی بەنداران گوشاد ئەکەین!»، ئەو جا ئەو آیتە نازل بوو). لام وایە قطعی نظر لە تطبیقی عبارەت ئەکا! یان ئاگای لە (خلودی فی النار) نەبوو!! ظاهری عبارەت دیارە مراد ئەوانەن کە لە سەر کفر رۆیشتبن! ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ﴾ علی الأطلاق بالأتفاق لێرە، جمع، لەسەر حقیقەتیەتی! ﴿مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ بەو نوعە کە (لا يجزى و الد عن ولده) ﴿وَأَقَامَ الصَّلاَةَ﴾ نوێژ، فیتە فیتو چەپڵە و رەقص و چەنگ و چەقەوانە لێدان، نا! ﴿وَآتَى الزَّكَاةَ﴾ کەسێ خۆی اربابی حسنات بێ دەوڵەمەند بێ، زەکات دەر بێ بەحەق، ئەو ئەتوانێ خزمەتی مزگەوتان بکا! ئەوەی فقیر بێ، خزمەتی مزگەوت، بۆ خزمەتی خۆی ئەکا، نانی پێوە ئەخوا! نوێژی بە راستیش، نوێژی پیاوی دەوڵەمەندە بێ روو و ریایە! ئەگەر بیکا، خالصاً بۆ خوای ئەکا!﴿وَلَمْ يَخْشَ﴾ احداً ﴿إِلاَّ اللَّهَ﴾ روحی مقصد لێرە، ئەو جملەیەیە! ئێوەش نوێژی زەمانی ترستان ئەکرد، ناشکرێ نەبێ، بەو لەرزە لەرزە و حراستە و هاتوچوونە و ئاگاداری اسلحە، ئەو نوێژە ئەبێ چ خشوع و خضوعێکی تیابێ؟ ئەگەر حربتان نەکردبا، چۆن مادی و معنوی بە فراغی قلب، بێ خوف و خشیەت لە (عمرو وزید) عمارەتی مساجدتان ئەکرد؟ ﴿فَعَسَى أُوْلَـئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾ مکافاتی عمل وەرئەگرن لە دونیا و قیامەت، ای دونیا للە الحمد نائل بوون، ای قیامەت بعونە و لطفە تعالی، نائل ئەبن! بۆیە (ابن عباس) ئەفەرموێ: (الى الجنة)! نیکی ئەم ذەواتانە داخلی (عسی) بێ، هی کافرانی مشرک ئەبێ چۆن بێ؟ ئەوی مؤمن بێ، ئەبێ دائم الخوف بێ، بە عملی خۆی مغرور نەبێ! لەسەر موسعی و عملی، رجا و اومێدی بە لطفی حەق بێ، ولو مستحقیش بێ، خۆی بە مستحق نەزانێ!

تازياتر تێ كۆشێ! سبحان الله العظيم قرآن و آمالى مسلمانان زۆر لێك دوورن! بە دوو ركعتى نوێژى كلۆر، هەزار نازو نووز لەسەر خوا ئەكەن، ئەبێ بە شريك و آمرى خوا، عهد و ميثاق لەگەڵ قاتل و رێگر و ظالمان غداران ئەكەن! بێ وان، نەچنە بەهەشت! يعنى بە قطعى بيانبەنە جنة! حاشا عهدى وان لاى خواو رسولى خوا، اعتبارى نيە! لە سالى ١٩١٩ ميلادى اول نوێژى جەژنى زەمانى استلاى انگليزمان كرد، كەلە (محراب) هاتمە دەر بەزەيم بە خۆمان داهات، گريان غلبەى لێ كردم، و وتم: (ئەوا نە مردين نوێژێ جوولەكانيمان كرد!)، ئەوانە ى ئاگايان لێ بوو ئەوانيش گريان! حقاً عبادەتى زەمانى استقلاليەت، و زەمانى ژێر دەستى فەرقيان زۆرە! وەدينى اسلام بە ذللەت نارێ! يا عزيز و يا قوى! عزەتێ! قووەتێ! ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ﴾ لەزەمانى شركتان واتان حساب ئەكرد ئەوە خدمەتى خوايە موجبى رضامەنديەتي، چ حاجت ئێمە ايمان بەو ذاتەى بێنين وە تكاليفى قبوڵ بكەين. ﴿وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ بنا كردەى (خليل الرحمن)وە فرزەندى ارجمندى (اسماعيل) ﴿كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ﴾ (وحده لا شريك له!) ﴿وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ بێ اعتماد لەسەر فديەو مديە، شفاءو مفاء! ﴿وَجَاهَدَ﴾ بە ماڵ و نفس ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ خالصاً مخلصاً لوجهەالكريم بۆ طمعى پاتاڵ و تشفى لە دوشمن و سمعە و رياء!! ئەو ذەواتانە چۆن وەك يەك ئەبن؟ ئەو اعمالانە چۆن پێك ئەچن؟ ﴿لاَ يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ﴾ وەهەركەسێ اهلى إنصاف بێ، ئەزانێ مساوى نين، ئەو حكمە زۆر ظلمە، تجاوز لە حد! ﴿وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ خود بين و خود پەسند، تا ئەو خلقەيان هەبێ، رێ لە چاكە نابەن، تساوى و عدم تساوى لە بەينى ذەوات، يا لە بەينى صفات، ئەبێ طبيعى ذات و صفەت، پێك ناچن! روايەت كراوە (سقاة) جمعى (ساقي)يە (عمرة) جمعى (عامر)ە لە (محمد بن على الباقر)، (ابن الزبير)، (ابى جعفر) ، (ابى و جزه السعدى) (سيدى آلوسى) ئەفەرموێ: (ابى و جزه السعدى) لە قرايە ولو بە شعر شهرەتى هەيە. لاى

(حقیر) ظاهر وایە ئەوە خطاب بێ لەگەڵ ئەو زوعەمایانە ی کە بعد الفتح مسڵمان بوین! ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ﴾ ئێرە لەبەر مقابلانی، جێی (اووا) وە (نصروا)ی نیە! فانهم! ﴿وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ﴾ گەورە تر و بڵندترن﴿دَرَجَةً عِندَ اللّهِ﴾ لە سقاة و عمرە، ولو مسڵمانیش بن! ﴿وَأُوْلَئِكَ﴾ بێ (عسی)! ﴿هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ بە حصر! ئەوی مقابلیان هیچ فوزیان نیە! ﴿يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم﴾ الان ﴿بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ﴾ رەحمەتێ خاص! ﴿وَرِضْوَانٍ﴾ (رضوان من الله اكبر). ﴿وَجَنَّاتٍ﴾ ذات درجات! ﴿لَّهُمْ فِيهَا﴾ لەو باغانە ﴿نَعِيمٌ مُّقِيمٌ﴾دائم، مالا یزول و لایرتحل! ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ لە جنات! ﴿أَبَدًا﴾ بێ تاویل و تحویل و مجاز! ﴿إِنَّ اللّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ انسانیەت دەیەوێ خۆی لە اجری گەورەی الاهی محروم نەکات! ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ هەرچەند صلەی رەحم لای خوا زۆر خۆشە ویستە اولوالارحام بعضێ بە بعضێ اولی ترن، حتا لە خۆیان، و اطاعەی داک و باوکان معاونەتیان لە واجباتی دینی اسلامە، بەڵام ئەمە مشروطە بە شرطی ایمان هینانیان بروابیان بە خواو رەسولی خوا بە راستی ﴿لاَ تَتَّخِذُواْ آبَاءكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ﴾ اشقاء! ﴿أَوْلِيَاء﴾دۆست! ﴿إَنِ اسْتَحَبُّواْ﴾ اختیار یان کرد لە میل و حبی قلبی ﴿الْكُفْرَ عَلَى الإِيمَانِ﴾ کەسێ لە حب و میلی دڵ ترجیحی کفر بەسەر ایمان دابدا، زۆر زۆر دوورە لە ولای دین وسعی کردن بۆ زەرەر لێ نەدانی ئێوە! ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ﴾ هەر کەسێ لە ئێوە، بعد الان، بە دۆستی قلبییان بگرێ ﴿فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ خۆیان هەڵنەخەڵەتێنن بە حنونی ابوت و اخوت، ئەگەر بیکەن، هەرئەوان ظالمن! ﴿قُلْ﴾ ایهالرَّسول! ﴿إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ﴾ژنتان، فی الحقیقە حبی ژن مانعێ بەقووەتە لە قبوڵی دین! حتا ئەمڕۆ گەلێ لە عقلای اجانب قلباً میلی اسلامەتیان هەیە، ئارەزو ئەکەن مسڵمان بین، ژنەکانیان ممانعەت ئەکەن، چونکی سبب بە بێمبالاتی مسڵمانان لەگەڵ ژن، وەبێ حورمەتیان، رواسای دینیان وایان تێ گەیاندونە، ئەو بەدکاریە، مقتضای دینی اسلامە! خاصة

تعددی زوجات لەگەڵ بێ عدالتي، ژنانی اجانبی زۆر متنفرکردیە لە دینی اسلام! ﴿وَعَشِيرَتُكُمْ﴾ قوم و خوێشی خۆتان، کە معاشرە و زیندەگانی پێکەوە ئەکەن﴿وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا﴾ بە زەحمەت و مشقەت و ماندیەتی دەست کسبتان کردیە، بەدەستتان کەوتیە! ﴿وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا﴾ بێ رەواج بێ، لەبەر فواتی وەقتی رەواج! ﴿وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا﴾ قصر و قصور، حوجرە و باڵەخانە و شانە شینێ، مشرف لەسەر باغ و باغات! کارخانە و معامل بۆ انواعی مصنوعات و منتوجات. ﴿أَحَبَّ إِلَيكُم مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بە میلی دڵ، حب رابطەێ عجیبە، هەموو رابطان ئەپسێنێ، القای محبەتی خوا و رەسولی خوا لە دڵاندا، هەزار دەلیل و برهان دێنێ بۆ اطاعە! بۆیە (مسیحی) و (رافضي) و اشباهیان سعی ئەکەن بۆ زێدە خۆشەویست کردنی (مسیح، امام، ولی و مەلي!) ﴿وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ﴾ ئەوانەتان لا خۆشەویستتر بێ، لە خواو رەسولی خوا و غەزا! ﴿فَتَرَبَّصُواْ﴾ خۆتان راگرن منتظر بن! ﴿حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ﴾ عقوبەتی خواي، ذللەت و منکوبی و ژێردەستی و بێ حورمەتي! ﴿وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ ئەوانەی لە طاعت بە واسطەی بێ میلی یا کەم میلي! لاشک ئەو تشدیدە بۆ حربی (مکە) نیە، ئەو تێ پەڕي، ئەوە بۆ حربی دوائیيە لەگەڵ (اعراب) لەگەڵ (فارس) لەگەڵ (رۆم)! باوکم (حاجی مەلا عبداللە) ئەیفەرموو: (بعضە کەس لە محاربەی قارص و بایزید ئەگەڕانەوە ئەیان گوت «پایز نێزیک بووە، ساوارمان نەکوڵاندیە، بانمان سواغ نەکردیە» ئیتر ئەو نوعە ملتە چۆن سەرئەکەون؟ چۆن مەحو نابنەوە؟ خلاصە حال و احوالی امت لەگەڵ ئەو آیتە زۆر دوورە! نعوذبالله موجبی یاسە! ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللّهُ﴾ بە محضی تاید! ﴿فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ﴾ لە گەلێ مواقیفی حربیە، بێ اسباب، کەم عدد، پاش شکستي! ئەو خودایە، باز، نصرەتی ئێوە، حتا پاش وەفاتی صاحب رسالەت، ئەدات! (سیدی آلوسي) ئەفەرموێ: (روایەت کراوە کە «متوکل» زۆر نەصاغ ئەبێ نذر ئەکا ئەگەر خودا شفای بدا، ماڵێ زۆر، بکا بە خێر،

کەچا بۆوە لە علمایانی سؤال کرد، حدی کثیر، چەندە؟ اختلافیان بوو! اشارەی کرایێ کە سئوال لە «علی بن محمد بن علی بن موسی الکاظم» بکا! ئەویش لە خانوی خۆی بە امری خلیفە محبوس بوو. بۆیان نوسی، جەوابی دا ٨٠ درهەم بکاتە خێر، یعنی حدی کثیر هەشتایە، چونکی ئەوان مواطنی (کەخودا) بە (کثیر)ی حساب کردیە، هەشتابوین! سبحان اللە، جەوابێ نابەجا! هەشتا بۆ مواطنی حربیە گەلێ زۆرە، اما هەشتا درهەم بۆ تصدیقی خلیفە، هیچنیە! لام وایە ئەو نوعە حکایت (اویدرمە)یە! گۆییا امتیازی علمای آل و بیتی پێ ئەدەن، بەڵام ئەمان لەوان زیاترنین، کە ئەو جەوابە چروکانە بدەنەوە! وەهەمو اصحابی سیر ئەزانن مواطنی حروب و سراپای رسالەت پەناه چەندە! وەهەشتا بو حرب زۆرە، بەڵام هەشتا درهەم بو ایفایی (نذري) خلیفەی رووی زەمینی ابن عمی سید المرسلین، بە زۆر نازانن!! (سیدی آلوسي) ئەو جۆرە حکایاتانە قبوڵ ناکا، اما جار جار اغماض ئەکا! ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ﴾ ئەوێ رۆژیش نصرەت دان غلبەتان، بە محضی امدادی حەق بوو! با وجودی زۆر بوون! ﴿إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ﴾ دیارە ئەو اعجابە بۆ شخصێک و دووان نەبووە ﴿كَثْرَتُكُمْ﴾ ئەڵێن دوازدە هەزار کەس بوین، فی الحقیقة ئەوندە بۆ حربی ئەو زەمانی زۆر بووە! بەڵام اعجابێ کە موجب بێ بۆ بێ مبالاتی ولاقەیدي، کەڵکی کثرەت ناهێڵێ! ﴿فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا﴾ زۆریتان نفعی نەدانێ! لا ابالي، مع انە، زۆریان تازە مسڵمان بوون، رەگە شینکەیان مابوو؟ بۆتاڵان گرتن هاتبون، بۆ سەر دوشمن چۆن ئەبێ؟ ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾ ارضی واسع لەسەر ئێوە تەنگ بووبوو! ﴿ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾ پشتتاندا، هەڵاتن! کەمێی مابونەوە لە خدمەت پێغەمبەر اما ئەوندە نسبەت بە دوازدە هەزار کەس، ناخوێندرێتەوە! کثرەتی لەشکر لەگەڵ پرهێزی و احتراس، باشە! نەخوا، نە رەسولی خوا انکاری ناکەن! نابینی تا مسڵمان زۆر نەبوون، خوا نە ی فەرموو (حسبک اللە و من اتبعک من المؤمنین) وەخوا خۆی امر ئەدا ( و اعدوالهم ما استطعتم من

قوة) چ حضرەتی (ابوبکر)، یا شخصيتر، یا حضرەتی رسول الله بفەرموێ ئەو لەشکرە لە کەمی ناشکێ، قولی با صوابە! بەڵێ لە قلەتی عدد نەشکان! اما لە قلتی مبالاة شکان! مع انە: (سیاهی لشکر نیاید بکار ـ کی یک مردی جنگی بە ازصد هزار) هەزار مەردی جەنگی زۆرە، فضل لە دوازدە هەزار! و فوق الکمل (اطاعەي) عسکر، مهارەتی فرماندان لازمە! (حنین) وادیێکە لە بەینی (مکە) و (طائف) سێ میل دوورە لە (مکە) دوشمن چوار هەزار کەس لە (هوازن) و (ثقیف) و (جشم) وە جمعێ لە (بنی هلال) بوون، لە (روح المعاني) ئەڵێ: (قبل مسڵمانان اولاً حملەیان بردە سەر دوشمن شکاندنیان، مسلمانان یعنی تازەکان رووپانکردە غنائم، دوشمن بایداوە سەریان، مسڵمانان شکان)، بەڵێ دوور نیە! دوایی دیتم (سید رشید) ئەمە ئەکاتە سبەبێ لە اسبابی شکست! زاتاً آیتی (ما کان لنبی ان یکون لە اسري) اولاً و آخراً علما و عملاً، اهمال کرا! ﴿ثُمَّ﴾ پاش انهزام و اضطرابی نبوي، حتا قصدی ئەکرد تەنها خۆی بە لەشکری دوشمن دادا ئەیفەرموو: (انا النبی لاکذب، انا ابن عبدالمطلب) ﴿أَنزَلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ﴾ دڵ راوەستان و بێ اضطرابی ﴿عَلَى رَسُولِهِ﴾ (صلى الله علیە وسلم) ﴿وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوانی هەڵاتي، بە خۆ هاتنەوە، یەکیان گرتەوە ﴿وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾ لەشکرێ روحی معنوي، بە دڵێ پڕ لە شجاعت، گەڕانەوە سەر دوشمن! ﴿وَعذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بە قتل و جرح و اسارەت و سبي! رەنگە ئەوانیش بە پاتاڵ خەریک بووبن! ﴿وَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ﴾ (ومن حذی حذوهم!) ﴿ثُمَّ يَتُوبُ اللّهُ مِن بَعْدِ ذَلِكَ﴾ ئەو ماجرایە! مع انە، زۆر دوور بو قبوڵی (توبە) لەوانە! بەڵام رەحمەتی خودای فراوانە! ﴿عَلَى مَن يَشَاء وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئێوەش بەو گوێرە رەفتاریان لەگەڵ بکەن! ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ پیسن، دڵیان لەگەڵ ئێوە پاک نابێ! مادام مشرک بن! دیارە مقصد لەو نجاستە، بجاستی عینی نیە! وەک بەراز و قانوراتی قابلی پاک بوونەوە نەبێ! ئەگەر نجس العین بن، بە ایمان پاک

نابنەوە، وەک بە عضـێ موحەقیق ئەفەرموون ئەگەر بە راز بڵـێ (لا الـه الا الله محمد رسول الله) پاک نابێتە وە با (اشهد) ویش لەگەڵ بێ حقیقة ئـەو قسەیە زۆر متینە بۆ ردی قولی (ابن عباس) ئەڵێ: (مشرک بنجس العـین)، (جعفري) لەسەر ئەو قسەن! (سیدی آلوسي) یا بـۆ خـاطـری (ابـن عـم)ي، یـاخود حـەزی نـەکردیـە (تـەماشـاي) (نجس العـین) بکـا، ئـەو دەلیلـەی لا هیچە!. وەقیاسی لە (خمر) غلطە! بەڵێ ئەگەر (نجس) وصـفی قیاسـە کـە بێ، جوانە! (خمر) کە بووە (خل) حەلال ئەبێ، پاک ئەبێتەوە! ئەگەر بێتە بـابی (نقـل) چـاو ناپۆشـن! ﴿فَـلاَ یقْرَبُـواْ الْمَـسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَـامِهِمْ هَـذَا﴾ نافەرموێ (فلا تمسوهم)! مە یِڵن پاش ئەم ساڵ نێزیکی مـسجدالحرام بـبن، جێی خطرە، لە ﷺ یدیان امین مەبن! ولو لـە مـسجدالحرام، لـە شـهر الحـرام دابن! خباثتی خۆیان دەرحەق ئێوە اجرا ئەکەن. وەهەم (بیـت) لـە اصـنام، (مکە) لە شرک، ئەبێ بالکلیە پاک ببنەوە! سیدی کائنات کە فتحـی مکـەی کرد گەڕایەوە (مدینە) امامی (ابوبکر) و (علی) نارد، پـاش تبلیـغ و تنبیـە سـاڵـی آتـی سـپاه سـالاری رسـالەت تـشریفی چـوو لـەگـەڵ مـسڵمانان، بـێ اختلاطی اهلی شرک ادای مناسکی حجـی فـەرمـو! ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَیلَـةً﴾ فقـد هێشتا مشرک زۆرن! ئەگەر لە موسمی حج نەێن، معاملەمان کسادی ئـەبـێ! زەرەرێ زۆرمان پێ ئەگا، گوزەران ناکەین. ﴿فَسَوْفَ یغْنِیکُمُ اللّهُ مِن فَـضْلِهِ﴾ گـەلـێ جـار (سـوف)ی خـوای بـەقـەدەر (س)ی ئێمـە، نـابێ! فـضلی وي، انواعە، یـەک لـەوان (جزیـە) یـە، زۆر جوانـە لـەگـەڵ آیتـی آتـي﴿إِن شَـاء﴾ ئـەیکـا. (ان)ی خـوای لـەو نوعـە مقامـە لـە فـوقی (اذا)ی غیـرە! ﴿إِنَّ اللّـهَ عَلِیمٌ﴾ حـالی ئێوە ئـەزانـێ، کـەمـێ صبر کـەن، دونیـا بـە مـەرامـی ئێـوە ئەبێ!﴿حَکِیمٌ﴾شـتێ بـە جـێ ئـەکـا. ظـاهر وایـە ئـەو خطابـە نظـر بـە تـازە مسڵمانە کـانی (بعد الفتح) بـێ! ﴿قَـاتِلُواْ الَّـذِینَ لاَ یؤْمِنُـونَ بِاللّـهِ وَلاَ بِـالْیوْمِ الآخِرِ﴾ بە ایمانێ معقول و معتبەرا! ﴿وَلاَ یحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ﴾ خاتم الرسل، یا رسولی کە گوایا ایمانیان پێی هەیە وەلـەسـەر دینـی ئـەون! ﴿وَلاَ

یدِینُونَ دِینَ الْحَقِّ﴾ علی الأطلاق، تازە و کۆن، بالکلیە مەیلیان لەگەڵ دینی حەق نیە! تابعی هوان مایلی مزخرەفاتن!﴿مِنَ الَّذِینَ أُوتُواْ الْکِتَابَ﴾ اسرائیلی و مسیحی. بالخاصة سوادی أعظم لە مسیحیان، ایمانیان، ایمانی اهلی شرکە، لە قیدی حلال و حرام دانین! ئەوانە شەڕیان لەگەڵ بکەن﴿حَتَّی یعْطُواْ الْجِزْیَةَ﴾ ئەگەر (مسلمان) نەبوون! ﴿عَن یدٍ﴾ دەست بە دەست، هەرکەس جزیەی خۆی بە دەستی خۆی تسلیم بکا، وکیل قبوڵ نیە! ﴿وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ لەسەر وضع و هیئەتی محقرانە بیدەن! بۆیە نابێ بینێرن بە پیاویان و وکیلیان، چونکی نوعە عزەتێکی تیایە! ئەوانە ی بێ سیاسەت و کیاستن وەکو کۆرەی (معري) اعتراض ئەگرن، ئەمە تقریر لەسەر کفر، بە مقابلی چەند پوولێ! لاشک اوامر نواهی الاهی بە گوێرەی إستطاعە و امکانی استعدادیە! ممکن بوو مسڵمان لەگەڵ مشرکی عەرەب قتال بکا، یا مەحویان بکەنەوە، یا ایمان بێنن، وەیەک رەنگی عەرەب دیناً و مذهباً و سیاسة، بۆنشری اسلام و دەوامی عز و مجدي، لە لوازم بوو! تا ئەوان یەک بن! دینی اسلام نشست ناهێنێ! بەڵام ئەو حکمە مقابل بە (ماعداي) عەرەب لە دائرەی امکان و إستطاعەی مسڵماناندانیە وە قابل نیە ئەو قومەی مسڵمانان شەڕیان لەگەڵ بکەن یا مەحو بکرێنەوە یا اسلامەتی قبوڵ بکەن! خوا خۆی علیمە بە احواڵی (روحیەي) بشر، ئەزانێ اکثری خەڵک قبوڵی ایمان ناکا، ئەزانێ دونیا تقلباتی زۆرە، علی الأطلاق تا انقراضی عالەم، نصرەت بۆ مسڵمانان نابێ! ئەگەر ئەو قاعدەی دانەنابا، لە مێژ بوو انقراضی دینی اسلام ئەهات! دقتی استلای فرەنسە و انگلیز بەسەر شەرقا بکەن! بە مقابیلی معاملەی مجاملە کارانە ی (فاروقی أعظم) و (صلاح الدین ایوبی) حسنی معاملەیان لەگەڵ مسڵمانان کرد، وە الا فەردێ آفریدە لە مسڵمانان قورتار نەدەبوو، یا ئەیانکوشت، یا ئەبا مرتد بێ! معاذالله خلاصە کەسێ اهلی بصیرەت و إنصاف بێ، ئەزانێ خواوەندی علیم و حکیم، بێ حکمت، بە خۆڕاي، ئەو نوعە حمکە، دانانێ!!! ئەگەر کەسێ بڵێ

جوو و دیان ایمانیان بە خوا و رسالەت هەیە؟ الجواب، نیە! ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللّهِ﴾ (عزرا ابن سرایا، ابن عزریا، ابن حلقیا، ابن شلوم، ابن صادوق، إبن اخیطوب، ابن امریا، ابن عزریا، ابن مرایۆت، ابن زرحیا، ابن عزا، ابن بطا، ابن ابیشوع، ابن فینحاس، ابن العاذار (ابن هارون) لە طرف شاهنشاهی فارس (آرتحشـشتا) فەرمانی درابووێ بە نصبی قضاة و داد وەران، کە حکم بکەن بە حکمی خوای ئاسمان. یعنی فەرمانی شاهنشاهی بۆ (عزرا) دەرچوو بە عنوانی (کاهن) و کاتبی کاملی شریعتی ئاسمانی!! لە بابی حەفتەم لە کتابی (عزرا) ئەمەنوسرایە ئەو ها! احتمالی هەیە لەو رووەوە، جوو پێیان گوتبێ (ابن اللە)!. ناقلانی ئێمە بعضە حکایەتی خرافی ئەکەن، من دڵم نایێنێ بیان نوسم! (عزیر) عەرەبیە؟ عەجەمیە؟ مصغرە؟ مکبرە؟ بارجعی مەلایانی عەرەبی بێ! پەکمان لەسەر ئەم قیل و قال نەکەوتووە! ﴿وَقَالَتْ النَّصَارَى﴾ دیان ﴿الْمَسِيحُ﴾ عیسی ابن مریم ﴿ابْنُ اللّهِ﴾ چونکی بێ باب بووە! ﴿ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ﴾ سەرزارەکی و بێ دلیل و برهان بووە! ﴿يُضَاهِؤُونَ﴾ خۆیان، قولی خ[illegible]ان ئەشبهێنن ﴿قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ﴾ لە مشرکانی جاهلی بێ کتاب و نبوەت، بە خۆیان بە قولیان، قسەی وەک قسەی وان ئەکەن، (مع انە) انە زۆر دوور بو لە قومی موحد صاحیبی شریعەت و کتابی ئاسمانی، قولیان وەک قولی کافران بێ! ﴿قَاتَلَهُمُ اللّهُ﴾ خوا بە هلاکیان دا! ﴿أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ چۆن لە حەق وەرگێردراون؟ لای خۆیان ذریتی خلیلن! لەسەردینی کلیمن! ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ﴾ علمای ظاهری ﴿وَرُهْبَانَهُمْ﴾ زاهدەکان و اولیایەکانی علمای باطنی ﴿أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ﴾ هەرچی پێیان گوتبن، علی العمیاء، قبولیان کردیە! بێ محاکمە، بێ (لم) و (لا)، حتا زومرەی اولیایان ئەڵێن (من قال لشیخە لم، لم یفلح ابداً) ﴿وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ﴾ ئەویشیان بە خوا اتخاذکردیە. اما خوداوەندی وی، قیاس لە خوداوەندی احبار و رهبانان ناکرێ! خوایێ تەواو! ابن اللهێ تەواو! انسانێ تەواو! هەر خوایە، خۆی کردە عیسی و چۆوە

ئاسمان، هیکلێکی بەجێ هێشت، ممنوعە لەلایەن (پاپا) کەس نابێ بڵێ: (ئەمە چۆن ئەبێ؟) ئێوە و خودا تەماشای بعضە (اقوالي) اولیایانی اسلامی بکەن، یاخود محبەکانی درۆزن، فرقی چیە لەگەڵ قسەی ئەوانە؟ بەڵکو گەلێ قبیح تر و فاحش ترە!﴿وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهًا وَاحِدًا﴾ لە طرف رسلی عظام، بە غیری ئەمە، امریان نەکراوەتێ! ئەوەی موهمی پەرستنی غیری خوادوەندی واحدی بێ نظیر بێ، لەوان صادر نەبووە! ﴿لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ﴾ کێ هەیە؟ هەموی امثالی یەکن! کەسێ محتاجی لوقمە نانێک بێ چۆن ئەبێتە اله معبود مدبری ارض و ئاسمان؟ ﴿سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ عقڵی اول نێزیک ترنیە لە مقامی ربوبیەت! لە بوتێ تا شرابێ لە داری هیشک! ئەوانە ی بحاثن عەرد ئەکۆڵن بۆ آثاری رابردووان لە (خریبەزاري) (بابل) و (هند) و سائرە بعضە لوحە یەکیان بەدەست کەوتووە، ئەوەی لێ نوسرابوو لێکیان داوەتەوە، لەگەڵ اقوالی مسیحیان، چ فرقێکی نیە! الا بە تبدیلی اسماء نەبێ! ئەوان ئەڵێن (بوذا) (بابلو)، ئەمان ئەڵێن (مسیح)!. (طنطاوی) لە اوائلی سورەی (مریم) نوسیویە تەوە، قول یەک قولە، شرک یەک شرکە، (لەمانە) معلوم بوو گوفتار مسیحیان (کاثولیکي)پاپي، بێ شک لە مشرکان وەرگیراوە ئێمەش لەوان کەمترنین! بەڵام شرکای ئێمە نایەتە حساب ! وەتا انقراضی عالەم تجدد ئەکا!!! ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِؤُواْ نُورَ اللّهِ﴾ئەو رواسایانە، قصد ئەکەن نوری خوا، حجەت و دەلیلی وحدانیەتی الاهي، قرآنی عظیم، نبوەتی خاتم الأنبياء، بکوژێننەوە! منیش عرضیان ئەکەم زاتاً تا (عقڵ)! نەکوژێننەوە، بێ هێزی نەکەن، ناتوانن ئەو خرافاتانە اظهار بکەن، کە عقڵیان چارە کرد، ئەو جا ئەوی ئارەزوبکەن بە سوک و ئاسانی بە دەماغیانەوە ئەچەسپێنن!!! ملاحدە، جهلەی صوفیەی ئێمە، پاپیون، سعی بلیغ ئەکەن بۆ ازالەی عقڵ! صوفیەی ئێمە ئەڵێن: (عقڵ هیچ نیە، کشف حسابە)، اشاعرەش لە بعضێ مقام زۆر اهانە ی عقڵ نەکەن، اما لە گەلەک جێ اعتمادی ئەدەنەسەر! قومێ

افراطیان کردیە اعتبار هەر بە عقڵ ئەکەن و ئەڵێن: (احتیاجی بە نبوەت نیە!)، (معتزلي)ش لەگەڵ ئەم گروهە کەمێ مناسبەیان هەیە، (اما) اما ناڵێن مغنیە لە نبوەت! اما ئەمن زۆر متعجبم لە عقڵ زوو تابعی میل ئەبێ تەماشا ئەکەی بەو قوەتی خۆي، لە علیە خۆي، لە مەحو نابودی خۆی ئەدوێ، فعلی هذا اعتماد لەسەر عقڵ بالکلیە، خطأە! ئەبێ توفیقی بکەی لەگەڵ شرعی صحیح. عقڵی چاک شرعی پاک، زۆر موافقن! (نوري) خوای بە هەر معنایێ بێ ئەوانە قصد ئەکەن بیکوژێننەوە ﴿بِأَفْوَاهِهِمْ﴾ بە زاریان، بە اقوالی تووڕە هات! ﴿وَيَأْبَى اللَّهُ إِلاَّ أَن يتِمَّ نُورَهُ﴾ فی الحقیقة عقڵی بشری لە بدای زەمانی خاتم الرسول، دەستی کرد بە قوەت بوون و تعمم! ئەمڕۆ عقڵ لە غایەتی قوەت دایە، اما مع الأسف میول لێی ناگەڕێ مقتضای عقڵ دەرکەوێ! ئەوەی اهلی انصاف و مرووەت بێ، حەزئەکا ملتی عاقڵ بێ، اما ئەوانە ی میلی ناڕاستی و استلایان هەیە، زۆریان پێناخۆشە تا عوام کەم عەقڵتر بن کیفیان زیاتر پێ دێ! اومێد ئەکەین، خوا (نوري) خۆي، چ حجت و برهان، چ دین و ایمان، چ قرآنی عظیم الشان، چ نبوەتی پێغەمبەری آخر زەمان، چ عقڵی شریفی ممیزی انسان، بێ، بە قوەتی بکا! ﴿وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ و من علی شاکلتهم! و لو پێیان ناخۆش بێ، خوا (نوري) خۆی هەر اکمال ئەکا، بە ارسال و تایدی خاتم الرسول. نوری ایمان، نوری عقڵ، دونیا روناک ئەکا! گەلێ کەس لە تاریکی کفر و جهل نجاتی ئەبێ! وای چەند خۆش بوو ئەگەر (دعات)ی (بدعەت) لە ملتی اسلام سعیان نەکردبا بۆ کوژاندنەوەی ئەو دوو (نورە)!! بەڵام مع الأسف ایمان و عقڵ لە بعضە دڵ و دەماغان دا کەمێ وەک گوڵە ئەستێرەی آخری بەهاران ئەدرەو شێتەوە، باقی هیچ! ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ﴾ خاتم الرسول، عقڵ الکلّ! ﴿بِالْهُدَى﴾ قرآن، دەلیل و برهان، تقویەی عقڵ! ﴿وَدِينِ الْحَقِّ﴾ ثابت، موافقی عقڵ و طبع ﴿لِيظْهِرَهُ﴾ دینی حەق نصرەت بدا غالبی بکا. ﴿عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾ لەسەر هەمو دینی سماوي! لەوە لازم ناکا هیچ کافرێ

لەناو بشر نەمێنێ! تازە خۆی جزیەی دانا بۆ اهلی كتاب! ئەوانەی بۆ حصولی ئەو امنیە إنتظاری (عیسی) ئەكەن، خۆیان لە ظلمات دان.
اغوای مسلمانانیان كرد، خوا ئەم اظهارە ئەكا ﴿وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ (مع انه) هیچ وجهی نیە، بۆ پێ ناخۆش بونی مشركان! ملیەكان لایان گران بێ ظهوری دینی اسلام لەسەر دینی وان نوعاً ما وجهێكی هەیە، اما مشركی بێ دین و ئاین چی؟ خۆ ئەوان هەر ژێر چەپەلوكی خەلكن! ﴿ياأيها الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئێوە ئاگا دار بن! ﴿إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ﴾ رواسای دینی جووان و دیانان ﴿لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ﴾ امتی بێ چارە بە قسەی وان ئەكەن، پێیان اغواء ئەبن، ئەوانیش بۆ طمعی مال، خۆیان ئەكەن بە ضالّ و مضل! بە درۆ دەلەسە بەهەشت ئەفرۆشن، جهنم ئەكڕن، بە پارە براءت و غفرانیان بۆ ئەنوسن، زهد و تقوا ئەكەن بە دوای دونیا. خوا ئەزانێ قبەكانی زێڕو قەفەسەكانی زێڕو زیوو و پۆلا، محصولی اقوالی باطلەیە! ﴿وَيَصُدُّونَ﴾ ناسی عوامی فقیری بەستەزمان ﴿عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ دینی حەق، علم و عقل و عرفان و هۆش و گۆش و حواسن سبحان‌الله چەشم بەندی وا ئەكەن كە حسی هەمو عالەم بە غلط (ببەن) ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ﴾ گری ئەكەنەوە ئەیكەن بە خزێنە، خاصة احبار و رهبان و امثالیان. ﴿وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ حتا زەكاتیش لێ نادەن. دونیا لەسەر قومیان ژێرو بەرە زوور بێ پولێكی صرف ناكەن! بەلێ بۆ جلبی عوام نان ئەدەن، ئەستووكە جۆو، دۆی ترش، وشكە توو و، شوربای بێ تام كە بۆ ریاضەت داران دەست بدا گەلێ كەس چونیە دێ، خۆی و كەرێ شینی، بە ناوی طریق و دەست لە دونیا هەلگرتن، خەریكی طاعەت و عبادەت بوووە قاقەناسی گەیاندیتە خۆی لە برسان، ئەگەر رەقەنانێكی بە دوو گۆلم ئاو خواردبا، دەستی ئەكرد بە فنكەفنكی گریان آە، اۆف، ئێمە لە حسابی ئەو نعمتە چۆن دەرئەچین؟ تا وەك فریزی ڕەگی دادەكوتا، هێندەی پێ نەدەچوو ئەبووە مالكی دێیەكە! اهالی أصلی رووت و

رەجال ئەهاتنە دەرێ! گەلێ کەس لەگاوان و شوان بەو حیلە کاریانە بوینە صاحب خزنە و ملیۆنێر! و علی الدوام بە مضمونی ئەو آیتە خەڵکی ئەترسێنن! خاصة لەسەر قولی (اباذر)ی ئەرژێن! ئەوەی لە حاجت زیادتر دابنێ، بە (کنز)حسابە! نقد و حبوبات فرقی نیە، ماڵ بێ و بەس! ئەوانە چ جای انفاقی فی سبیل الله، بێ وصیەت ئەمرن! خلاصە دونیا لەبەر چاوی خەڵک ئەخەن، تاکو بۆوان بێ!! بابم ئەیفەرمو: (مەلا حبیبی پێبانۆکی لە ایامی فقێیەتیی دا ئەگەر بیزانیبا ئەو شیوەی بەبەر خۆی و رەفیقەکەی کەوتیە بەشی دووان ناکا، تفی دەهاویشتە ناو شیوەکە، رەفیقەکەی بێزی ئەبۆوە، نە یدە خوارد، خۆی بە تێری ئەیخوارد!) فی الحقیقة ئەو آیتە انذاری تیایە بۆ مەلای شیعان و متشیخانی ئێمە، اما علمای (سنە)ی بە ستەزمان، اکثریان محتاجی لوقمەنانێکن! ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ زۆر بە ئێش لە رۆژی جزاء. ﴿يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا﴾ لەسەر (کنوز). ﴿فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ حرارەتی لەسەر مسلط ئەکرێ، لەناو ئاگری جهنمدا، تائەگاتە شدەتی، ئەوەی لەناو جهنم دایە درکی المی داغ پێ کردنی بکا! وەکی اهلی علم ئەڵێن: (لامس بە کیفیەتی ضدی کیفیەتی ملموس، یا کەمتر لەو، مکیف بێ، ئەوجا درکی کیفیەتی ملموس ئەکا. مثلاً بۆدرکی حرارەت عضو یا ئەبێ ساردبێ یا کەمتر گەرم بێ، لەوەی دەستی ئەداتێ، وە الا درکی حرارەتی ئەوشتە ناکا!) نازانم (سیدی آلوسي) بۆچی تذکری ئەو شرطەی نەفەرموە؟ بە لێ! ئەو اکثر بە ترکیبات و توجیهاتی (نحو) و توجهی مرجعی (ضمیر) مشغول بووە ﴿فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ﴾ کە (طالما) بۆ ریا لەسەر عەردیان داناوە ﴿وَجُنُوبُهُمْ﴾ بۆ هەڵخەڵەتاندن، لەسەر عەردي، یا کۆنە حصیری یان، دانایتەوە وەقتی نوستن! ﴿وَظُهُورُهُمْ﴾ لەبەر خوف و خشیەتی حیالی و دجالی پشتی خۆیان کوور کردیە، سەریان دائماً لەبەر خۆنایە، بۆیە (کنوز) گەرم کرایە و بە تایبەتی ئەو اطرافەنە یان داغ دەکەن، یاخود اولا نفرەت لە ماڵی دونیا بە گرژ

کردنی ناو چاوانیان ئەنوێنن! بعده لەبەر زێده تنفر، تەنیشتنی تێ ئەکەن، بعده پشتی تێ ئەکەن، انه بالکلیه اعراضمان له دونیا نایه، هاویشتیتمانه پشتەوه. مەلایانی تریش بعضه توجیهاتیان فەرمووه، باشن مناسبن ﴿هَـذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ﴾ خاصه بۆ نفعی خۆتان، نەملت، نەوەتەن، خێری لێ نەدیت! له قیامەتیش بووه داغتان! ﴿فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ بیچێژن! نۆشی گیانتان بێ! ادخاری کنزی ماڵ، لەسەر مسڵمانان له وجائب بوو، به شرطی له وەقتی لزوم له رێی خوا صرفی کەن. ئەوەی بەسەر مسڵمانان هات اکثری له فقیری بوو! گەلێ جار له وعظدا ئەڵێم: (لازمه ئەوەی به دەستتان ئەکەوێ بیکەنه سێ قسم، یەکێ کان لم یکن دەستی لێ مەدەن بۆ وقایعی عظیمی دانێن!، یەکێ بۆ لێ قەومانی خصوصی، یەکێ صرف کەن له حوائج و ضروریات! له رێی هەواو هەوەس قطعاً ماڵ صرف مەکەن! بەڵام مع الأسف بێ تاثیر ئەڕوا!!) له زەمانی (عثمانی) ئەوروپای کەوتنه ئەندیشه، وایان خیاڵ ئەکرد له اولی اسلام تا ئەمڕۆ حجاجی بیت الحرام هەر یەک به گوێرەی ثروەت، شتێکی داناوه له صندوقی عمومی بۆ حربی عمومی، وەتا ئێستا ئەبێ ئەو ماڵه له ملیارات تجاوزی (کردبی)، ئەگەر وابێ، لاشک ئەوروپای مغلوب ئەکەن! بۆ کشفی عطاء بعضێ له (رووس) ظاهراً مسڵمان بوون، ناوی خۆیان گۆڕی، حتا ختنەکران، هاتن بۆ (حج) تەماشایان کرد، مسڵمانان لەو خیاڵەدا نین!! ماڵێ زۆر، بێ هوده صرف ئەبێ، خاصة قوربانی و دمای نسک!! ئایا انفاقی فی سبیل الله بێ ماڵ ئەکرێ؟ ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ﴾ مبلغی عددی شهوری ساڵ ﴿عِندَ اللَّهِ﴾ من حیث الحکم! ﴿اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللَّهِ﴾ له کتابی کون! حکمی تشریعی و تکوینی، موافیقه! ﴿يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ به مقتضای نسبەتی وضع و حرکەي (قمر) و اجتماعی لەگەڵ (شمس) به دوازده دەوری (قمر)ی ساڵ تەواو ئەبێ! فصولی اربعه لەسەر نهجی دائمي، نه حوڵاتی نه بێ علمای هیئەت منطقه البروجیان تقسیم کردیه به چوار قسم، هەرقسمی به سێ،

سێ چوار دەکا دوازدە ﴿مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ﴾ لەو دوازدە مانگانە چواریان (حرمن) سێ یان متوالین: ذوالقعدە، ذوالحجە، محرم. یەکیان تەنیایە (رجب) لە بەینی جمادی ثانی و شعبان! من قدیم الایام لەو چوار مانگانە عەرەب تەرکی شەڕ و شۆڕیان کردیە، لێک امین بوین، لە حل و حرم! ﴿ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ ئەو تحریمە دینێ راستە، لە ابراهیم و اسماعیل وەرگیراوە. بەڵام من حیث اباحەی سائری مانگان، طبیعي، دین نەبووە!! وە اسلامیش (لا من حیث التخصیص) قبوڵی کرد. و مع هذا مشرکین عەرەب وەکی اسرائیلی یان بعضێ رۆاسایان، بە ارباب قبوڵ کرد، علی العمیاء تابعی قولیان ئەبوون، حتا لە اموری مخالفی دینیان مخالفی حەق و واقع، لەبەر ئەوە مناسبەی ئەو آیتە لەگەڵ جیراني، زۆر بە قووەتە! اما نظر بە حصری تحریم، بعضی اهلی تفسیر (ذلک)یان اشارە کردیە بۆ دوازدە ئایەتی شهور! وە (الذین) یان بە حساب تفسیر فەرمووە! فی الحقیقەت ئەگەر اغماضی لە (فیهن)بکەین لەگەڵ ﴿فَلاَ تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾ زۆر جوان دێ! زێرا مۆمن نەبێ، لە هەمو مانگان، لە گوناە، خۆی بپارێزێ! تفریقی شهور، لەو جهتە، لە دینی اسلام دانیە! وەهەروها دینی ابراهیم و اسماعیل! ئەگەر دوشمن لێمان گەڕێن، ئێمە (حورمەتي) هەمو مانگان ئەگرین! نەشەڕ ئەکەین، نە سیئات! ﴿وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ﴾ لەهەر شهرێدا بێ! ﴿كَآفَّةً﴾ هەمو ﴿كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً﴾ ئەو وەقتە هەتکی اشهرالحرم لە طرف ئێوەوە نابێ چونکی حربی ئێوە، ئەبێ بە دفاع! ئەگەر مقابلە نەکەن، مەحو ئەبنەوە! کف بە کف قباحەتی ئێوەی تیا نیە! علمای عەرەبی لە (کافة) چۆن استعمال ئەکرێ لە لسانی عەرەبیدا، نزاعیان هەیە، ئێمە (کوردین) حاجەتمان بەو هەرایە نیە!!! ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ ئێوە خۆتان بپارێزن، حدود مەشکێنن، بە مەیلی خۆتان حقایق مەگۆڕن! اموری ثابت و مقرر، مەکەنە تابعی فکری خۆتان! فکری خۆتان بکەنە تابعی حەق! ئەگەر وابن، خوا لەگەڵ ئێوەیە! معین و ناصر و دەستگیرتانە!

﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ﴾ له ستری حەق بزر کردني، ئەوانـە مشرکین! لەبەر شرکی خۆیان، تصرف له زمان ئەکەن! شهری حلال ئەکەن به حرام، شهری حرام ئەکەن به حلال! (ناوي) مانگان ئەگۆڕن، حتا ئەڵێن حجی (ابوبکر) له ذی القعده دا بووه، بۆ ساڵی دوایێ کەوتەوە اصلی ذی الحجه، که پێغەمبەر ئەو ساڵە حجی کرد لـه خطبەدا فـەرمووي: (زەمان دەوری دایەوە وەک هیئەتی خۆي، ئەوێ ڕۆژی که خوا خلقی سماوات و أرضی کرد)، یعنی شهور هاتەوە سەر تەرتیبی اصلي، ئەمەش چونکی موافقی مەیلیان بوو! (محرم) یان حەڵاڵ ئه کرد، نه یان ئەتواني سێ مانگ بەڕاحەتی بێ شەڕو تاڵان دانیشن، وه ئەو تحليل و تحریمەیان، نسبەت به الاهي خۆیان ئەدا، انه، ئەوه، امری وانه! ئەمه بوه زیادة فی زیادة ﴿يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ پێی زێده گومڕاه ئەبوون. ﴿يُحِلُّونَهُ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُ عَامًا لِّيُوَاطِؤُواْ﴾ موافقەت بکەن. ﴿عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ﴾ من حيث العدد! ئەوەش موافقه نیه! ﴿فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ اللَّهُ﴾ ئەمه چۆن ئەبێ به موافقه؟﴿زُيِّنَ لَهُمْ سُوءُ أَعْمَالِهِمْ﴾ لەبەر سۆی میولیان. شت که موافقی میل و ڕەغبەت بێ، به قبیح نانوێندرێ! بلا محاکمه قبوڵ ئەکرێ! ئەوێ ساڵێ (١٩٢٣) (میلادی) که له (بغدا) بووم له لیلی ماتەمی شیعەکان، طاز معروفیان لێ ئەدا، بێ طەپل و دۆڵ، ئەیان گوت مجتهد فەرمویەتي: ( ئەمساڵ دۆڵ حەرامه، لێی مه دە ن!) اما پار حەڵاڵ بوو! ﴿وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ ئەو نوعه کافرانه ی مقلدانه ی علی العمیاء - تابعی اقوالی ڕواسایان ئەبن. وەنوعه (نسیئ)ێکی تریشیان بووه، ئەویش لەگەڵ حاڵی جولەکان زۆر مناسبه! (نیسابوری) ئەفەرموێ: (حسب الخلاصه و الأجمال سنه ی قمری به یازده ڕۆژ و بیست و یەک سەعات و خمسی سعاتێ یانی دوازده دەقیقه کەمتره، له سنه ی شمسیه! کەبەقەدەر مانگێ کۆبۆوه، ساڵ ئەکەنه سێزده مانگ، تاکو وەکو جولەکەکان که اعیادیان له فصڵی بەهار و پایزدا ئەبێ، لەبەر ساڵی شمسی که ناگۆڕێ، حجی وانیش له فصڵی پایزدا ببێ، کەهەوا معتد له

وەختی گەیشتنی غلات و ثمارە، لەو وە قتەدا تجارەتیان زیاتر ئەبێ، لە ساڵەکانی تر اعتبار ناکەن بەم زیدەییە اما بۆ تطبیقی آیة نەختێ تکلیفی ئەوێ. ئەو تصرفاتە شتێ نامعقوڵە، گەرچی لای عوام خۆشە! ئەوەی حساب (راثەگرێ) بۆ اوقاتی عبادەت و مراسیمی دیني، یا لە سەر حسابی قمری بێ، یا لەسەر حسابی شمسي، تطبیق لە بەینیان ناکرێ! ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ داخلی ئەو عنوانە شریفە بوین ﴿مَا لَكُمْ﴾ چیە بۆ ئێوە؟ ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ اقدام کەن غاردەن بە خفت و نشاط بۆ جهاد ﴿اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ﴾ بە کاوە خۆ گران ئەڕۆن، گرانی خۆتان ئەدەنە ارض، مەیل بۆلای ارض ئەکەن، بعضێ بێ مەیل، گەلێ ناجوڵێتەوە. ئەوەی سوک و خێرا بڕوا، مەیلی سطحی زیادە بە عاستەم شوێنی ئەبێ لەڕێ، ئەوەی گران بڕوا، مەیلی مرکز ئەکا بۆ روو چوون ئە چێ، شوێنی ظاهر و قووڵ ئەداتە ارضي! لاشک ئەو گرانیە لە طرف مهاجرینی اولین و أنصار نیە! لە سورەتی (انفال) رابوورد ▪ وە لەو سورەتەش دادێ کەئەوانە حقا مؤمنن بێ قصور سەروماڵیان لە اوغری دین دادەنێن، اما ئەوانی تر وەک وان نین کەم و کورتیان لێ ظاهر ئەبێ! ئەفەرمون ئەو آیتە الی آخر السورة ئەوەی دائر بێ بە قتال، دەربارەی غزوی (تبوک) وارد بووە. (تبوک) جێێکە لە بەینی (مدینە) و (دمشق) نەختێ لە (دمشق) نێزیک ترە. گوایا جمعێ لە (نبطي) یانی رونی زەیتون فروش لە شام هاتینە (مدینە) خەبەریان داوە کە (رۆم) لە شکرێ زۆریان کۆ کردیتەوە ئەو عەرەبانە ی طرفی شام کە بوینە (دیان) لە گەڵیانن، مقدمة الجیشيیان گەیشتیتە (بلقاء). جەنابی رسالەت پە ناە تحریضی مسڵمانانی کردیە بۆ چونە پێشیان، وەبە خلافی عادەتی خۆی خەبەری داینی بە طرفی غزو، یعنی بۆ کێندەرێیە! یاخود (نصاراي) عەرەب بۆ (هیرقل)یان نوسی بوو ئەوپیاوەی دەعوای نبوەتی دەکرد، مردووە قەومی توشی قحط و غلابوین اموالیان نەماوە، ئەویش پیاوێکی گەورەی نارد ناو (قوباد)لەگەڵ چل هەزار کەس،

ئەو خەبەرە گەیشتە پێغەمبەر، لەسەر ئەوە پێغەمبەر امری دا بە نفیر. وە ڕوایەتێکی تریان هەیە بە (عبدالرحمن بن غنم) لای (سیوطي) و (سید رشید) معتبر نیە! ئەڵێن غزوی (تبوک) لە مانگی (رجب) دابووە پاش ئەوەی کە حضرەتی رەسولی کبریاء چووە (تبوک) کەس نەبووە شەڕی لەگەڵ بکا، گەڕایتەوە، حتا لە خەبەرێکی غیر مقبوڵ ئەڵێ: (ئەو سەفەرە لە سەر قسەی جوەکان بووە)!کە پێغەمبەر وصولی بۆوە آیتی (و ان کادو لیستفزونک من الارض ...الخ) کە لە سورەی (بنی اسرائیل)دایە نازل بوو !!! سبحان الله چۆن تصور ئەکرێ حضرەتی رسالەت پەناه لەسەر خەبەری کاروانیان، خەبەرێ بێ اسل، امردا بە نفیری عام و جەنابی حەق ئەو آیاتی بە شدەتە بنێرێ دەرحەق بە کاوە خۆ ڕۆیان، دونیا لەسەر متخلفینان بکاتە چەرمی چوێلکەکە، عتابی نبوی بکا لەسەر اذن دانی بعضێکیان؟ حاشا ثم حاشا! ئەوە نابێ !!! کەوابێ ئێمە ئەڵێین: (سابقاً جەنابی حەق امری دا بە قتالی اهلی کتاب بەو نوعە کە ذکری کردن وەسیدی انام لە فتحی مکە و طائف بۆوە، وەیهودی دەرکردبون لەولات، ما ڕوو بکاتە مسیحیان نێزێک لەمدینە، لەبەر ئەوە غزوی کرد بۆ سوریة خصوصاً گەلێ لە عشائری عەرەب لەو اطراف ببونە (دیان) تقویەی ڕۆمیان ئەکرد، لازم بو ئەوانە چارە بکرێن، چونکی توحیدی عەرەب بۆ تایدی دینی اسلام اهمی مهمات بوو. ئەو امری لای اکثری امة گران هات، وەقت نامساعد، مسڵمانەکان ماندوو لە حروبی سابقە زۆر تعبیان دیبوو، بێ ئازوقەیش سەربار! قسمێ لە کسالەت، قسمی لە رووی مصلحەت، قسمێ لە ضعفی ایمان و نفاق، ئەیانەویست ئەو غزوەیە نەکرێ!! گروهێ جزمیان بوو نەچن! اما مهاجرینی اولین و أنصاری بە حەق، أنصار بوون بەهەمە حال! مطیع و فەرمان بەردار، گورج و ئامادە، بە کمالی نشاط منتظری امری مرش الری مرش بوون! ﴿أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ حیاتی دني، پڕلە ئالام و اسقام و محن ﴿مِنَ الآخِرَةِ﴾ حیاتێ بە کمالی مسرەت و هناء.

حاشا ئەوەی بە حەق ایمانی بە آخرەت هەبێ، وا راضی نابێ! ترجیحی حیاتی دونیا بەسەر حیاتی آخرەت دا نادا! ﴿ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ بالفرض لەزەت بێ، بێ کدورەت بێ ﴿فِي الآخِرَةِ﴾ نظر بە متاعی حیاتی آخرەت، نیە! ﴿إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ هەر چەندێ بێ، هەر کەمە! نفسی حیاتی دونیا، هیچ نییە! بۆیە ئەفەرموێ (متاع)، نسبەتی متناهی لەگەڵ غیرە متناهی ئەبێ بێ؟ ﴿إِلاَّ تَنفِرُواْ﴾ بە خفەتی روح نەچن بۆ غەزا ﴿يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ محقرو مهان ئەبن، ئەبنە ژێر چەپەلۆک. ﴿وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ خوا نوری خۆی اتمام ئەکا رەسولی خۆی نصرەت ئەدا، لە بدل ئێوە قەومێ پەیا ئەکا، بە دڵ و گیان خدمەت بکا! ئەوْ قەومەکێن؟ خوا خۆی ئەیزانێ، نەبووە، تا بزانین کێ بوون! یەکێ ئەڵێ (فارس)، یەکێ ئەڵێ (یمني)، ئەمن ئەڵێم (کورد)!، بێ وجە و بێ دەلیل، وەفهمی معنا پەکی لەسەرتعینی ئەو قەومە نەکەوتووە! ﴿وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئًا﴾ ادنی ضرەرێ بە پێغەمبەر ناگەێنن، پێتان ناکرێ! ﴿ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ ئەتوانێ رەسولی خۆی حفظ بکا وە نصرەتی بدا. ﴿إِلاَّ تَنصُرُوهُ﴾ ئێستا هیچ زەرەري نیە! ﴿فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ﴾ سابقاً، کەي؟ ﴿إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەو وەقتەی کافرەکان مجبوریان کرد لە مەفتەنی خۆی بڕوا، ئەمە دەرکردن نیە؟ ئەدی چیە؟ ﴿ثَانِيَ اثْنَيْنِ﴾ یەک لە دووان، یا دوەمین لە دووان! اما دووەمینێکە کە (الله) ثالثهما! ئەوو دووانە، یەکی حضرەتی رەسولی اکرم، یەکێ صدیقی اکبر! ﴿إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ﴾ لەو وەقتە کە هەر دووکیان لەناو ئەشکەوت بوون بێ دەسەڵات بێ اسباب و امداد و لەشکر. ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ﴾ ابي بکر صدیق یاری غار رەفیقی وەفادار! ﴿لاَ تَحْزَنْ﴾ عاجز و غەمگین مەبە! نافەرموێ (لا تخف)! ﴿إِنَّ اللّهَ مَعَنَا﴾ خوا لەگەڵ ئێمەیە، ئاگادارمانە، حفظمان ئەکا! لێرە بعضێ خەریکی تفضیلی ئەم (معنا) یەن، لەسەر (معکما)ی (موسی و هارون)! حقاً نابە جایە! گەلێ (مەلا) ماخولیای تفضیلی متبوع لە میشکی داین! ﴿فَأَنزَلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ﴾

لەسەر رەفیقی رەسول الله! دڵی ساکن بوو، إضطرابی نەما، حزنی زائل بوو، کەوابێ ضمیری (علیه) راجعی (صاحب). ﴿وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا﴾ پێغەمبەری بە جنودێ زۆر نصرەتدا. گەرچی ممکنە (ضمیر) بۆ صاحب بێ، وەتایدی ئەو، تایدی رسول‌اللەیە! اما ظاهراً، بۆ رسول الله، جوانترە! و تفکیکی ضمیر قەی ناکا، چونکی ظاهرە، جێی التباس نیە، معانە، لای حقیری قەی ئەکا! ئەو مفسرانە ی کەئەفەرمون مقصد لەم (جنود)ە ئەو جنودەیە کەلە (بدر) و (احزاب) و (حنین) بۆ نصرەتی رسول اللەی ناردبوون لەبەر (لم تروها)ی خۆشترە! چونکی مسڵمانان لەو وقائعە حاضر بوون، اما لێرە غیری خۆیان کەس نەبوو، تابڵێین ئەو جنودەیان نەدیت، گەرچی (مناطقە) ئەفەرمون: ( سالبا لە قضا نا خوازێ وجودی موضوع)، اما نەدیتنیان لەگەڵ بوونیان لەو مقامە انسبە!! ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُواْ السُّفْلَى﴾ ئەوەی خۆی ژێرکەوت، قسەشی ژێر ئەکەوێ لچی شۆڕ ئەبێ، ﴿وَكَلِمَةُ اللّهِ هِيَ الْعُلْيَا﴾ امری خوای هەر سەر کەوتووە، هەر امری خوای بڵندە و بڵندترە، ئەمەبێ جعلە مسبوق نیە بە عدم، شانی الاهیە! لەو مقامە علمای (سني) کەمێ لە علویەتی مقامی صدیقی اکبر بەیان ئەکەن. علمای (رافضي) لە کلمەی وان قینیان هەڵئەستێ، بە نەوعێ کلمەیان لێ تێک ئەچێ! ئەو صحبەتە علیایە ئەهێننە رێزەی صحبەتێ غایەت دنی و استشهاد بە شعرێ زۆر نامعقولانە ئەکەن، من ئەدەب ئەکەم مضمونیش ذکر بکەم! صاحبی (تحفەی اثنا عشریە)وەدوای ئەو (سیدی آلوسی)لە تفسیری (روح المعانی) وە (سید رشید)، دادیان داوە کلمە ی (رافضیانیان) نوشوست پێ داوە - شکرالله مسعاهم منیش ئەڵێم: (مسالەی تفاضل زەهرێ بوو کەوتە ناو اسلام اولاً بە سهل زاندرا، دوایێ تاثیری سوءی معلوم بوو! پێغەمبەر و صاحبی لە غار لە ترسی کفار خۆیان بزرکردبوو، ئەوان لەو حاڵەتەدا، بەس چاوە نۆری امدادیان بووە لە طرف خوا نجاتیان بدا! لله الحمد، لە چەنگ کفاران نجاتیان بوو،! بەڵام

لەزوبانی «رافضیان» نجاتیان نەبوو! وە لەوەقتی نزولی ئەم آیتە جەنابی رسالەت خەریكی تفسیری عام بوو، مسلّمانان ناتەوان و پەرێشان، وەقت نامساعد، دوشمن قەوی، رێ دوور، وە حضرتی باری متعاقباً بە شدەت آیاتی دەفعە نارد، ئایا ئەو هەنگامە جێی تفاضلە لە بەبینی ابوبكر وعلی رافضی نفیری عام ئەكەنە سەر ابوبكری؟ ئایا گوێ یان لێ نیە رسول اللە پێێ ئەڵێ «ان اللە معنا»؟ نە یان ئەزانی خوا تایدیی (ابوبكر) ی ئەكا بە دوو (سیدی علوی لەبینی زهراء) زەهری ماریان پێ ئەچێژن؟ نازانی عالەمی اسلامیەت ئەمڕۆ لەچ حاڵدایە؟ بۆ نجاتی چی پێ ئەوێ؟ حماقەت نیە عالەمی اسلامی لەو زلـلەتە دابێ، علمایان بەشەڕبێن لەسەر تفاضل لەبەینی ابوبكر و علي؟ ئایا خوا استبدالی مسلّمانانی بەوانە ئەكرد كە نخبەی فارسن؟ ئەوانیش ئەوها نصرەتی دینیان ئەدا؟ دینیێ بێ ملك و خلافەت! رواسایانی جەنگ ئەكەن لەسەر خلافەتی ابوبكر و علی !!! سبحان اللە !! هەزار شكر كە پێغەمبەرێك دوای رسولی اكرم نەهات! خوا ئەزانێ حیامان لە بەنی اسرائیلی زیاتر ئەچوو! ئەگەر ئەوانە بەراستی مسلّمانن، تێ كۆشن بۆ اعلای كلمة اللە سعی بكەن، ئەگەر اصحابی رسول اللە قصوریان بووە، ئەوان بابێ قصور بن! بێ غل و غەش اتحاد بكەن! وەبلێن «تِلْكَ اُمَّة قَدْ خَلَتْ لَها ما كَسَبَتْ وَ لَكُمْ ماكَسَبْتُمْ وَ لا تَسْئَلُونَ عَمّا كانوُا يَعْملونَ» ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بە حكمت بە اختراعی ئالاتی عصریة بە علمێی نافع، اعادە ی عزەتی اسلامەتی بكەنەوە.

الاهي! ئەمڕۆش دین زۆر احتیاجی هەیە بە نصرەت و امدادی تۆ! مددێ! یا عزیز و یا حكیم! ﴿انْفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالاً﴾ جمعی خفیف و ثقیل، سوك و گران بە نشاط بن! بڕۆن بۆ حەرب! هیچ عوزر نیە بۆ نەچوون! الا ئەوەی دوای دێ! ﴿وَجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ سعی بكەن جهدی خۆتان صرف بكەن بە بذلی ماڵ و نفس ﴿ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ بۆ دونیا و قیامەت ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەی مەلاینە! ئێوەش بە سیە چیدی نەفرەت

مەهاوێنە ناو مسڵمانان! وەقتی ئەما! اتحاد کەن! اتحادیان پێ بکەن! لە رێی خوا، بە علم، بە مال، لە روح، سعی بکەن! اتفاقی امة ببێ لە دونیا ! لە قیامەت بۆ ئێوە خێرە! راتبە تان لە قیس ناچێ! ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا﴾ ئەوەی بۆت بانگ ئەکردن ئەگەر ماڵی نێزیک و بەردەستبا ﴿وَسَفَرًا قَاصِدًا﴾ موعتەدیل خۆشي بێ تعب و ماندو بوون یا ﴿لاَّتَّبَعُوكَ﴾ بە کەماڵی نشاط! چۆن ئێمە لە خدمەت پێغەمبەر نەچین؟ چۆن؟ بە خوا ناتوانم لێی دوور کەومەوە! رووحم ئەچێ تا دێتەوە، سەرم لە رێگای پێیەتي! ﴿وَلَـكِن بَعُدَتْ عَلَيهِمُ الشُّقَّةُ﴾ رێیان لە سەر دووربوو، بە مشقەت و تعب قطع ئەکرا و امێدی ماڵیان نەبوو. ﴿وَسَيَحْلِفُونَ بِاللّهِ﴾ سوێند ئەخۆن بە تاکید و قووەت، یاخود پاشی گەڕانەوەتان ﴿لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ﴾ ئەگەر بمان توانیبا لەگەڵ ئێوە ئەچوینە دەر بۆ شەڕ. ﴿يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ﴾ خۆیان بە هیلاک ئەبەن، سوێندی بە درۆیان لێ سپی ئەبێتەوە، بێ حورمەت ئەبن. ﴿وَاللّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ درۆی ئەکەن، ئەتوانن، تەوانان! بەس لەبەربێ ایمانی اطاعه ناکەن! ﴿عَفَا اللّهُ عَنكَ﴾ خوا لێت خۆشبێ، ﴿ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ بۆ اذنت دان؟ انە بڕوات پێکردن کە عوزریان هەیە، بۆ نەهاتن! نەدەبا اذنیان دەي! ﴿حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ﴾ تا عیان بێ لێت، بێ وحي! ﴿الَّذِينَ صَدَقُواْ﴾ لە اعتذاردا. ﴿وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ﴾ خوا عافویانکا، مەلایانی نظار، باز نزاعیان بەرپا کرد. رەسولی خوای معصومن؟ یاخود غیرە معصومن؟ عفو مقابلی گوناهە! کەوابێ پێغەمبەر گوناهی کردیە! بەڵێ گوناهی کردیە! اما چیە؟ دەستی کەری وەیسی بڕیە؟ ئەوە نیە (لم اذنت لهم)؟ صبری نەگرتیە، زوو اذنی داین! معانە ئەوانە، هەر نەدەچوون! سودو زیان بەس عائدی علمی رسالەتە قبل‌الأذن بە راستگۆو دروزنان! ئەووەقت نە یزانی، دوایێ زاناندي! بەڵکو وەکی لە ئایە تی آتیە دەر ئەکەوێ، بونیان لەناو لەشکری پێغەمبەر، زەرەر بوو! لام وایە (ابومسلم) لەو اذنە چگوناهی نەدیوە! بۆیە ئەفەرموێ: ( احتمالی هەیە بعضێک لەوانە اذنی خروجیان

طلب کردبێ. بچن بۆغەزا، رەسولی اکرم اذنی دابێ، مع انه خروجی ئەوانە لەگەڵ مسڵمانان صواب نەبوو، چونکی ئەوانە جاسوسی منافقان بوون، فتنە یان هەڵدە ئایساند غوائلیان بەرپا ئەکرد).

(قاضی عبدالجبار) لەخۆیان ئەفەرموێ (ئەووە دوورە لە مقام)! لکن فەرمودەی ابا مسلمی لەگەڵ آیتی ﴿لَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَن يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ زۆر موافقە! حقیقە ئەوەی ایمانی هەبێ، معنای چی طلبی اذن دەکا بۆ جهاد؟ مەعانە امر بە نفیر درایە! ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ﴾ئەو استئذانە لەمانە شاهدێ عیانە، کە ئەوانە منافق بون! درۆیان کردیە، یاخود مقصدیان فتنە بووە! ﴿إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ﴾ بۆخروج. ﴿الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ ئێوە ئەگەر موسوڵمانی صاغن، سمعا و طاعە، لەگەڵ یاران روو بکەنە صوبی عدو، استئذانی چی پێ ئەوێ؟ ﴿وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیان بەشکە، منافقن. ﴿فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾ متحیرن، (کانه شاک فی انه شاک!) ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً﴾ چەند موافقە! ئەگەر راستیان کرد بامسڵمان بان، خۆیان حاضر ئەکرد! لەپاشن ئەوەی اذنت دان بۆ چۆن، هیچ تدارکاتیان نەکرد، هەرچەند ئەبا بە تالوکە بچن، تا ئیش لە پێغەمبەر تێک دەن ﴿وَلَٰكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ﴾ عوقی کردن لە خروج، چونکی زەرەری هەبوو. ﴿وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾ خوا دڵی گۆرین ترسان ئاشکرا بن آیة لە حەقیان نازل بێ ئابرویان بچێ، دانیشتن لەگەڵ دانیشتوەکان. ئەو (قیل)قیلێ تکوینیە، ظاهر وایە ئەو منافقانە تدبیریان کردبێ بعضێ بچن بعضێ بمێنن هەردو جهەتیش بۆ لەشکر، زۆر بوون! ئەوانە ی لە اولی طالب بوون بۆ خروجی مع المسلمین، نەچوون، لەگەڵ ئەوانی‌تر، دانیشتن! ﴿لَوْ خَرَجُوا فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا﴾ خبل، دەماغ متاثربوونە شبهی جنونە! ئەوەی پێتی مصاب بێ، کە ڵکی رای و حرب و ترتیب و إنتظامی، نامێنی!﴿ وَلَأَوْضَعُوا خِلَالَكُمْ ﴾ ناخۆشیان ئەهاویشتە بەینتان، بەحەذاقەت و شرعەتێوا، کەحسی

پێنەكەن! ﴿يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ﴾ مقصديان افسادی ئێوە بوو. ﴿وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ﴾ باش گوێیان ئەدەنێ تصديقيان ئەكەن، بەوەسوەسەیان متاثر دەبن، ئەوانەش كەمێ دەماغ خفيفن، بۆيە فەرموي: (مازادكم الا خبالا) ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ افسادی خۆبە خۆی مقابلی اجنبي، حقا ظلمە اما ظلم! ﴿لَقَدِ ابْتَغَوُاْ الْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ﴾ خەبەرتان هەيە؟ خەبەر هەيە سابقا چيان كرديە! ﴿وَقَلَّبُواْ لَكَ﴾. بەس لەبەر تو! ﴿الأُمُورَ﴾ معانە صلاحی عام بوو، خێری وانی تيا بوو، شەڕيان بۆ نەدەبوو! دەواميان بوو لە سە ر ئيش و كار تێك دانت، قصوريان نەدەكرد! ﴿حَتَّى جَاء الْحَقُّ﴾ رغم مساعيهم! ﴿وَظَهَرَ أَمْرُ اللّهِ﴾ دينی خوا، ﴿وَهُمْ كَارِهُونَ﴾ بۆيە حەضرتی ڕسالەت حەزی ئەكرد گەورە گەورەكان بن بێ نفاق، عوام تابعن، رواساء حسابن! نابينن چيان كرد؟ چەند ئيشيان لە پێغەمبەری وەرگێڕا! ئەگەر امدادی الاهی نەبا، بالكليە مانع ئەبوون لەظهوری دين و هاتنی حەق! كەوابێ محض لە لطفی خوای بزانە كەئەوانە ﷺ منع كرد لەهاتن. ﴿وَمِنْهُم﴾ لە منافقانە ﴿مَّن يَقُولُ ائْذَن لِّي﴾بۆنەهاتن، ﴿وَلاَ تَفْتِنِّي﴾ بە فسادم مەبە! ئەفەرمون حەضرەتی ڕەسول بە (جدی بن قيس)ی فەرموو: (چدەڵێی لە مجاهدی بنی اصفر؟) ووتی: (ئەترسم، ئەگەر ژنانی بنی اصفر ببينم، بەفتنە بچم، يعنی توشی زنا بم! اذنم دە، با توشی ئەو بێ دينيە نەبم!)، ئەو قسە زۆر منافقانە يە! پڕە لە استهزاء! تاملی لێ بكەن! چی ووتيە ئەو منافقە؟ ﴿أَلاَ فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُواْ﴾ كەوتونە ناو فتنە، خۆيان غريقن لە ناو فتنە و فسادوە افسادی خەڵك ئەكە ن. ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾ بە مناسبەی كفرو اعمالی خراپيان! كو احاطەی داون، جهنميش ئەوها احاطەی داون! ﴿إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ﴾ سەركەوتن و غنيمەت مثلا! ﴿وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ﴾ بەلاێ وەك شكستي (احد). ﴿يَقُولُواْ قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِن قَبْلُ﴾ خۆمان گرت، حذرمان كرد تووشی ئەو مصيبەتە نەبوين ﴿ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمْ فَرِحُونَ﴾ ئەوە حاڵيانە، (لا يتغير)ە، لەو سەفەرەش هەروا ئەبوون! ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا

كَتَبَ اللّٰهُ لَنَا﴾ ئەوەی خوا وەعدەی بەئێمە داوە بۆی نوسیوین، هەرپێمان ئەگات، سەرئەکەوین، اموالی (بنی الاصفر) لەگەڵ نیسائیان تقسیم ئەکەین، ئەمڕۆ نا سبەی! ﴿هُوَ مَوْلاَنَا﴾ مدبری اموری ئیمەیە، ناصرمانە، سیدمانە، گەورەمانە. ﴿وَعَلَى اللّٰهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ئەگەر تعقیدات و تاخراتی بوو، دڵیان سست نەبێ! ﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلاَّ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ﴾ ئایا إنتظاری ئەکەن، بۆ ئیمە؟ لەحەق ئێمە؟ الا یەک لە دووشت! کە کولێکیان زۆر باشن!

نصرەت بۆ جەماعت، شهادەت بۆافرادی مقتول! ﴿وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ اللّٰهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِ﴾ بەنوعێ خۆی ئەیزانێ کە چۆن لەکۆڵتان ئەکاتەوە. ﴿أَوْ بِأَيْدِينَا﴾ یا امر ئەدا، ئێمە بتانکوژین، یاخود بالمقابلە إنتظاری (احدی الاسوءین) ئەکەین عذابی الاهی بۆئەوانە ی ئەمرن، وە عەذابێ بەدەستی ئێمە لەبەر دەستمان ڕەزیل ئەبن بە بەسەر کەوتنمان لە سەرتان بە قوەی بازومان! لە عذابی حسددا بسوتێن! ﴿فَتَرَبَّصُواْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ﴾ بزانین عاقبەت چۆن ئەبێ؟(و العاقبە للمتقین) مشهور بوو وەقتێ بعضە قوادی غرب ئەیان وت: (دوو کلمە هەیە قوادی عساکری«عثماني» ترغیبی نفراتی پێ ئەدەن بۆجهاد ئەڵێن:«بڕۆن بۆ حەرب، ئەگەر مان غازین، ئەگەر نەمان شهیدن!» ئەگەر وەک ئەو دوو کلمەیە شتی تریشیان هەبایە ئەبونە جهانگیر! ناشکری نەبێ ئەمڕۆ قیمەتی ئەو دوو کلمەش نەما وە دەوڵەتی عثمانیش انقراضی بوو! ﴿قُلْ أَنفِقُواْ﴾ هەرچی هەوەستان هێنا، ﴿طَوْعًا أَوْ كَرْهًا﴾ بەهەر نوعی بێ، بە اختیاری خۆتان بێ پێگوتن، یا بە تکلیف! ﴿لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ﴾ لە طرف خوا بێ اجر و ثواب و ثمرەیە! ﴿إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾ وابوین! وائەبن! لە طاعەت، دەرچووین! اساسی ایمانە، نیتانە! ﴿وَمَا مَنَعَهُمْ﴾ مانعی قبوڵ لە طرف خوا نیە، لە جهەت خۆیانە! ﴿أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَاتُهُمْ﴾ یعنی هیچ شت ئەوانی منع نەکردیە لە قبوڵی نفقاتیان ﴿إِلاَّ أَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّٰهِ وَبِرَسُولِهِ﴾ کە وابێ انفاقیان

لە ڕەێی خوا نیە، تا خوا قبولّی بکا ﴿ وَلاَ يأْتُونَ الصَّلاَةَ﴾ کە جهەتی جامعە لە بەینی مسلّمانان، خاصە ئەو وەقت. ﴿ إِلاَّ وَهُمْ كُسَالَى﴾ بۆ عبادەتی خوا، بێ نشاطن، بۆ نوێژ نایەن الا بە سستی نەبێ، بۆ حربی فی سبیل اللە چۆن ئەچن؟ ﴿ وَلاَ ينفِقُونَ إِلاَّ وَهُمْ كَارِهُونَ﴾ بەدڵ. حتا لەوانە ی اختیاریش‌دا، بە دڵ پێیان خۆش نیە، با بۆ نفعی خۆشیان بی کەن، دڵیان لە دوایان بەرنابێ بە ضایعاتی ئەزانن. ﴿ فَلاَ تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُمْ﴾ پێی مەسرور مەبە! بەزینەتی مەژمێرە کەڵکی ئێمە ناگرێ! وا مەزانە ئەمە لطفە لە طرف خوا! حاشا!﴿ إِنَّمَا يرِيدُ اللّهُ لِيعَذِّبَهُم بِهَا﴾ بە اموال و اولاد! ﴿ فِي الْحَياةِ الدُّنْيا﴾ ماڵیان ئەبێتە طوقی ملیان، اولادیشیان چنصرەتی وانیان پێ نادرێ، ئەوی مقصودیانە پێیان پێک نایێ! ﴿ وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ﴾ ڕوحیان دەر ئەچێ ﴿ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ بەکافری ئەمرن، ماڵ و منداڵیان ئەبێ بە داغی سەر دڵیان.﴿ وَيحْلِفُونَ بِاللّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ﴾ سوێند ئەخۆن، ئەوان لەئەوەن، یعنی مسڵمانی صاغ و پاکن! ﴿ وَمَا هُم مِّنكُمْ﴾ لە ئێوە نین! ﴿ وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يفْرَقُونَ﴾ ئەترسێن. لەترسان بۆ حفظی خۆیان، سەرزارەکی کلمەی ایمان ئەڵێن! ئەوەندەتان لێ‌ئەترسن ﴿ لَوْ يجِدُونَ مَلْجَأً﴾ پشت و پەنای پیاوێ گەورە! ﴿ أَوْ مَغَارَاتٍ﴾ ئەشکەوتان ﴿ أَوْ مُدَّخَلاً﴾ ژێر زمین لە غم. ﴿ لَّوَلَّوْاْ إِلَيهِ﴾ ڕویان تێ ئەکرد ﴿ وَهُمْ يجْمَحُونَ﴾ بە سرعەت و قرەپەستێ، بۆی ئەچوون. (سیدرشید) (ملجا)ی بە مکانێ کە خائف بۆی ئەچێ، لە حصن و قلعە و جزیرەی بحر و قمەی چیا، تفسیر کردووە. لام وایە تفسیری بە (مکان) بۆ خاطری عطفی (مغارات و مدخل). بەڵام نظر بە عطفی بە (او)، تفسیری ئێمە باشترە و لو مجازیش بێ! ﴿ وَمِنْهُم مَّن يلْمِزُكَ﴾ ئەتکەنێ، بەزوبان طعنەت لێدەدا ﴿ فِي الصَّدَقَاتِ﴾ لە تقسیمی زەکات عیبت لێ ئەگرێ. دیارە ئەوانە مردەی ماڵن! ﴿ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ﴾ تەمام، تقسیمی عادلانە یە! ﴿ وَإِن لَّمْ يعْطَوْاْ مِنهَا إِذَا هُمْ يسْخَطُونَ﴾ دەرحال آناً ڕقیان ئەبێتەوە، ئەوەیی ئەیڵێن ئەیڵێن. ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوْاْ مَا آتَاهُمُ اللّهُ

وَرَسُولُهُ﴾ ئەوەی خوا داینێ لە اموالی بێ ژمار و اولاد، ئەوەی پێغەمبەر پێی عطا کردینە لە غنائم و لە صدقات ﴿وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ﴾ (کما هو شان المؤمنین) ﴿سَيُؤْتِينَا اللّهُ مِن فَضْلِهِ﴾ لە غنائم، لە کەسابەت و تجارەت، مواهبی الاهي، هەتا مردن! ﴿وَرَسُولُهُ﴾ لە صدقات لە غنائم، ئەمجار نا، جاریتر! ﴿إِنَّا إِلَى اللّهِ رَاغِبُونَ﴾ ئێمە بۆ ماڵی دونیا ایمانمان نەهینایە! بۆ پاتاڵ شبەڕ ناکەین! چاومان لە چڵکی دەستی خەڵکی نیە! رغب و شوق و میل و محبتمان، بۆ لای خوایە! رەضامەندی ئەومان کافیە! بەڵام ئەم منافقانە، نەراضی ئەبن، نەوا ئەڵێن بە ڕاستی! بۆیە جەوابی (لو)، طی کرا! ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ﴾ بە حصر، بۆ غیری وانە، نابێ! ئێوەش لەو اصنافانە نین! ﴿ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ﴾ امامی (شافعی) ئەفەرموێ: (فقر و مسکین، اذا اجتمعا افترقا، واذا افترقا اجتمعا)! یعنی ئەگەر وێکڕا ذکرکرێن، فەرقیان هەیە، ئەگەر لێک جودا ذکر کرێن لە عبارەتدا، فقیر تەنها ذکر کرێ معنای شاملی مسکینە، ئەگەر مسکین تەنها ذکر کرێ معنای شاملی فقیرە! لێرە وێکرا ذکر کراین، فەرقێکی ئەکەن! مثلا (مسکیني) شتێکی هەیە اما تەواو گوزرانی پێ ناکا، (فقیر) ئەوەندەشی نیە! ﴿وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا﴾ ئەوانە ی ماموری گرد کردنەوە و حفظی زکاتن، با فقیر و مسکینیش نەبن! ﴿وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ انواعن، کە نفعی هەبێ بۆ دین و دڵ گۆڕین بە ماڵ پێدان! بەڵێ ئەمە زۆر باشە، ماڵ بۆ گەلێ کەس لە برهان و حججی قاطعە بە قووەت ترە! (صفوانی بن امیە) ئەڵێ: (پێغەمبەر عطای پێ ئەدام، لە هەمووکەسم ڕق پترلێ ئەبۆوە، دەوامی فەرموو لەسەر عطا، تاکو ئەوم لە هەمو کەس خۆشتر ئەوێ (هذا رجل ادعی النبوة و اظهر المعجزة و کل من کان کذالک فهو صادق فهذا صادق) ناچێتە گوێچکی (صفوانی)! لە خصوصی (مؤلفة القلوب) مسڵمان زۆر بە تقصیرین! گەلێ کەس مسڵمان ئەبن بە صادقی، لە ناو مسڵمانان زۆر بە ڕەزیلی ئەژێن، ئەمەش موجبی نەفرەتە! بە لێ سەوادی أعظم حاضرە بە ماڵ بەسەر بە عرض بۆ

دەجالەکان! چی بەسەر مؤلفة القلوبە؟ ﴿فِي الرِّقَابِ﴾ بۆ عبد ئازاد کردن، زاتاً ئازادی لەنظر شارع لە هەموشت اهمترە ﴿وَالْغَارِمِينَ﴾ ئەوانەی قەرزدار بوین بۆ اصلاحی ذات البين یا بۆ مصارفی عائلە، بێ ارتکابی گوناه! باوڕ ناکەم [redacted] قەڕن لە مەوپێش متصرفی (بیت المال)ە بە ئەوانەی پولێ دابێ! تجار بە بەر قەرضی ئەگرن، زۆر باشە! خوا خێریان بنوسێ! ﴿وَفِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ زۆریان قسەلە ڕێی خوای کردیە! جمهور لای غزایە، ئەوانە ی بێ معاش، یعنی (عونە)! ﴿وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ سیاحێ نافع بۆ امة! ﴿فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ﴾ صرف لە طرف خوای داندراوە، لە خۆمەوە نیە، ناتوانم خلافی بکەم. ﴿وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ بە مقتضای علم و حکمەتی وای داناوە.

(سيد رشيد) (رحمة الله عليە) لە بیانی اصناف تفصیلاتێ زۆر زۆر جوانی هەیە کأنە گونگرەی قووەتی اسلامیەتە، مسڵمانان بۆ ادای زەکات گەیاندنیان بە مستحقان طلبی تحقیقی أصناف ئەکەن، بەڵام من زۆر بێ هەوەسم نوسی ئەم مبحثە! چونکی لە مێژە زەکات تێک دراوە، ئێستا ناویشی نەماوە، ئەوەی بە حەق مستحقە محروم کراوە والسلام!

﴿وَمِنْهُمُ﴾ لەوانە ﴿الَّذِينَ﴾ دیارە جماعەتێکن! ﴿يُؤْذُونَ النَّبِيَّ﴾ بە قسەی ناشیرین (الم) بە دڵی نبی خوا ئەگەیێنن ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ﴾ نبی! ﴿أُذُنٌ﴾ گوێیە، خۆش باوڕە، گوێ لە مستە، ئەوەی لە حەقی ئەڵێن، ئەگەر پێی گەیشتەوە سوێندی بۆ ئەخۆین، بروا ئەکا، چمان پێ ناڵێ! ظاهرا کلمەی خفیفە، اما معناً زۆر گرانە — العیاذ باللە- رسالەت پەناە بە سستی دەماغی و بساطەت ئەذیەت ئەدەن! لە سەر ئەوەش تەماشاکە! جەوابێ چەند بە ادب و بێ ئەزیەت ئەفەرموێ! —سبحان اللە- ادەب و سلوکی قرآن چەند غریبە! من ئەمانم لا زێترە، لە نکاتی بلاغە! ﴿قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ﴾ قسەتان ئەبێم، معذرەت و سوێندتان گوێ لێ ڕائەگرم، لێتان ئەبورم، من (اذن)ی خێرم بۆ ئێوە، بەڵکو إنصاف ئەکەن لەم نفاقە دەست هەڵ ئەگرن، مقابلی لێ بواردن من شەرمەزاری ئەهێننە سەر خۆتان، چیتر هذیان ناکەن.

﴿يؤمنُ﴾ ئەو (اذن)ە. ﴿بِاللّهِ﴾ باوڕی هەیە بە خوا، خوا دڵی پاکە لە غەش. ﴿وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بڕوای بە مسڵمانان ئەکات، ئەزانی ئەوەی ئەڵێن ولە ئێوەی نقل ئەکەن، ڕاستە! وە ئەتوانێ حیاتان و حیاتتان ببا! ﴿وَرَحْمَةٌ﴾ ئەو(نبي)یە ڕەحمەتە! ﴿لِّلَّذِينَ آمَنُواْ مِنكُمْ﴾ لەبەروان لێتان ئەگەڕێ، ڕەحم بەوان ئەکا، حەزناکا، بە اهانەو ابادەی ئێوە، دڵیان مکدر بکا! ﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ اللّهِ﴾ لە حاڵی حیاتی و بعد الممات، بەڵکو ئەو خراپترە! ﴿لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لە کلی وەقت و آن، هەزار هەزار لعنەتیان لێبێ الی انقراض الزمان! ﴿يَحْلِفُونَ بِاللّهِ لَكُمْ﴾ ایها المؤمنون! سوێندتان بۆئەخۆن ﴿لِيُرْضُوكُمْ﴾ ئێوە ڕاضی کەن، لێیان ئازموردە نەبن، بە موافقیان بزانی! ﴿وَاللّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ لەو حاڵە نفاقی خۆیان دەرئەخەن، ڕضامەندی مسڵمانان تابعی ڕضای خوا و ڕەسولی خوایە! مبالات بە پێغەمبەر نەکەن، سوێند بۆ مسڵمانان بخۆن، زۆر سەیرە! ئایا مسڵمانەکانیش بە (أذن) تێی ئەگەن؟ ﴿أَلَمْ يَعْلَمُواْ﴾ ئایا نە یانزانیوە؟ ﴿أَنَّهُ مَن يُحَادِدِ اللّهَ وَرَسُولَهُ﴾ لاگیری لابەلای خواو ڕەسولی خوا بکا ﴿فَأَنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ﴾ کانە خاصە و مڵکی خۆیەتی. ﴿خَالِدًا فِيهَا﴾ ناچێتەدەر ﴿ذَلِكَ الْخِزْيُ الْعَظِيمُ﴾ ذللەتی گەورەیە. ﴿يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ﴾ وائەنوێنن لە ڕووی استهزاوە ئەڵێن ئامان نەکەن ناوی ئەو زاتە بە خراپە بێنن خوا خەبەر داری ئەکا ﴿أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ﴾ لە سەروان، یعنی لە حەق وان، یا لە سەر مسڵمانان. ﴿تُنَبِّئُهُمْ﴾ منافقان! ﴿بِمَا فِي قُلُوبِهِم﴾ ای منافقان! ﴿قُلِ اسْتَهْزِؤُواْ﴾ صریحە کە ئەو حذرە لە قەشمەریەوە بووە. وەکی (ابومسلم) لە جوابی اشکالا فەرمویەتی: (ئەگەر ئەمانە منافقن، ئەو حذرەیان چۆن نەبی؟) حقیقة جوابی ئەو لەجوابی جمهور باشترە، وەکی عەرضمان کردن، صریحە ئەو جملەیە! ﴿إِنَّ اللّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ﴾ بەڕاستی دێتەجێی! ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ﴾ بعد الإخراج، بۆ ئەو قەشمەریانە ئەکەن دەربارەی ڕەسولی خوا، قسەی مۆلم ئەبێژن؟ ﴿لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ

وَنَلْعَبُ﴾ وخۆ بە خۆی الفەت صحبەتمان ئەکرد، چوبوینە ناو قسان ﴿قُلْ أَبِاللّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ﴾ بەو قسانە، بەو قەشمەریانە. کفرتان ئاشکرا کرد بوو﴿لاَ تَعْتَذِرُواْ﴾ براوە. ﴿قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾اعلانی کفرتان کرد، لە پاش ایمانێ صوری، ایمانیشیان وەک حذریان، گەپە! ﴿إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ﴾ توبە بکەن وە ایمانێ صحیح بێنن، خوا عەفویان ئەکا. ﴿نُعَذِّبْ طَآئِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ﴾ دەوام ئەکەن لەسەر کفر، وایان فەرمووە! حقیقةً قسە یێ حقە، بەلأم لێرە زۆر مناسب نیە! وە سؤال و اشکالی سلطان العلماء (عز بن عبدالسلام)ی لە سەر ناچێ! عذابی طائفەیێ بۆچی ئەبێتە جزای عفوی طائفەیێ؟ چملازمەیان لە بەینا هەیە؟ (ابن حجر) لە (فتاوای حدیثیە)، (سیدی آلوسی)، (سید رشید) چی وایان دەرنە خستوە کە دڵ لە سەری ڕاوەستێ، وبالخاصە عذاب حمل کرێتە سەر عذابی آخرەت.

من لام وایە ئەم عەذابە عذابێ دونیاییە، طائفەێ لەواندا نوعاً ما ادبیان نواندووە، طائفەیێکیی تر لە استهزا و لعب بە خواو آیاتی و ڕەسولی، خوضیان کردیە، بە گوستاخی و لاابالی، هذیانیان کردیە! هەردوو طائفەش منافق بوون. جەنابی حەق ئەفەرموێ: (ئەو طائفەی کە خوضیان نە کردوە، ئەگەر لێیان خۆش ببم، طائفەیێکی تر عذاب ئەدەم، لە جزای عفوی وان)، زێرا هەردوو منافق بوون، بۆچی ئەمان ادبیان کردیە، ئەوانە بەبێ ادبی و تجاوز و بێ معنای خەریک بووین؟ ولاشک عفوی ئەمان ئەلەمێ زۆر ئەدا بە دڵی ئەوان!

ڕوات ئەفەرمون طائفەی معفو یەک شخص بووە، لەبەر ئەوە توجیهاتیان کردیە بۆ اطلاقی (طائفە) لە سەر یەک تەن، وەک (ملت) بۆ (ابراهیم)، یاخود لغةً اطلاق ئەکرێ، (سید رشید) ڕاضی بووە بەو تصرفاتە اما حقیقة ظاهر وایە ئەمانەش متعدد بوبن! ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ﴾ پەنا بە خوا، ئەمانە بەلأن! ﴿بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ﴾ لە یەکن، هەندێکیان اولیا و ناصری هەندێکیانن، لە ئێوە نین، ڕابطەیان لەگەڵ ئێوە بڕاوە! نابینن ئەوان

﴿يأْمُرُونَ بِالْمُنكَرِ﴾ مؤمن نهی له منكر ئەكا. ﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ﴾ مؤمن امری پێ ئه كا. ﴿وَيَقْبِضُونَ أَيدِيَهُمْ﴾ له ڕێی خوا انفاق ناكەن، دەستی خۆیان ئەقوچینن، مؤمن بسطی یدی ئەكا! له ڕێی خوا چجای ماڵ، ڕوحی بەخش ئەكا! یاخود دەستی خۆیان ئەگرن له جهاد وەک (جبائی) ئەڵی، حسب المقام ناشیرین نیه! اما وەک (سیدی آلوسی) ئەفەرموێ، خلافی شایعه له و كلمەیه! بەڵێ ممكنه به عونی مقام و مقابله بڵێین: (لەنوێژو له زەكات)! ﴿نَسُواْ اللّهَ﴾ خوایان له فكر كردووه. حملی لەسەر نسیانی حقیقی چزەرەری نیه! خوایان بەدڵیشدا نایێ، مەگەر له وەقتی مسخره! وەک ئێستاكه دڵ غافڵن له خوای، ناوی سەرزارەكی هەیه لغواً یا به سوێندی بەدرۆ! ﴿فَنَسِيَهُمْ﴾ خواش ئەوانی له فكر كردووه، مبالاتی پێ نەكردوون، شرحی دڵی نەداون بۆ ایمان! ئەبایه (سلف)ی بڵێن: (النسیان معلومٌ والكیف مجهولٌ) بەڵام مجبوراً توشی تاویل هەرئەبن! ئیش كه كەوتە مقامی مشاكله، كار مشكل دەبێ! ناچار ئەبێ بڕۆین بۆ طرفی تجرید و تجرُدی الاهی، له مشاكله و مقابله و مماثله. ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ گەرچی به ظاهر خۆیان به مطیع ئەنوێنن، خوا نەخواسته ئەگەر تخلفێ بیێ، لەبەر عذره! ئەدی! ئەدی! منافقی تەواو اتم الفسافه! خارج له طاعەت! مع الإحتیال! ﴿وَعَدَ الله الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْكُفَّارَ﴾ علی الإطلاق، بالعموم ﴿نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ له ئاگری جهنم ﴿هِيَ حَسْبُهُمْ﴾ كافیانه! زاتاً مقصود یا نەبو، بۆیه بەوەعدەی دادەنێ! ﴿وَلَعَنَهُمُ اللّهُ﴾ دووری كردن له ڕەحمەتی خۆی – فی الدنیا و الأخره ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ له دڵیاندا قرار گیره، مادی و معنوی دونیوی و اخروی. خلاصه ئەوان مخلدی فی النارن، ناریش مخلده لەواندا له دەرونیان ناچێتەدەر. ﴿كَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ ئێوه وەک ئەوانی پێش خۆتانن، كردەوەتان عینی كردەوەیه! ﴿كَانُواْ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً﴾ اكثریان دەوڵەت بون و عشائری قەوی ﴿وَأَكْثَرَ أَمْوَالاً وَأَوْلاَداً﴾ اسبابی غروریان له ئێوه زێتر بووا ﴿فَاسْتَمْتَعُواْ﴾ ئەوان ﴿بِخَلاقِهِمْ﴾ سهم و

نصیبی خۆیان، لە لذائذ، خصوص ئەوانهی حضارەت و مدەنیەتیان هەبوو! ﴿فَاسْتَمْتَعْتُم بِخَلاَقِكُمْ﴾ ئێوەش! ﴿كَمَا اسْتَمْتَعَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ بِخَلاَقِهِمْ﴾ وەک وان، مع انه، نەدەبا وەک وان بن! فرق لە بەینی بریانی و لحم القدیدی، زۆرە! ﴿وَخُضْتُمْ﴾ خۆتان هاویشتە ناو اباطیل و فسادات! ﴿كَالَّذِي خَاضُواْ﴾ خوضێ وەکی خوضی وان! چۆن ئەوان ڕۆچوبون لە اباطیل و اضلال و تێک دانی کاری رسلی ایامی خۆیان، ئێوەش خوضتان بوو! کە وابێ تشبیهی خوضە بە خوض، نە خائض بە خائض! بۆیە فەرموی: (الذي)، نە یفەرمو، (الذين) نظر بۆ قووەتی جهەتی وحدت! ئەڵێن (فرا) وتویەتی: (الذي)ش بۆ افادەی معنای مصدەری هاتوە، یعنی تاویلی مدخولی خۆی ئەکا بە مصدەر وەکی ئێرە. (قاموس) ئەڵێ: (وخضتم کالذی خاضوا ای کخوضهم) بەڵام (ذوالوجه)ینە، لکن قولی (فرا) وەک (سیدی آلوسی) ئەڵێ نادر! حملی کلامی خوای ناکرێتە سەر نوادر! ﴿أُوْلَـئِكَ﴾ ئەوانە کە متصفن بەو صفاتە ﴿حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ﴾ بێ فائدە بە هدر، خۆڕای و بۆڕای چوو، ﴿فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ زاتا ئەوانە بۆ دونیایان کرد، ئەویشان بۆپێک نەهات، بۆوان بێ فائدە چوو، اما بۆ بشر زۆر خێر بوو. ﴿وَأُوْلَـئِكَ﴾ عمل هدر بوەکان ﴿هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ممکنە (اولئک)ەی سابق بۆ سابقان بێ، حکمی لاحقان بە استلزام ئەزاندرێ! وەڵام ممکنە، اول بۆ اولان و ئەمەش بۆ منافقەکانی ئێمەبێ! ﴿أَلَمْ يَأْتِهِمْ﴾ ئایا نەهاتوە بۆ ئەو کافرو منافقانە؟ ﴿نَبَأُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ خەبەریان خەبەرێ ذی شان و گەورە! ﴿قَوْمِ نُوحٍ﴾ بە طۆفان چوون، ﴿وَعَادٍ﴾ بەر باد بوون ﴿وَثَمُودَ﴾ بەرجفە، نافەرموێ قومی صالح و هود! زێرا ئەوانە بە ناوی قومی خۆیان معروفن! اما قومی (نوح) ﴿وَقَوْمِ إِبْرَاهِيمَ﴾ ئەوان بین الناس، ناوێ خصوصیان نیە پێی بزاندرێن! ﴿وأَصْحَابِ مَدْيَنَ﴾ ئەوانیش وا مشهورن و ئەناسرێن! بۆیە نە یفەرمو (قوم شعیب)! ئەوانە یوم الظلة، بەناریا بە صیحە ورجفە هیلاک بوون! قومی ابراهیم باسی نیە لە قرآن کە بە چی بە هیلاک چوون! مشهورە (نەمرود)

بــە پێــشکە چــووە، ڕەنگــە اتباعیــشی بــە (ملاریــا) و (گرانــەتــا) چووبن، ﴿وَالْمُؤْتَفِكَاتِ﴾ قومی (لوط) کەژێر بەرەو ژوور بوون، وەرگەڕان، یا سائری اقوامی دی کە خوا لێی وەرگێڕان و بە هیلاک چوون، ئەمەش انقلابێکە (ائتفاک) بەمعنا (انقلاب)ە! ﴿أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم﴾ هەر قومە رسولی خۆی ﴿بِالْبَيِّنَاتِ﴾ چاویان لێ نەکرد گوێیان نەداێ، خوا بە هیلاکی دان! ﴿فَمَا كَانَ اللّهُ لِيَظْلِمَهُمْ﴾ دوورە لە شانی خوا ظلم لە عبادە. ئەگەر ایمانیان هینابا، بە هیلاک نەدەچوون، نائلی سعادتین ئەبوون! ﴿وَلَـكِن كَانُواْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بە دوای هەوای نفس کەوتن، نفسی خۆیان لە شهوات و حبی ڕیاسەت و ظلم و ضلال بە ڕەڵا کرد، تاکو خانە وێرانی (دارین) بوون. ئەوانە ی معاندەی ئەو دینانە یان کرد، بە کافرو منافقەوە بە هیلاک چوون، ئەوانیش وائەچن! ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ﴾ کەورەوگچە، قرِوی و بدوی و مدنی ﴿بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ﴾ نصرەتی یەک ئەدەن، یەکتریان خۆش ئەوێ، لای یەک بە حورمەتی. اشتراکی ژنان بۆ غزوات کەم نەبۆوە، وە نفعیشیان زۆر بووە! ﴿يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ بە عکس منافقان! ﴿وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ دەستی خۆیان قبض ناکەن. ﴿وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ﴾ ئامادەی خدماتن، (ازدولت یک اشارت ازما بە سردویدن). ﴿أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ئەوانە خوایان لە بیر نەکردووە، خواش ئەوان لە بیر ناکا (یذکرهم فی نفسه و فی ملأه) ﴿وَعَدَ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ بێ عنوان! ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ خوا ئەزانێ چلەی زستانێ ئەو نوعە جێگایە تەماشای زۆر خۆش و دڵ گوشایە، دائما تەماشای باغات، فرح افزایە! ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ خروج نیە، نەبەمردن نە بە دەرچوون! ﴿وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ﴾ نیشتە جێ خۆشی لە اعلای دەرەجاتی بەهەشت! جنة الماوی جنة الفردوس، جنةالنعیم، اعلا ترینی بۆ ئەوانە یە! خوا بە نصیبی ئێمەش بکا بە بەرەکە تی وان! ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ﴾ تقدیر ناکرێ، حاوی هەمو سعادەت و رفعەت و منزلەت و

لەذەتە، روحيە و جسميە! ﴿ذَلِكَ﴾ ما ذكر، لام وايە بۆ رضوان باشترە (كل الصيد فی جوف الفرا)! ﴿هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ جەنابي ارحم الراحمين لەو فوزە محرومەمان نەكات! ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾ هەركەس بە مناسبەی حالّی خۆی. جهاد لەگەلّ (كافر) نوعێكە لەگەلّ منافق نوعێترە! ﴿وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾ لە سەر منافقان! يا هەردوو فريق! ﴿وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئەمەش حالّيانە لە آخرەت. ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا﴾ منافقەكان قەشمەری و كفرياتيان ئەگوت، كە (حضرەت) سؤالی لێ ئەكردن — لدی المحاكمە- سوێنديان ئەخوارد نەمانگوتيە. ﴿وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ﴾ بە ئاشكرا ﴿وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ﴾ ايمانيان نەبوو. ﴿وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا﴾ قتلی رسول الله.

لە وەقتی كە لە (تبوك) گەڕاوە جماعە تێ لەوانە ڕاوەستا بوون لەسەر (عقبە) بۆ كوشتنی، لله الحمد، محفوظ بوو لە شەڕی ئەمانە، ئەو جماعە تە ناپاكە پێيان ئەڵێن (اصحاب العقبە)، (سيد رشيد) لە تفسيری (ابن كثير) ناويان نقل ئەكا: (معتب بن بشير)، (وديعە بن ثابت)، (وجد بن عبدالله)، (حارث بن يزيدالطائی)، (اوس بن قيضی)، (حارث بن سويد)، (سعد بن زرارة)، (قيس بن فهد)، (سويد)، (داعس) لە بنی حبلی، (قيسی بن عمرو بن سهل)، (زيد بن الصيد)، (شلاله ابن الحمام) ئەو دووانە لە بنی (قينقاع) بوون ظاهر مسلمان بوون) وە (سيد رشيد) ئەفەرموێ: (بۆيە ناوم تعداد كردن، تاكو بۆ خلفای منافقان ڕێ نەبێ كە ناوی بعضێ مسلمانی ساغ باوێنە ئەم مەيانە).

فی الحقيقة رسول الله و يارانی گوزينی تا ئەمڕۆ لە شەڕی منافقان نجاتيان نەبووە، وەناشكری نەبێ اوضاعی زەمانە زۆر مساعديانە ﴿وَمَا نَقَمُوا﴾ انكاری حەق و حقيقەتيان نە كردووە- لسبب من الأسباب — ﴿إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِن فَضْلِهِ﴾ مع انە موجبی شكرانە! ﴿فَإِن يَتُوبُوا﴾ لە سەر ئەو هەمو فجايعە. ﴿يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ فی الدارين، وەلێيان قبولّ ئەكرێ.

سبحان الله فەرقی چەند زۆرە حکمی الاهی لەگەڵ تحکماتی بشری! ﴿وَإِن يَتَوَلَّوْا﴾ اعراض نێن لە توبە، دەوام بکەن لە سەر نفاق ﴿يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ هیچ قسەی سوکیان پێ ناڵێ- سبحان الله — لەو ادەب و مجاملەیە! ﴿وَمَا لَهُمْ فِي الأَرْضِ﴾ عەرەبستان و غیرە عەرەبستان. ﴿مِن وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ﴾ کەوا بێ سەر بۆ کوێ ئەبن؟ بەکێ نجاتیان ئەبێ؟ نابێ! الا بە توبەێ خالص! ﴿وَمِنْهُم﴾ لە منافقانە، تا ئەو وەقتە (تام النفاق) نەبوون! ﴿مَّنْ عَاهَدَ اللَّهَ﴾ افرادی ضمیر لە بەر ظاهری لفظی (من)یە! ئەوانە عهدیان کرد لە خدمەت خوا ﴿لَئِنْ آتَانَا﴾ پێمان کرمکا، ڕزقمان زۆر کا، بمانکایە دەوڵەمەند ﴿مِن فَضْلِهِ﴾ محض لە زێدەی جود و احسانی دیارە ئەوانە منافقی بالألوهیەت نەبوین! با منافقی بالنبوت بن! ﴿لَنَصَّدَّقَنَّ﴾ زەکات ئەدەین ﴿وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ لە قومێ ئەوەی چاک بێ و بگونجێ، بیکەن! ﴿فَلَمَّا آتَاهُم﴾ دیارە جمعێ بووین، نەتەنها (ثعلبە)ی قوڕ بەسەر! ﴿مِّن فَضْلِهِ﴾ چ اشارەت لە آیەتدا نیە، کەسێ لەوانە، طلبی دوعای کردبێ لە ڕسول الله! ﴿بَخِلُواْ بِهِ﴾ بخلیان پێ کرد، وفایان بە عهد نەکرد! ﴿وَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ اعراض و ڕوو وەرگێڕان لە صلاح، صفەتێ ڕاسخ بوو لەوان وەکو خلقی لێ هاتبوو. دیارە ئەوانە هیچ مراجعەیان نەکردیە پەشیمان نەبوینەوە، بناءً علیە تطبیقی ئەو آیتە لەگەڵ حکایەتی (ثعلبە) غیرە قابلە. ﴿فَأَعْقَبَهُمْ﴾ بخل و اعراض! ﴿نِفَاقًا﴾ بە الوهیەت. ﴿فِي قُلُوبِهِمْ﴾ تام و ڕاسخ و متمکنە ﴿إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ﴾ بێ توبە و رجوع ندامەت و پەشیمانی. ئەو دواخستنە ﴿بِمَا أَخْلَفُواْ اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ﴾ بە استمرارو دەوام حاصلی حکایەتی (ثعلبە بن حاطب) ئەمەیە: (ثعلبە فقیر بوو بە نوعی، خۆی و ژنی، عەبایەکیان هەبوو، ستری خۆیانی پێبکەن. عرضی رسول اللەی کرد دوعام بۆ بکە، دەوڵەمەند ببم، صدقە ئەدەم، چاکە ئەکەم، جەنابی ڕسالەت پەناە نصیحەتی کرد، ثعلبە اصراری کرد لە سەر دوعای نبوی، صاحب الدعوة دوعای بۆ کرد، زۆر نەچوو، زۆر

دەوڵەمەند بوو، لە بەرکثرەتی مواشی، لە مەدینە و اطرافی مدینە جێی نەبۆوە، بۆ دوور چوو، لە خدمەت رسول الله دابڕا، محروم بوو، لە ئایندە و رە وەندەو ر ڕێبوار اخباری مدینە ی وەرئەگرت! تاکو آیەتی (خذ من اموالهم صدقةً) نازل بوو. جەنابی رسول الله دوو کەسی نارد یەکی لە (جهینە) یەکێ (بنی سلمی) بۆ زەکات وەرگرتنی ساڵێ، حوشتر و غنمی بۆ نوسی بوون، فەرموی بڕۆن، بۆلای (ثعلبە)و پیاوێتر لە بنی (سلیم)، چوونە لای ثعلبە تەماشای مکتوبی ڕسالەتی کردو ووتی: (ئەمەخوشکی جزیەیە بڕۆن تا لە خۆ ئەبنەوە، بەلای من دابگەڕێنەوە). لە گەڕانەوەدا باز تەماشای کردەوەو ووتی: (ئەمە جزیەیە بڕۆن، تا خۆم ڕێی خۆم ئەبینم). هاتنەوە ماجرایان عرضی ڕسالەت پەناە کرد، ئەوآیتە نازل بووا یەکێ لە اقاریانی ثعلبە خبری بۆ برد یا نارد ئە وسا ثعلبە هات زەکاتی هینا پیغەمبەر قبوڵی نەکرد، ثعلبە گریا خۆڵی بەسەر خۆی داکرد، فائدەی نەدا. زۆر نەچوو صاحبی ڕسالەت وەفاتی کرد، وە زەکاتی هینایە خرمەت خلیفە صدیقی اکبر، ئەویش قبوڵی نەکرد هەرچەند ثعلبە دەخالەتی بە بۆ زرگەوارانی اصحابەو امهات المؤمنین کرد، فائدەی نەبوو. دوای امامی ابوبکر، زەکاتەکەی بۆ فاروقی أعظم هێنا، طبیعی ئەویش نە یویست. بۆ امامی عثمانی شی هێنا لێ قبوڵ نەکرا. لە زمانی ذی النورین ئەڵێن بە هیلاک چوو، مرد!)

ئە و حکایتە ئەگەر ڕاست بێ، دیارە ثعلبە مسڵمان بووە، توبەیێ خالصی کردووە، بۆچی لێ قبوڵ نەکراوە؟ ئەمە اشکالە! وەکی (سید رشید) ئەفەرموێ: (نظیری نیە لە دینی اسلام)! وەلەو آیەتی تازە ڕامان بوارد، ئەوانە ی قصدی قتلی رسول اللەیان کرد، ڕێی تۆبەیان لێ نەگیرا! ئایا ئەو هفوە و خلفی وەعدە گرانترە لای خوا لە قتلی رسول الله؟ کەسێ بڵێ ئەو مراجعە و گریان و خۆڵ بەسەر دادانی ثعلبە لە حیلەی ڕیویانی بووە، إنصاف ناکا! وەهەم وەک (سید رشید) ئەفەرموێ: (آیتی زەکات لە

اوائلی هجرەت بووە، ماجرای ثعلبە لە اواخری حیاتی ڕسالەت پەناە بووە!).
وەحکایەتی ثعلبە لە صحاحی مشهورە نقل نەکراوە، سبەبی چیە واشهرەتی ستاندیە، بێ محاکمە قبوڵ کراوە؟ مع انە بعضێ ئەفەرمون: ئەوانە جماعتێ بووین لە منافقان، ئەوعهدەیان کردیە، بێ ئاگاداری ڕسول اللە)! بعضێکی تر ئەڵێن: (ئەو عهدەیان بە ضمیر کردیە، بە لفظ نەبووە بە دەلیلی) ﴿أَلَمْ يَعْلَمُواْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ وَأَنَّ اللَّهَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾ گەرچی استدلالێ ناتەواوە، زێرا آیەت (علی کل حال) موقعی زۆر مناسبە، بەڵکو بە لفظ بوبێ لەگەڵ آیتی اخری مناسبەی زیاترە! اما مسالەی ثعلبەی تخفیف ئەکا! سببی مەیلی علمای دین بۆ فقرو زهدە، استلای ڕەهبانیەت! لایان وایە دەوڵەمەندی موجبی غضبی خوایە، عاقبەتی وخیمە، سەر ئەکێشێتە کفرو نفاق، بەڵام لەو فکرە اصابەیان نەکردوو وە، دینی اسلام لەگەڵ فقر نازی! وەنەژی! تاکو دەوڵەمەندەێ بە هیلاک ئەچێ، صەد هەزار فقیر خانە وێران ئەبێ! خاصة ئەمڕۆ ملەتی فقیر چی پی ئەکرێ؟ اقتداری نەبێ پاپۆڕێ بکڕێ، مثلا! ڕاستی ئەمڕۆ قومێ ملتێ دینی ئەژێ، لە سەر دەوڵەمەندی مخترعیش بێ! ثروەتی لەناو خۆی بێ، تا ممکن بێ، نەچێتەدەر! ئیتر املم وایە (ثعلبە) بە ایمانێ کامل لە دونیا چوبێتەدەر، وەواعظان زوبان دەرحەقی درێژنەکەن! وەذمی دەوڵەمەندی و مدحی فقیری، طی کەن! (سر) دوو نوعە، یەکی صاحیبی حسی ئەکا اما بزری ئە کا بۆ کەسێ اظهار ناکا، ئەوی دی خاونی درکی ناکا بەڵکو حسی ضدی ئەکا، مثلا یەکێ خۆی بەئازا ئەزانێ قطعیا خیاڵی ترسی بە دڵ داناێ، کەچی لەوەقتێ لێ قەومان دەرئەکەوی زۆر ترسنۆکە شمەێکی لە شجاعەت نیە! وە انسانێ وثوق بە خۆی ئەکا کە دەوڵەمەند بوو خێرو حسنات ئەکا عالەم بە جودی خۆی مستفید ئەکا، یا گەر خوا ئەو املەی پێک بێنێ وا ئەکا نذر و صدقە بەجێ دێنێ اصلا ذەرەێ حسی خلف لە خۆی ناکا، زۆر اعتمادی لە سەر خۆیەتی، کەچی لە بەختی کەچی وانابێ! خێری چیی و؟ حسناتی

چی؟ من ئەوەندەم تالّی فقیری چێشتیە ماڵ ببە خشم؟ لە وەقتی فقیری کۆمنی بەسەر کردەوە؟ تا ئەمڕۆ من پێی ببە خشم؟وطن و ملت و دین پەکی لە سەر احسان و جودی من نەکەو تووە! کەی من نذرم کردووە؟ ئەوەندە ماڵە چۆن صرف ئەکەم املم هەرپێک ئەهات! خوا چی بۆ من کردیە؟ ئەو عالمە بێ نذر و صدقە هەزار هەزار املیان پێک دێ! بۆ چی هەر ای من ئەبێ بە مقابلەی نذر بێ؟ ئەدی جودو احسانی خوای معنای چیە؟ فی الحقیقە ئەو ماخولیا و خطراتە سەر ئەکێشێتە کفر! خوا ئەو سرانە، پێشەکین ئەزانێ! لە سورەتی (طه) ئەفەرموێ: (فانه یعلم السر و اخفی) ئەگەر ڕەسولی خوای بۆ صاحێبی اظهار کا، انکاری ئەکا، تاکو (لدی التجربة و الإختبار) دەرئەکەوێ! ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ﴾ خۆیان هیچ، طعنیش ئەدەن لەو مسلّمانانە ی کە فی سبیل الله طوعاً بذلی ماڵ ئەکەن، ئایا ئەوە بیستراوە (ثعلبه) طعن بدا لەو مطوعانە؟ ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ إِلاَّ جُهْدَهُمْ﴾ دەولّەمەند نین، فقیرن، بەعارەقەی جبین بەکدی یمین و قوت و طاقەت و سعی ، شتێ پەیا ئەکەن بۆ اموری حیات، وەطعن لەوانەش ئەدەن! خانە خشتور خۆت لەبرسان ئەمری ئەو قووتی لایموت بۆ چی خۆت نایخۆی؟ بۆ چی صرفی ئەکەی لە هیچی؟ ﴿فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ﴾ گەمەیان پێ ئەکەن: (ئەی کاکی خۆم ئەو کۆتکە جۆیە چبوو هێنا بوت بۆ ڕێی خوا؟ چکونو کاژێرکی پێ ئەگیرێ؟). ﴿سَخِرَ اللّهُ مِنْهُمْ﴾ مشاكلةً وە مقابلةً خوا گەمەیان پێ ئەکا! ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ قارنانی عذابێ زۆر بە ئێشە، کەسی احسانێ بکا، ئەو دڵی لە تاسەوە ئەچێ! وەئەو نوعانە لای هەمو امة سووکن قەشمەریان پێ ئەکەن. ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ﴾ فەرقی نیە، هەر تۆ حەز ئەکەی ئەوانە هدایت بدرێن، لەماجرایان صرفی نظر بکرێ، لەبەر کمالی رافت و ڕحمت دەرحەق بە عباد و نجاتیان حتا لە عقابی حق! بەلّام ئەوانە کە لّکی ایمانیان پێوە نەماوە! ﴿إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً﴾ قەدری استغفاری خۆت

و تکبیری (حمزة) ﴿فَلَن يغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ﴾ ابداً! بویتە محالْ! ئەلْێن لە بەرکمالی حبی ایمان و هدایەتی انسان، ئەیفەرمو: (خوا مخیری کردیمە، وەلە حەفتا جار زیاتر طلبی غفرانیان بۆ ئەکەم!) نازانم دەرکەی ئەو غفران و ڕەحمەتە بۆ لە (ثعلبة) گیرا؟ یعنی بە گوێرەی ئەو ڕوایەتی گوتیان! ﴿ذَلِكَ﴾ لەبەر (ذلک) نازانم بعضێ لەگەورەی حفاظان چۆن توانیویانە بلێن (ئەو پارچەیە پاشێ بەینێ نازل بووە!). بەلێ بۆ توفیقی روایەت، مەلا گەورە گەورەکان، گەلێ تکلیفاتی وا تحمل ئەکەن! ذلک (بِأَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ﴾ کفرێ کە ازالە ناکرێ بە اجبار نەبێ! خواش، ئەوە ناکا! ایمان ئەبێ اختیار ی بێ! نەک الجائی! ﴿وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ ئەوانەی لایان دایە نایەنە سەر ڕێ، لەم لاو لەولا دەرئەچن، ڕاست ناڕۆن، بۆیە من بە ایمانی سیاسیونەکانی عصر زۆر بڕوایم نیە! سیاسەتی عصر و نفاق، یەکن! سیاسیون جێی بڕوای نین! ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ﴾ بەجێ ماوەکان لە (مدینە)! ﴿بِمَقْعَدِهِمْ﴾ دانیشتنیان. ﴿خِلاَفَ﴾ دوای ﴿رَسُولِ اللّهِ﴾ پێغەمبەری خوای. ئۆخەی با دانیشین! بێ هوودە مشاقی سفر نە چێژین! ﴿وَكَرِهُواْ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَالُواْ﴾ خۆ بە خۆی گوتیان، یاخود بە ضعفایان. ﴿لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ﴾ لە گەرمای. ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا﴾ کە بۆ عاصیان داندراوە! ﴿لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾ ئەگەر تێگەیشتی بان. ئەمڕو سرورڕیان هەیە بەو تخلفە ﴿فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلاً﴾ وەقتی غفلەت ﴿وَلْيَبْكُواْ كَثِيرًا﴾ زۆر بگرین! پاش عودەتی ئێوە -بالصحة و السلامة والنیل بعد الصیت و الشهامة- زۆر ئەگرین، دائم لە حزن و ماتەم ئەبن، تا گۆڕبەگۆڕ ئەچن! کەوابێ ئەو امرە وەک بعضێ مفسرین ئەفەرمون ئەمرێ تکوینیە! ئافەرین نابینی ئەفەرمێ: ﴿جَزَاء بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ جزای مناسب بۆ سرور و فرح، حزن و تەنگ دلْیە! ﴿فَإِن رَّجَعَكَ اللّهُ﴾ لەم سفرە. ﴿إِلَى طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ﴾ لەوەی مابن، لە منافقان، یا مخلصان! کانە ئەوان جێنوشینن! تۆ بۆ خزمەت وان رجعەت ئەکەیەوە لام وایە ئەمە نوعە

مسخرەیکی تیایە! ﴿فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ﴾ لە خدمەت بن بۆ سفر، غزا، غیرە غزا! ﴿قُل لَّن تَخْرُجُواْ مَعِيَ أَبَدًا﴾ (لجهة من الجهات!) ﴿وَلَن تُقَاتِلُواْ مَعِيَ عَدُوًّا﴾ حتا لەناو شاری (مدینە)! ﴿إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (لدی الطلب) لە بدئی سفر بۆ غزوی تبوک ﴿فَاقْعُدُواْ مَعَ الْخَالِفِينَ﴾ امین بن، هەڵستان و دانیشتنتان لەگەڵ ئێمە نابێ! لەگەڵ هاو مزاج و مشرەبەکانی خۆتان ئەبێ! مادام رابطەی ایمان نەبێ، رابطەی صوریش نابێ! ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم﴾ بعد الیوم! ﴿مَّاتَ أَبَدًا﴾ صلاتی جنازە. ئەگەر بڵێین صلاتی سکنە، زۆر ملائمە، لەگەڵ آیەتی (ان صلاتك سکن لهم) کەلەدواوە دیت! ﴿وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ﴾ بۆ دوعای تثبیت. ﴿إِنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُواْ وَهُمْ فَاسِقُونَ﴾ کەوابێ چۆن نوێژیان لە سەر ئەکەی؟ لەسەر قبریان ڕائەوەستی؟ صدقە وصیەتیان لێ وەر ئەگرێ؟ ﴿وَلاَ تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ﴾ هەر چەندەماڵ زۆر بێ، وەلە حدی زاتی خۆی زینەتی دونیا و دین بێ، ﴿وَأَوْلاَدُهُمْ﴾ با ولدیش زۆر بێ، وە لە حدی زاتی خۆی بەجێ بێ، وەشایانی مسرەت و رعایت بێ بەڵام، لەگەڵ ئەو منافقیە نەش، جە نابی حەق ئە وەندەیان دە ولەمەند ئەکا وەاولادیان ئەداتێ چونکە ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا﴾ بە ماڵ و اولاد. ﴿فِي الدُّنْيَا﴾ پێی ناراحەت بن، دائم دڵ تەنگ و سەغڵەت بن! ﴿وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ﴾ گیانیان دەرئەچێ. ﴿وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ دڵیان بێ دەغدەغەیە، لە سەر ئەو کفری لە سەری بوین، ثابتن، وەبەحەقی ئەزانن، وەئەڵێن: (ئەگەر وانەبا، ئەبا خوا ماڵ و ولدمان نەیڵێ، دیارە ئێمە لە سەر حەقین!). خلاصە ئەمە استدراجە، بۆئەوانە! زێرا ئەو کەسانە ی فکریان هەر ئەوەندە بێ، هەر بە هیلاک ئەچن! زاتا بە هیلاک چوون! چونکە صرفی نظر لە هەمو آیات بکەن، هەر بەوەندە خۆیان هەڵخەڵەتێنن، لەگەڵ یقین و ایمان و چاکە، چ علاقەیان ئەمێنێ؟ ئەو آیتە بە فرقێکی کەمەوە ڕابردووە، مقامیان جودایە، بەڵکو مرادیش، بە خطاب، جودایە! ئەوانی پێشی نفقەیان لێ قبوڵ نەدە کرا، چ طوعا چکرها انفاقیان کردبا! وەئەوانە

بوون، بە کسالەت ئەهاتن بۆ نوێژ! ئێرە، ئەوانن کە پێیان ناخۆشبو جهاد بە ماڵ و بە نفس وەنهی‌یان ئەکرد لە نفیر! لێرە مناسب جمعی بین‌المال و الولد، لەپێشەوە ئەگەر نە یفەرموبا (ولا اولادهم) وجە بۆجمعی ظاهر نەدەبوو! ئەمە هەر نە یسە سە هلە، بەڵام صعب توفیقە لەبینی آیت و روایەتی رسولی مجتبی کە چووە نوێژ لە سەر (ابن ابی سلول)بکا (فاروق) معارضەی کردیە جەنابی رسالەت نوێژی لە سەر کردیە، ئە وجا ئە و آیتە نازل بووە. تاریخی نزول و مردنی ابن ابی سلول یەک ناگرێتەوە، بعضێ لە سرامدانی حفاظ خۆیان ماندوکردوە، بەڵام فی الحقیقەت زەحمەتێ بێ هودەیە! بۆیە بعضێ لە کباری علمای محققین انکاری (مانقل) ئەکەن. ئەگە ر تەواوی تفضیلاتتان ئارەزوە، تەماشای تفسیری (سید رشید) بکەن! ﴿وَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ﴾ هەر سورەتێ بێ وەتیای بێ ﴿أَنْ آمِنُواْ بِاللّهِ وَجَاهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ﴾ خۆشە انسان مکلف بێ بە ایمان وەلێی گەڕێن! اما عملیات تێکی ئەدات قەلب و قەللابی بە دەر ئەخات. ﴿اسْتَأْذَنَكَ أُوْلُواْ الطَّوْلِ﴾ دەوڵەمەند بە قووەت و دەست درێژ. ﴿مِنْهُمْ﴾ لە منافقەکان، ئەمەعادتیانە، وەنیە هەر بۆ غەزای تبوک وابووبن، تا بڵێن نوعە معذەرەتێکیان هەیە لەو وەقتەدا، وەبەگژدا چوونی ئەو دەوڵەتە عظیمە خیلێ صعبە ﴿وَقَالُواْ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ الْقَاعِدِينَ﴾! لەگەڵ شەل و کوێرو سەقەتەکان. ﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ الْخَوَالِفِ﴾ بێ شەرم و انفعال و تاثر و وجدان. ﴿وَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ چجایێ ایمان، غیرەت و عزەتی نفسیشیان نیە! ناچێتە دڵیان ﴿فَهُمْ لاَ يَفْقَهُونَ﴾ چەند لئیم الطبع و دون، همەت و ذلیل النفسن! ﴿لَكِنِ الرَّسُولُ﴾(ﷺ) ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ﴾ سابقین الی الإیمان، لەمهاجرو أنصار، ﴿جَاهَدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ﴾ حتا مهاجرەکان ئەوەی ئەیا نبوو، لە ڕێی خودا صرفیان ئەکرد! ﴿وَأَنفُسِهِمْ﴾ خۆیان و اولادیان، سەرو ماڵیان لە اوغر دابوو. ﴿وَأُوْلَـئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ﴾ غلبە و غنیمەت و مەردی: اما تفسیری بە (حۆری) لێرە خۆی نیە! ﴿وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ فائزن لە (دارین).

﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ﴾ بۆی داناون مهیا و ئامادەی کردیە ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ باغ و باغاتێ تێر ئاو، ڕازاوە بە انواع و اشکالی زینەت و خۆشی، ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ دەرچوون نیە. ﴿ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەوی ذکر کرا! ﴿وَجَاء الْمُعَذِّرُونَ﴾ بە تشدیدی (ذ) علی المشهور، بە تخفیف لە سەر قراءتی (یعقوب) ظاهر وایە تقصیریشیان بووبێ لە عذری مقبولّ، ڕەواهیشتیشیان بووبێ! ﴿مِنَ الأَعْرَابِ﴾ بادیە نشین، ﴿لِيُؤْذَنَ لَهُمْ﴾ بۆ تخلف! ﴿وَقَعَدَ الَّذِينَ كَذَبُواْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ منافقەکانیان گوێیان نەداوەتە عذر خواستنەوە و اذن و مذن! ﴿سَيُصِيبُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ﴾ لە اعرابی بدو! ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لە دونیا بە دەستی مسڵمانان. ﴿لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء﴾ جەنابی حەق بیانی اعذاری ڕاستی ئەکا! یەکێک بێ هێزی لە بەر پیری یا خلقة لاواز و مردۆخ بێ ﴿وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى﴾ دووەم نەخۆشی، شەل و کوێر بە طریق الأولى! کێ بە خاطری دادێت شەل و کوێر ماموربن بە جهاد بۆ حربی ڕۆم سوق کرێن؟ سێی یەم ﴿وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ﴾ فقیری، بێ اهبەو زادو راحلەبن! ﴿حَرَجٌ﴾ لە تخلف! ﴿إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ ئەو شرطەی فرقەی سێیەم بۆ هەرسێ فەرقە زۆر موافقە! یعنی بە هیچ وجە خیانت نەکەن پاک و خاوێن بن. ﴿مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ﴾ چونکە هەرکەس بەقە دەر حاڵی خۆی ئەتوانێ احسان و اساءة بکا، ئەوجا ئەوی محسنی تەواو بێ، هیچ ڕێی بەسەرەوە ناڕوا، بەڵێ لۆمەی کەس ناتوانێ ڕووی تێکا بە وڵاتیا بڕوا! ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەرچەند خوا عفوی ئەکا اما لە مقتضای ڕەحمەتی تکلیفی وا ناکا بیکاتە داو بۆ گناە کردن! چوارەم ﴿وَلاَ عَلَى الَّذِينَ﴾ ڕێنیە، حرج نیە ﴿إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ﴾ سواریان کەی مەردی جەنگی بووین اما بە پیادەی نە یانتوانیە ئە و نوعە سفرە بکەن! ﴿قُلْتَ لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ سبحان الله بعضێ دەوڵەمەند بوون و بە اهبە نەدە چوون! ئەوانە بە دڵ و جان ئارەزوویان بوو بچن بۆ غزا، فقیر بون و نە یان بوو نەزاد نە ڕاحلە! وە ڕەسولی اکرمیش چ وڵاغی نەبو

ئەوانی سوارکا و تجهیزیان بکا. ﴿تَوَلَّواْ﴾ ئەگەڕانەوە لە حضور. ﴿وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ﴾ چاویان ئەهاتە خوار و دادەڕژا لەبەر فرمێسک، ئەوە ابلغترە لە فرمێسکی دادەڕژا ندا! ﴿حَزَنًا﴾ لە جهەت تاسف و غمەوە، فرمێسکی صادقانە! ﴿أَلاَّ يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ﴾ تماشای حسنی ادبیان بکە! بۆ انفاق عرضیان نەکرد! وولاغی سواریان طلب کرد! فرمێسکیان لە سەر فقیری خۆیان داڕژاند! کە نە یان بوو صرفی خۆیان بکەن! وە (بیت المال)ەش چی تیا نەبوو بیاندرێتێ و صرفی بکەن! بەڵێ فقیریە انسانی لە هەموخێران محروم ئەکا!

ئەو ساڵەی کە (روس) هاتە ڕەواندز لە وەختی شەڕی عالەمی یەکەم، جماعەتێ لە (ژاندرمان)مان بەڕێ کرد، دوعامان بۆ خوێندن قائمقام (احمد حلمی) ڕحمة الله علیه ووتی: (بابت باپیرت چوینە غزا، تۆ، نەچوی! ئەوا غزا هاتە ڕەواندز!) ووتم: (ئە وان نەختێ ماڵیان هەبوو، اما لە سایەی استلای حکومەت، ئێمەچمان نەما! الان خوا ئەزانی لەیەک (مەتاڵیکیی دە پارەی) سکەی شک نابەم لە عەرزو ئاسمان! لەسەر ئەو هەمو مصرفی عائلە و مدرەسە! چۆن بچمە غزا؟) ئەمڕۆش ناشکری نەبێ ئەو فقرە دەوام ئەکا! ئەو ذەواتانە کەپێیان ئەڵێن (بکائون)، حەوت نفر بووین! (سالم بن عمیر، علیة بن زید، عبدالرحمن بن کعب، عمرو بن الحمام، عبدالله بن معقل، هرمی بن عبدالله، عرباض بن ساریة) ڕەضای خوایان لێبێ. وادەر ئەکەوێ معذەرەتی ئەوانە ▪ ئەیانووت: (ئەگەر ئێمە بێێن بۆ غزا دوشمن بەسەر اهل و عیالمان دادەدا)، قبوڵ نە▪وا!

﴿إِنَّمَا السَّبِيلُ﴾ بەعتاب و بەعقاب. ﴿عَلَى الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ﴾ بۆ نەهاتن! ﴿وَهُمْ أَغْنِيَاءُ﴾ دەوڵەمەندن، توندومەندن! ﴿رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ الْخَوَالِفِ﴾ ژن و زاڵ و منداڵ و پاڵ. ﴿وَطَبَعَ اللّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ لە میعادی خۆی، نە ایمان، بەڵکو مروەت و شهامەت و غیرەت، ڕێی نیە بچێتەناو دڵیان! ﴿فَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ علم و شعوریان نیە بەو ڕذالەت و خسەتە، بەو عەیب و عارە[1]!

﴿يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ﴾ عام لە خدمەتی حضرەتی رسالەت و مؤمنین. ﴿قُل لاَّ تَعْتَذِرُواْ﴾ بێ هودەیە! ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ﴾ بڕواتان پێ ناکەین! ﴿قَدْ نَبَّأَنَا اللّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ﴾ ئەوەی بزرتان ئەکرد لە ئێمەتان ئەشاردەوە. لەپاشی اخبار و اعلامی خوای، جێی بڕوای بە ئێوە ئەمێنێ؟ حاشا! چونکی جەنابی حەق مقصودی بووە، اصحابیش بیزانن، وە انبای ڕسولیش عینی انبایە بۆ وان، فەرموی: (نا)! نە یفەرموو: (نی)! ﴿وَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ﴾ ئەوەی ڕۆی ڕۆی! عذری لسانی، چنیە! چاکە، خراپە، مەردانە، نامەردانە، کردنتان، کردەوەتان من بعد، خوا و رسولی ئەبینن! ﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ حضرەتی کبریاء عالمە بەکلی اشیاء چنهان چئاشکرا! ﴿فَيُنَبِّئُكُم﴾ بە مجازات! ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بەوەی ئەتانکرد لە داری دونیا. ﴿سَيَحْلِفُونَ بِاللّهِ﴾ سوێندێ مؤکد! ﴿لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ﴾ لەو سفری خێرە. ﴿لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ﴾ زجر و لۆمە و توبیخیان نەکەن. ﴿فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْ﴾ مبالاتیان پێ مەکەن حتا بە عتابیش! ﴿إِنَّهُمْ رِجْسٌ﴾ پیسن! ئەگەر نجس العینیش نین، نجس القلبن! ﴿وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ بە ئاگری جهنم نەبێ پاک نابنەوە! زاتا ملجا و ماوایانە! ﴿يَحْلِفُونَ لَكُمْ﴾ بە سوێندێ صمیمی بەناوەندی دڵ، ڕاستی ئەنوێنن! ﴿لِتَرْضَوْاْ عَنْهُمْ﴾ پێیان بڕواکەن لێیان ڕاضی بن،جێی عتاب و لۆمەتان

---

[1] - تفسیری جزای عاشر تەواو بوو لە رۆژی شەمو ٨ مانگی ذی الحجه ١٣٥٥هجری قمری، ٧ شباطی ڕۆمی ١٩٣٧ میلادی.

نەمێنیٚ! ﴿فَإِن تَرْضَوْاْ عَنْهُمْ﴾ بالفرض و التقدیر وامان حساب کرد ئێوە لیٚیان راضی بوون چسوود؟ ﴿فَإِنَّ اللّهَ لاَ يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ شرط ئەوە یە خوایان لیٚ راضی بیٚ! خواش لە قومیٚ کە لە اطاعە دەرچوبیٚ راضی نابیٚ! خلاصە چاک بۆوان ئەوەیە لە ارضای خوای خەریک بن، اصل ئەوە، ئیتر فروعە! ﴿الأَعْرَابُ﴾ عربی صحرا، خێمە نوشین، رحالە، دوور لە مە دە نیە وەکی عشائری کۆچەری ئێمە. ﴿أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا﴾ ئەوان دلّیان رِەقە، تابعی میلی خۆیانن، وازعیان نیە، یاکەمیٚ لە کفرو نفاق بە قوەت ترن لە اهلی حضارەت! اما خۆیان ناگرن بە زویی بەدەری ئەخەن، ئە ناسرێن بەئاسانی! ﴿وَأَجْدَرُ أَلاَّ يَعْلَمُواْ حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى رَسُولِهِ﴾ دوورن لە اتباعی قوانینی دولی، حوریٚن سەر بە خۆن، قیودو حدودی شرعی هەلّناگرن! سبب بە مناخ و طرزی معاش، بەو حالّە لایق ترن لە متمدنە کان! ئەوە منافی نیە لەگەلّ زەکای فطریان و تیٚ گەیشتنی معنا! ﴿وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ هەرشت بە مناسبەی حالّ و ظروف و موقع، تربیەی ئەدا، دای دەنیٚ! هەرچەند فاعلی مایشایە، اما علیم و حکیمە! خۆزیا (اشعری)ش وای فەرموبایە! ظاهر وایە گرۆهیٚ بیٚ مکر و حیلەبن، بەس ایمان نایێنن، حدودی شرعی قبولّ ناکەن، خۆیان لا ئەدەن لەو جهتە! ﴿وَمِنَ الأَعْرَابِ﴾ علاوەی نفاق و کفر ﴿مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا﴾ بیٚ استفادەی ئەنوێنی، مالّ ئەدا بۆ انفاقی فی سبیل الله، اما بەضایعی حساب ئەکا یاخود بە قرضی دادەنیٚ! ﴿وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوَائِرَ﴾ منتظری تغلباتی زەمانن، مصائب و شروری دورانی بەسەرتا ندابیٚ، ئەو وەقتە تۆلّەی مالّی خۆیان وەرگرن قرضی خۆیان بستێننەوە. ئەلّێن ئەوانە: (بنو اسد، غطفان)ن، ﴿عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ السَّوْءِ﴾ دوعایە، یا خبرە! (سوء) بەفتحی (س) بە معنا حزنە بە ضمی (س) لە قراءتی (ابن کثیر و ابو عمرو) اسمە بۆ ئەوشتەی کەپیٚیان ناخۆشبیٚ. علی کل بە لا محصورە لە سەر وان! بۆ مسلّمانان نابیٚ، بەلّکو مسلّمانان بە

عون و عنایەتی یەزدان نائلی فتح و فیرۆزی ئەبن، دائرەی فتوحاتیان توسع ئەکا. ﴿وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ همس الخطابیان ئەبێ، خواطریانی لێ بزرنابێ! ﴿وَمِنَ الأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِاللّهِ﴾ وحده لاشریک لە، ﴿وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ لاتجزی فیه نفس عن نفس شیئاً! ئەوەی بەکەڵک بێ لەو ڕۆژە، هەر عملە! ئەوەی بێ عملە، بێ جارور جیرانە متحیرو سەرگردانە! ﴿وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ﴾ ئەوەی صرفی ئەکا. ﴿قُرُبَاتٍ عِندَ اللّهِ﴾ وسائلی نێزیکی لەکن خوای، یعنی خالص لەهەمو میول و اغراض، نێزیک لە کاری خوای! ﴿وَصَلَوَاتِ الرَّسُولِ﴾ و وسائلی دوعای بە احترمی رسالەت پەناه! صلوات لێدان اساساً باسی نەبووە، خاصة لە طرفی رسولی اکرم بۆ اربابی خیرات! بە ڵام لە پاشی ئەوە نوعاًما اصطلاحی داندراوە. صلوات لە کێ ئەدرێ؟ سلام و رضوان و ڕحمەت و قدس سره بۆکێ ئەگوترێ؟ بعضی لە علمای تقلید بۆ امامی خۆی (رضی الله عنه) ئەڵێ، بۆ ئەوانی تر (رحمة الله علیه) ئەبێژێ. خلاصه تقلید سەیرە! (شیعه کان لە ئاخری حاشیەی (سنیه)کان (علیه ما علیه) ئەنوسن! لام وایە ئەوانە ئەمانە بە (قربات عند الله و صلواتی الرسولی) حساب ئەکەن! نەکبەت شانی مسڵمانانی گرتوە الانیش هەر لە سەر ئەو منوالە ئەڕۆن، ڕوو لە وحدت و تقربی (الی الله الواحد) ناکەن! ﴿أَلا إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ﴾ نفقە بۆ خاطری تانیئی ضمیر! ﴿سَيُدْخِلُهُمُ اللّهُ فِي رَحْمَتِهِ﴾ مؤکداً جەنابی حەق ئەیانهاوێتە ناو ڕەحمەتی خۆی، لە ڕەحمەتی خوایا غرق ئەبن لە سەر تا قدم ئەچنە ناوی! ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ﴾ کێن؟ لەبەر خلاف زۆر معلوم نیە! ئەوەندە ئەزانین ﴿مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ﴾ ڕەضای خوایان لێ بێ. ﴿وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ﴾ ئەگەر عام بێ، سابقینیش عام ئەبێ! بەڵام ظاهر وایە مقصد ئەوانەبن کەلە زەمانی سعادەت ایمانیان هێناوە اتباعی اولینیانکردیە بە چاکە. ﴿رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ﴾ رضوان خوای لە هەموشتێ گەورەترە. ﴿وَرَضُواْ﴾ زەهێ مقامی بڵندە. وە

قطع النظر له کلی شت حقا رضا بوون له خودا – عن طیب قلب – زۆر مشکله، زۆر نادره! خصوص که تووشی شدائد و به لاو تەنگی بووین، وه اقرانیش بالعکس له هناو وسعەت دابن، ڕەضا بوونمان غایت صعبه! ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي من تَحْتَهَا الأَنْهَارُ﴾ ببن دارەکانا! ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ ڕێی تاویلی نیه! ﴿ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ دیاره ئەو فوزه دووره به ئاسانی دەست ناکەوێ تقربی الی اللەی دەوێ تا ئەگاتە ئەوفوزه! ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ﴾ هەر به شدتن، اما استاذ نین! ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ﴾ وەک سائری اهلی حضارات. له سیاسیونان ﴿ مَرَدُواْ عَلَى النِّفَاقِ﴾ تمریناتیان زۆره گەیشتونه نهایەت، استادن، لووس بوین له نفاق، لێیان دەرک ناکرێ، بۆیه ئەفەرموێ ﴿لاَ تَعْلَمُهُمْ﴾ له بەر غایەتی حذاقەتیان، چی وا ناکەن و نالێن، حتا به تەمیز لێیان دەرک ناکرێ ئەو جۆره منافقانه له أعظمی مصائبن! – العیاذ بالله- لدی الفرصة اوینی وا ئەگێڕن عقڵ حەیران ئەکەن، ئەبا (ابن جریر) لێرەش بڵێ: (ئەوانه جنۆکەن). بەڵێ جنۆکەن له خۆبزرکردن اما شیطانی ماردن عفریتی دەلاڵن! مع الأسف حضرەتی ڕسول وەک بعضێ اولیای امتی خۆی، ما فی الصدوری بۆ کشف نەبوبو! بەڵێ کشفی بەدرۆ ئاسانه! سبحان الله له ڕوایەتی (ابن جریر) وا دەر ئەکەوێ له زەمانی (قتاده) اقوامێ وا پەیا بووبن بڵێن: (ئەوه بەهەشتیه، ئەوه جهنمیه!)، چەند زۆرێ گۆڕان! ﴿نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ﴾ تۆ نایان ناسێ، ئێمه ئەیان ناسین! ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ﴾ فی النشاتین! عذابی دونیا بەهوان و ذل و محقری بین المؤمنین، پاش بەدەرخستن و ئاشکرا بونیان له طرف جەنابی علام الغیوب! عذابی آخرەتیش خوا خۆی ئەزانی چیان لێ ئەکا! وه عذابی آخرەت اعتبار ئەکرێ له بعد الموت، بەلام اکثری مفسرین عذابی دووەمیان به عذابی قبر تفسیر کردیه، (سید رشید) هەردووکیان له دونیا اعتبار ئەکات! وه تجویز دراوه (مرتین) وەک (کرتین) بۆ تکثیر بێ، زۆر جوانه!

﴿ثُمَّ﴾ پاش ئەو دوو عذابە، یا عذابە زۆرە ﴿يُرَدُّونَ﴾ لە ڕۆژی قیامەت ﴿إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ لام وایە بۆیە اکثر مرتی ثانیان بە عذابی قبر تفسیر فەرمووە، مع ان الامر سهل، با عیبارەت بێ لە مە ئیوسی لە ڕەحمەت! ﴿وَآخَرُونَ﴾ لە اهلی مدینە و حوالّی ئیوە جمعێ هەن. ﴿اعْتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمْ﴾ یەک لەوان تخلفە لە عزا. ﴿خَلَطُواْ عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا﴾ کانە و لە میانی چاکە خراپەیان کردووە لەو مقولە، لەمیانی خراپە چاکەیان کردووە، کذالک! وەاحباطیش لازم نایێ، زێرا ئەو خلطە بە گوێرەی تفسیری ئێمە مستلزم نیە بۆ عدمە تمیزی چاکە لە خراپە وە خراپە لە چاکە، کانە امتزاج بکەن شتێکی تریان لێ پەیدابێ! نوکتە زۆرە کە ئەفەرموێ: (وآخر) نافەرموێ: (باخر)! لای من تاویل بێ معنایە، عدول لە (ب) بۆ (واو)، لە (عالم) فکیف ب (الأعلم)، بێ هوودە نابێ! ئەوەی حەزی لە قسەی تێکەڵاوە تەماشای (روح المعانی) کا (سید آلوسی) (رحمە الله) حوصلەیێ واسعی هەیە بۆ نقل و نقدی خلافات! ﴿عَسَى اللّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ (عسی) و مثلی (عسی) لە ملوک و کباران لە مقامی (جزمە)، فکیف حضرەتی باری وا بفەرموێ! ﴿إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لای بەندە، اعترافیان کافیە بۆ خۆش بون! ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ ای ئەوانە، وەک سائری مسڵمانی خالص. ﴿صَدَقَةً﴾ فرض و نفل. ﴿تُطَهِّرُهُمْ﴾ لە دەغدەغەی قبوڵی توبە! ﴿وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ تا نما بکەن بۆ چاکە، زێدە ببن لە چاکە بەواسطەی اخذی صدقە. ﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ﴾ احترامیان بگرە، دوعای بە تعظیمیان بۆبکە. وەک (امامی شافعی) ئەفەرموێ: «وەرگر» آخذی صدقە بابڵێ «اجرک الله فیما أعطیت و جعلە لک طهورا و بارک لک فیما ابقیت». ﴿إِنَّ صَلاَتَكَ﴾ دوعای بە احترامی تو ﴿سَكَنٌ لَّهُمْ﴾ دڵیان پێ دادەمەزرێ، کانە نفسی سکون و ئارامە بۆوان! چونکە ئەزانن ئەوەی تۆ حورمەتی بگری، خواش حورمەتی ئەگرێ، وە دوعای تۆ خوا قبوڵی ئەکا ، چونکی دوعاشت صرف بۆ خوایە! ﴿وَاللّهُ

سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ سرتە، ذەررە، لە وی بزر نابێ، ئەیبینێ، ئەیزانێ! ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا﴾ ئەو معترفانە ﴿أَنَّ اللّهَ هُوَ﴾ بە حصرێ محقق. ﴿يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ﴾ هەر چیی بن، مخلوق و خدمەی خۆینی! تۆبەیان قبوڵ ئەکا و لە گوناهیان خۆش ئەبێ! ﴿وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ﴾ لەوان بۆ وان! ﴿وَأَنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ هەرئەو، کەسی تر نا! توبە قبوڵ کردن لە گوناه، تجاوز کردن لە جزای گوناه خاصة عائدی حضرەتی کبریائیە! ﴿وَقُلِ اعْمَلُواْ﴾ ئیش کردن خۆیەتی! ئەوەی چوو چوو! من بعد بێ قصور عمل بکەن! ﴿فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ کارێ بکەن شایانی ئەو معرضە عظیمە بێ! خواو ڕسولی و مسڵمانان ببینن! ﴿وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ ئەوەی بە حواس دەرک ئەکرێ، ئەوەی دەرک ناکرێ بە مشاعر، ظاهر و باطن، سر و علن، مکشوف و مستور! ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لە داری دونیا. کەسێ حیای هەبێ لە خجاڵەتا ئەتوێتەوە! خیام ئەڵێ:

(بانفس همیشه در نبردم چه کنم
وزکردەی خویشتن بدردم چه کنم
گیرم که مرا فروگذاری به کرم
زان شرم، که دیدی چه کردم، چه کنم

ئەوجا ئەو ڕۆژە گردەواری خۆتان بکەن! ﴿وَآخَرُونَ﴾ تخلفیان بووە بێ خلط و اعتراف، ئەوانە ﴿مُرْجَوْنَ﴾ تاخیر ئەکرێن ﴿لِأَمْرِ اللّهِ﴾ تا امری خوای دێ، ئیشی وان عائدی خوایە ﴿إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ﴾ ئەگەر وابمێنن! ﴿وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ﴾ ئەگەر اعتراف بکەن. ﴿وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ کاری بەجێ، کارانی بەجێ ئەکا! ئەوانە عندالجمهور ئەو سێ کەسەن کە بحثیان دێ ناوەکانیان ئەمانەن: (مراره بن الربیع، کعب بن مالک، هلال بن امیه). سبحان الله! بە مناسبەی ارجا کە بحث لەوانە تاخیر کرا، عطفی نظر کرایەوە بۆ منافقی تەواوو مؤمنی خالص! وە مصدرکرا بەباسی ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا﴾

ئەوانە جماتێکن لە ڕووی دین داری و لە ژێر پەردەی دیانت و خزمەتی دین، اجرای واجباتی نفاق ئەکەن، ئەوانن (ماردو غالب علی النفاق)، وای ئەبەستن وای ئەهاوێنە ژێر ارادەی خۆیان کە نفاق ناتوانێ لە سەر هەمو قووەتی خۆی خۆی بە دەرخا! حقا هونەرە بەزۆر هەواو مەیلی خۆت بگرێ، خلافی بەدەرخەی، بەنوعێ کەس تێت نەگات، بەڵکو بەڕاست بزاندرێی! ئەو گروهە ئەڵێن دوازدە کەس بووین، ناویان لە (روح المعانی) ذکر کرایە، ظاهر بۆ معاونە ی ضعفای مسلمینان بنای مزگەوتیان کردبوو، اما لە حقیقەتدا مقصدیان ضرر دان و تۆین بوو! وەئەوانە (ابوعامری راهب) عدوی رسول الله هەلی خەڵەتاندبوون، پاش شکانی (هوازن) خەبەری بۆ ئەوانە نارد: (کەمن ئەوا ئەڕۆم بۆلای ملکی ڕۆم، لە شکر دێنم بۆدەرکردنی محمد، ئێوەش بەناو مزگەوتێ دروستکەن، پڕی کەن لە ذخائری حربیە!)، ئەوانیش مزگەوتەکەیان بنا کرد، هاتنە خزمەت حضرتی رسول اللە بچێ تبریکاً نوێژی تیا بکا. فەرموی: ( من لە سەر جناحی سفرم، کەهاتمەوە انشاء الله نوێژی تیا ئەکەین). کە گەڕاوە لە جێێ ناو (ذی اوان) کە سعاتێ دوور بوو لە مدینە نزولی فەرموو، وەناردی ئەو مزگەوتیان تێکدا! ﴿وَكُفْرًا﴾ تیای إظهارکەن، یا تقویەی دەن! ﴿وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەمزگەوتە مقابلی مزگەوتی (قبا) بوو! تا ئەو وەقتە مسڵمانانی ئەوێ نوێژیان هەمو لەوێ ئەکرد! بو تفرقە، ئەو بنایەیان بنا کرد! خۆزیا مسڵمانان لەو آیتە فکری بان، بەو گوێرەیە نە یان هێشتبایە مقابلی مزگەوت بە هەر ناوێ بێ، بۆ عبادەت، هیچ بنایێ بکرێ! ئەوا ئێمە ئەبینین بنای ئەو عبادەتخانانە چ‌تفرەقەیێکی دا مسڵمانان. ﴿وَإِرْصَادًا﴾ انتظاری هاتن ﴿لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ (ابو عامر!). سبحان الله ئەو (ابو عامر)ە باوکی (حنظله) بووە کە مشهورە بە غسیل الملائکە)! بەڵێ (یخرج الحی من المیت)! ﴿مِن قَبْلُ﴾ لە ابتدای قدومی نبوی بۆ مدینە ئەو ابو عامرە خەریک بوو بۆ خراپە لەگەڵ پێغەمبەر، تا بە ئاوارەی دەر دیار گۆڕ بە گۆڕ

چوو! ﴿وَلَيَحْلِفَنَّ﴾ ئەو منافقانە سوێند ئەخۆن ﴿إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ الْحُسْنَى﴾ لە بنای ئەو مزگەوتە هەر چاکە و خێرمان مقصود بووە، لە سەر نیەتی خێر بنامان کردووە. ﴿وَاللّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ دیارە ئەگەر خوا بۆ حضرەتی رسول ئاشکرای نەکردبایە، لەو حیلەخانە ی کفرو نفاق، زۆر فتنە ی لێ ظهور ئەکرد! ئەڵێن (امامی عمر) لە زەمانی فتوحاتی امری دەدا مزگەوتان دروست بکەن، اما رێی نەدەدا لە مدینەێ دوو مزگەوت دروست بکەن، (سبحان الله) کەس لەو امتە وەک (فاروقی أعظم) ئەندێشەی لە اسبابی تفرقە نەکردیە! ئەگەر اخلافی وی ئەو احتراسەیان کردبا، امە چۆن بەو نوعە تفرقەیان ئەکرد! مع الاسف هەر شقاق و نفاقێ بێ، بەناوی دین هاتە ناو امة، بە کمالی نشاط قبوڵ کرا! ﴿لاَ تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا﴾ بۆ نوێژ و غیری نوێژ، تیای ڕامەوەستە! ﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى﴾ مزگەوتێ بناغەی داندرابێ لەسەر پەرهێزکاری. ﴿مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ﴾ لە هەوەڵ ڕۆژەوە، با وجودی زەمانی وهن و بێ هیمنێ اسلامەتی بوو! ﴿ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ﴾ قسمێ زۆر ئەفەرمون: (مراد مسجدی نبویە لە شاری مدینە)، وە بعضێ ئەفەرمون: (مزگەوتی قوبایە). لای حقیر ئەوە جوانترە! زێرا مسجدی (ضرار) بەرانبەر مسجدی (قبا) بنا کرا، قسەلە مزگەوتی پێغەمبەر نیە! گەرچی (سید رشید) ئەفەرموێ: (هەردووک مراد بن)! ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ﴾ بە حبی سابق ﴿أَن يَتَطَهَّرُواْ﴾ مقابلی ئەو رجالانە ی محبی خباثت و فساد و خیانت بوون. قسە لە استنجاو تارەت کردن نیە! ڕەحمەت لە ناقلان بێ خۆشیان نازانن ئەڵێن چی! کەسێ بە بەرد خۆی بسرێتەوە وە یا بە ئاو تارەت بکا و خۆی خاوێن بکاتەوە، چجێی ئەوەیە خوا مدحی بکا؟ وە تعبیری بە رجال بداتەوە؟ بەڵێ ئەگەر ئەوە مقابلی دیانەکانی بێ تارەت بێ، ئێ واللە قبوڵە! بەڵام محل جیاوازە! (سید رشید) نە ی توانیوە ڕدی روایات بکا، بە مجبوری حملی تطهیری کردیتە سەر طهارەتی ڕوحی و بدنی! الحق جێی

طهارەتی بدنی نیە! جێی طهارەتی ڕوحیەیە نفسیەیە لە هەمو شائبەی کفرو شرک و نفاق و تفرقە و خیانت! لە بعضێ روایات ئەڵێ عرضی ڕسولیان کرد: (ئەو طهارەتەمان، لە جوولەکان وەرگرتیە). و اعجب منە (نیسابور) نقل لە بعضێ ئەکا: (تطهر لە گوناهان بە «نە خۆشی تا هاتن»، پەککو بەڵای لێدا ئەو نوعە تفسیرە! ئەوان خوا لە دەرحەقیان ئەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾ حبی خوا، خوا خۆی ئەیزانی، اما ئێمە آثاری ئەبینین، وە ئەزانین خوا منفعل و متاثر نابێ، ئێمە با خەریک بین ئەوەی موجبی رضای خوایە بیکەین، نەکەین بەسەر و پۆپری یەک دابدەین لە سەر تاویل و تفویض خلفی و سلفی! ﴿أَفَمَنْ أَسَّسَ﴾ دای مەزراندبێ بناغەی ﴿بُنْيَانَهُ﴾ خانوو عمارەتی خۆی، یا دروست کردنی. ﴿عَلَى تَقْوَى مِنَ اللَّهِ﴾ لە سەر پەر هێزلە خوا ﴿وَرِضْوَانٍ﴾ لە سەر رضامەندی الاهی! بۆ رضای خوا کرابێ داندرابێ! ﴿خَيْرٌ﴾ چاکترە. ﴿أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَى شَفَا جُرُفٍ﴾ لە ڕۆخی کەندالێ، چالێ! ﴿هَارٍ﴾ قەلشتبێ، هاها الان دەمێتر برمێ! ئائائا ئەوا کەوت! ﴿فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ لەبەر تقواو ناری جهنم، مەلایان خلافیان هەیە، ئەو بنایە حسیە یا معنویە؟ لای من تێکەڵاویە، چونکی مقصدی أصلی رضای خواو حفظ لە شقاوتی اخرویە! ﴿وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ بە مقصد ناگەن! دائرەی سوء بۆ خۆیان ئەبێ ، خۆیان ئەکەونە داوی خۆیان. طبیعی ئەو خانوەی بناغەی سست بێ، زوو بەسەر صاحبیا ئەڕوخێ! ئەوەی بناغەی محکم بێ چاک دامەزرابێ، زۆر دەوام ئەکا! مقابلەی مصادماتی باوو باران ئەکا! خۆی ئەگرێ، صاحبی حفظ ئەکا! و علی الإطلاق سستی بنیان لە سستی صاحب بنیانە! ئەودوو نوعە بانی یە قط وەک یەک نابن! ﴿لاَ يَزَالُ بُنْيَانُهُمُ﴾ مصدری بنا مفعولە! ﴿الَّذِي بَنَوْاْ﴾ دایان مەزراندبوو. ﴿رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمْ﴾ نفاقیان تیا ڕواوە، بە هدم و احراقی ئەو مبنایەش لانەچوو نە فەوتا، لە دڵیاندا دائماً ئەمێنێ! ﴿إِلاَّ أَن

﴿تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیان پارچە پارچەبێ، چیی تیا گیرنەبێ! خلاصە تانفاقیان زائل نابێ چاویان لەدووی ئەو مسجدە (ضرار)ەیە، امێدیان بەامدادی (راهب)ی طریدو شریدە! (سید رشید) لەبەر (لایزال) بۆ ئەو استثنایە تفسیرێکی وای کردووە، زۆر بە جدیر و لایەقی نابینم! دوایێ دیم تفسیری (ریبە)ی بە حسرت و بە غیظ کردیە، زۆرم لا باش بووا ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ بە هەمووشت، بۆ هەمووشت! ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ المتطهرین، الخالصین! ﴿أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم﴾ لەرێی خوا بەختی بکەن. ﴿بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾ جێگای دڵ گوشا و فرح افزا، حیاتێ بە سعادەت، لەگەڵ ثروت و سامانێ لا ینقطع و لایتناها! ئەگەر بە حقیقەت تەماشاکەن قازانجی اهلی ایمانە یەک بە ملیون بەڵکو زیاتر! ماڵی کەم و هیچ و چڵکی دەستێ زوو خلاص ئەبێ، ئەڕواو، ئەچێتە دەستیتر، ئەفەوتێ! حیاتێ محدود، پڕ لە الم و کدر، خاصە لە و ایامە حیات دەردێکە بۆ مؤمن، مەرگ دەوایەتی! (پاپیون) طبعا ایمانیان بەو بیع و شرایە نیە! اما متشیخەکانی ئێمە ئەڵێن: (چت لە سەر بیع و شرای الهیە؟ بەهەشت ئەهاوێینە مناقصە، اما چ مناقصە؟ ڕەزیلانە، بێ تام و تافە و بێ قیمەت! ( وە بعضی صوفیەی ڕاستی، لە وانە عجایب ترن، لووت بە بەهشتدا نائێنن، بەس لقایان ئەوێ! مع انە أعظمیان بە قەدەر ادنی ی صحابان خذمەتی دینیان نەکردیە! اما (شیخی عربی) ڕدیان ئەکا، قسەو ادعایان تسفیە ئەفەرموێ! ڕەحمەتی خوای لێبێ! کەوابێ مؤمن ئەوی بیکا، بەماڵی خوای، بۆ خوای ئەکا! ظاهر وایە ئەو بیع و شرایە، پێشی ئەو ڕۆژەبێ! وەآیاتی کریمە ئەوەندە مسرودو مرتب و منتظم و متصلن، ڕێی اسبابی نزولی نیە! ﴿يُقَاتِلُونَ﴾ بە نفسی خواو بەماڵی خوا! حتا لەگەڵ ڕۆم و فارس، خۆفیان نیە! ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لەرێی خوا، بۆ عداوت و استلاو تجبر، نا! ﴿فَيَقْتُلُونَ﴾ ئەکوژن ﴿وَيُقْتَلُونَ﴾ ئەکوژرێن، مصون نین هەرئەوان دوشمن بکوژن! لێشیان، بکوژرێ! مراد لە

آیت دیاره، لازم نیه ئەوەی بکۆژێ، بکوژرێ! ئەوەی بکوژرێ، نەکوژێ! ممکنه پێش خۆی کوشتبێتی! ﴿وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا﴾ ثابت و مقرر و محقره! ﴿فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ﴾ لە سەر زوبانی موسی و عیسی و محمد علیهم الصلاة و السلام. (تورات) ضایع بوو! (انجیل) اساسا تدوین نەکرا! ماوەتەوە (قران) ام الکتاب، ئەوخۆیەتی! ﴿وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ﴾ حاشا هەتا خیال ئەکەی و فێ بالعهده، له وەفا کەس ناگاتە خوا! فی الحقیقة مسڵمانانی صدری اسلام وەفایان به عهدەی خۆیان کرد. ﴿فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ﴾ پێی کیف خۆش بن. حقیقةً ترس و هەوەسی نفسی لێ بگەڕێ، جێی بشارەت و کیف خۆشیه، گەر ماڵە گەر حیاته زائل ئەبێ ئەڕوا ئەفەوتێ! ئەگەر لەو ئوغرەدا نەڕۆن، بێ بدل و پاداش دەچن، خۆڕای و بۆف! ﴿وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ چ فوز وەک ئەوه گەورە ئەبێ؟ مقابلی شتێ که نابێ الا ئەبێ هەر بفەوتێ، نائلی ئەو نعمەتە عظیمە ئە و ماڵە چاکه ببی! وه ممکنه (ذلک) اشاره بێ بۆ استبشار! چونکێ علامتی ایمانێ زۆر محکم و اتمه! وه ایمانێ هکذای، فوزێ أعظمه! بەڵکو فوز هەر ئەوه! باقی ثمرەی ویه! ﴿التَّائِبُونَ﴾ لە فتوری لە قصوری. زاتاً ئەوەی حبی چاکەی هەبێ هەرچی بیکا، نظر به چاکتر بە مختلی ئەزانێ، بە مقابلی ئەوه تۆبه ئەکات. ﴿الْعَابِدُونَ﴾ به إخلاص بێ شائبەی شک و شرک و ریاء! ﴿الْحَامِدُونَ﴾ سوپاسی خوا ئەکەن لە سەر کەم و زۆر لە سەر خۆشی و نا خۆشی. ﴿السَّائِحُونَ﴾ سیحەت ئەکەن ئەگەڕێن بۆ نە فعی قومی خۆیان، ئەوەک (راهب)ی شرید بۆ وێرانی داروديار. وه تفسیر به (صوم)یش کراوه. ﴿الرَّاكِعُونَ السَّاجِدونَ﴾ پشت کووڕن بۆ اطاعەت، گەردەن دادە و سەر لە عەردن، منقاد و متواضعن، بۆ حضرەتی کبریائی! یاخود رکوع و سجودی نوێژ، یعنی به تەواوی ئەیانکەن! ﴿الآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ﴾ بە چاکە. طبیعی خۆیان ئەیکەن، ئە وجا امر به خەڵک ئەکەن. ﴿وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ بەو

گوێرەيە. ﴿وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللّهِ﴾ خاصةً حدودی جزائیە! اقامەی ئەکەن، میل و محاباتی تیا ناکەن! هەی هاوار بۆ حدودی شرعی اسلام! لە هیچ کوێێ بەراستی اجرا ناکرێ! لەگەڵێ أقطاری اسلامیە بالکلیە ترک کراوە. مقصد وا نیە کلی فردێ لەو مؤمنانە، ئە و هەمو صفاتەی تیا جمع ببێ! حقیقةً بعضێکی مشترکی عامە، بعضێکی خاصە. ﴿و﴾ لدی الایجابە ﴿بَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەو نوعە. ئەدی عکسی؟ ئەمانە، (لا بشری لهم!). زاتاً ئەوی کەڵکی دینی اسلام بگرێ لای خواو رەسولی خوا بە مؤمن حساب بێ، ئەوانە ن! ﴿مَا كَانَ﴾ شایان نەبو ﴿لِلنَّبِيِّ﴾(ﷺ) ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ﴾ بە ڕاستی! ﴿أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ فضل لە پناه بۆ بردنیان. ئەگەر (ابو عامر) ڕاست با لە سەر دینی حنیف با، ئەوانەش مؤمنبان، بەڵکو انسان، پەنای نەبر▬ بەر مشرکی (ڕۆم)، ئەوانیش ترصدیان نەدەکرد! ﴿وَلَوْ كَانُواْ﴾ ئەو مشرکانە. ﴿أُوْلِي قُرْبَى﴾ خزم بن. ﴿مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ﴾ نبی و مؤمنەکان. ﴿أَنَّهُمْ﴾ مشرکەکان. ﴿أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ لەسەر شرک ڕۆیشتین. ئەڵێن ئەو آیتە لەحەق (ابو طالب) نازل بووە، (حسین بن فضل) ئەمە بە دوور ئەزانێ! زێرا (ابوطالب) سێ ساڵ پێش هجرەت وەفاتی کردیە! وە ئەو سوڕەتە لە اواخری (مانزل بالمدینە)یە. (واحدی) دفعی ئە و استبعادە ئەکا بە وجهێ غایت مستبعد! عجایب لە (سنی) و شیعی) شەڕیانە لە سەر ایمانی (ابوطالب)، کفر ئەوا استیلای جهانی کرد، احکامی دینی لغو بوو، حالاش شەڕە لە سەر (ابو طالب)! خۆزیا لێی گەڕابان خۆو وخوای خۆی! ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ﴾ وەکی مەلایانی شراح ئەڵێن: (جوابە بۆ سؤالیکی مقدر). با وجودی (ابراهیم) ابو الانبیایە صاحبی دینی حنیفە، استغفاری بۆ باوکی مشرکی کردووە! بەڵێ، بەڵام استغفاری حضرەتی ابراهیم بۆ باوکی نەبووە ﴿إِلاَّ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ﴾ کە فەرموی (لأستغفرن لک). ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ﴾ بۆ ابراهیم ﴿أَنَّهُ﴾ باوکی ﴿عَدُوٌّ لِلّهِ﴾ مشرکە ﴿تَبَرَّأَ

منْهُ﴾ قطعی علاقەی لەگەڵ کرد، فضل لە استغفار! وە آیەتیش فەرموێ: (بعد التبین) بۆ نبی و مؤمنین نیە استغفار بۆ مشرکان بکەن، (فلایرد الإعتراض أصلا) تامل! ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾ هەر معنایێ بۆ (اواه) ئەفەرمون لە کتبی لغەت و تفسیر، مناسبە لەگەڵ حاڵی حضرەتی ابراهیم! اما اوفق بە مقام، معنای (رقیق القلب)ە، دڵ نەرم دڵ متاثر! وە تفسیری بە ئاه و ئەندوە لێ دراوە، زۆر جوانە! و لو مجازیش بێ! بعضێ ذەواتی نادر الوجود بوین، وە زۆر بە ڕحم بوین دەرحەق بشر، کە بشریان لە ذللەت دادیتبێ، خاصة ذللی عبودیەت مقابلی حیوانێ وەیا جمادێ! نێزیکە لە تاوان دڵیان پارە پارە ببێ! دائم بۆ بشر، خصوص بۆ قوم و عشیرەتی خۆیان زۆر محزون بوین، لێکدا لێکدا ئاهو حسرەتی غەمو ئەندۆە هەڵئەکێشن! وە لەبە ر ئەو تاثرەش بە حلمن خۆگرن هەڵناچن ڕق نایان گرێ، بۆیە حضرەتی (خلیل) مقابلی بابی باو جودی دروشت خویو دروشت گۆی، دوعای بۆ دەکرد! وەک حضرەتی ڕسالەت کە لە شەڕی (احد) خوێنی لە ڕووی مبارەکی ئەسڕیەوە، دوعای مغفرەتی بۆ ئەو گرۆهە متجاسرە ئەکرد، ئەوە مختاری (زمخشری)یە! یاخود با وجودی ڕەحمی تاثری بەسەردادەباری، کە زاناندنی باوکی عدوی خوایە، آبای لێ کرد! ئەوەش مختاری (جمهور)ە!

لای حقیر هەردوو وجە باشن! اول نظر بە پێش تبین! ثانی، پاشدان! ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ﴾ وەکی ئێوە ایها المؤمنون! ئارەزو ئەکەن دوعای غفران بۆ مشرکینی ڕابردوو بکەن، یا بۆ ئەو منافقە مشرکانە خائنانە کە احواڵیان بۆ ئێوە نومایان بووە! ﴿حَتَّى يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ﴾ لە قول و فعل. بیانێ ئاشکرا! ئەوجا پاش ئە و نوعە بیانە ئەگەر خۆیان نەپاراست، االعیاذ باللە، بۆ وادی گومراهی سەر نشێو ئەبنەوە! ﴿إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ سرو علن.

لە (ابن) نقل ئەکەن ئەو آیتە نازل بووە لە وقتێ فدیەیان لە ئەسیرانی (بدر) وەرگرت، ئەڵێ: (نەدەبا فدیە وەرگرن، تا اذن ئەدرێن)، خودایە! خۆت بە هەموشت عالمی! ئەزانی ئەو قسە بێ معنایە! ئەوەی لەوی فەرموبویان بۆی، مناسب و کافی بوو بۆی، زێتر هەڵناگرێ! وە پچرینی لەوەی لەوەێ، وجهی نیە! دواێ تفسیری (سید رشید)م دیت، رمزێ ئەکا بۆ تاویلی، بە لام هیچ نیە! ﴿إِنَّ اللّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ لە بڵند و نەوی شریکی نیە شریک قبوڵ ناکا، لە شرک خۆش نابێ! ﴿يُحْيِـي وَيُمِيتُ﴾ مادی و معنوی جسدی و ڕوحی. ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللّهِ﴾ هەرچەند قوم و عشیرەتێ زۆرتان هەیە، اما بۆ ئێوە کە اهلی ایمانن، نیە، غیری خوای! ﴿مِن وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ﴾ رابطەی قرابت لە بەینی ئێوە، ایمانە! مؤمن هەموی بران! ولی و ناصریان، خوایە! ئەوەی تبری لە خوای واحد بکا، ئەبێ ئێوەش تبرای لێ بکەن! وەک خوا تبرای لێ ئەکاو لێی خۆش نابێ! زاتا مشرک خۆی رابطەی قطع کردیە! ﴿لَقَد تَّابَ اللهُ﴾ اما چ تۆبە؟ ▪ عطف و عنایەت و مرحمەت؟ ﴿عَلَى النَّبِيِّ﴾ المعصوم، خاوێن لە هەمو گوناهان! ﴿وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ﴾ مطیع و فەرمان بەردارو منقاد و تسلیم. ﴿الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ﴾ نە تەنها ئە و ساعەتە! بەڵکو هەمو ساعاتی تەنگی و ناخۆشی تەماشای گەرم و ساردی، دووری و نێزیکی، عزەت و ذللەت، خشونەت و لینتی عیش ناکەن! هەمو وقت فەرمان بەرداری علی الراس والعینن! ئان زیادە هونەری وان لە ساعەتی عسرەت لە متابعە و خۆ نەگرتن ﴿مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ﴾ بووە وەبویتە باعثی زێدە عطفی الاهی! لە وانە جمعێ تەواو مەیلی نەچوون بکەن وە اسبابی موجە و معقوڵ دەرمیان بکەن، اصلا ئەوانە اعتباری پێ نەکەن، منتظری امرین، حقا هونەرە متانتێ فوقی متانتی جبالە! ئەو فرقەیە نێزیک بوو دڵیان ژەنگاری بێ، بەلام — لە الحمد- دڵی خۆیان صاف کرد نە یان هێشت

ژەنگی لێ بنیشێ، ئەڵبەتە ئەوەش حور و کورەی ئەوێ! بۆیە ئەفەرموێ ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيهِمْ﴾ ڕووی ڕەحمەتی تێ کردن. ﴿إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ لە کمالی رافت و ڕەحمەت دایە بۆ ئەو دڵ ژنگاوی نەبوانە! وە الا وای بە حاڵیان! ﴿وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ﴾ (کعب بن مالک، هلال بن امیە، مرارة بن الربیع). ئەوسێ زاتە مسڵمانی باش بێ نفاق بوون، نەچوون بۆ جهاد، کە پێغەمبەر هاتەوە، هاتنە خدمەتی ڕاستیان عرض کرد، بە غیری تەمبەڵی هیچ عذری تریان نەبوو! ئەوانە بوون (مرجون)ی لأمر اللە بوون! تەماشای نظمی قرآنی کریم بکەن! چفاصلەیێکی هاویشتێ وە بە چنوع لە چمرتبەیێ عطف و نگاهی مە ڕحەمەتی تێ کردن! ئەو زەواتە حیرم کرابوون، حتا ژنی خۆشیان نە یان ئەویستن قسەیان لەگەڵ نەدەکردن. (هلال و مرارە)کەم ئەچونە دەرەوە اما (کعب) ئەچوە مزگەوت نوێژی لە خزمەت پێغەمبەر ئەکرد ئەیگوت: (سلامم لە رسول اللە ئە کرد وەتەماشام ئەکرد، بزانم لێوی مبارکی ئەخولێتەوە بە جوابی سلام! کە تەماشای پێغەمبەرم ئەکرد، ڕووی وەر ئەگێڕا. کە چاوم دادەنواند، تەماشای ئەکردم). حاصڵی لە حاڵێ زۆر ناخۆش دابوون! ﴿حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾ فی الحقیقة، (خندەی گول دردی سر میآورد آزوردەرا) ئەوە [illegible] لە دڵی تەنگ بێ، دونیا تا واسعتر بێ، لای تەنگ ترە، سعەتی دونیا تابعی سعەتی قلبە! (سم الخیاط)ی مع الاحباب میدان! ﴿وَضَاقَتْ عَلَيهِمْ أَنفُسُهُمْ﴾ خۆیان لە خۆیان بە تەنگ هاتبون. خۆیان لە سەر خۆیان بارێ گران و مورثی دڵ گوشین بوون. انسانێ دەردە دار و فقیر و حالات لە خۆنەوە شاوەی وەک من، ئەزانێ چۆن نفس لە سەر نفسی خۆی تەنگ دێت لە خۆی، خۆی وەرز ئەبێ، ئەبێتە ثقل و بارگرانی! ئەوە، ثمرەی نهایەتی دڵ تەنگیە! خودا ڕەحمێ بە منیش بکا، وەکو ڕەحمی بەوان کرد! ﴿وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيهِ﴾ لە هەمو کەس محروم بوون، ئومێدیان بە کەس نەما، ببێتە پەناوپشتیان، غیری خوا! خوایە خۆت ئەزانی منیش الان

وەهام! ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيهِمْ﴾ لە پاش ئەو زەحمەتە، خوا بە ڕەحمەت گەڕاوە سەریان، التفاتی پێ کردن! خوایە، خوایە! منیش منیش منیش! ﴿لِيَتُوبُوا﴾ دفعێتر تخلف نەکەن! ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ یا تواب و یارحیم! تب علي! وارحمني! و وسع علی فی الدنیا و الاخرة! ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بەڕاستی! ﴿اتَّقُوا اللَّهَ﴾ لە خوا بترسن، خۆتان بپارێزن لە غضبی! ﴿وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ معیتی وصفی، یعنی ڕاست بن! بنۆڕنە ئەو سێ زاتە محترمە! ڕاستیان فەرمو، نائلی چەدەرەجەی بوون، بە خصوصی آیتیان دەربارە وارد بوو! ئەوانە ی درۆیان کرد ودرۆ ئەکەن، مهمل مان! بەڵام جەنابی حەق سابقا بیانی فەرموو: (کێ معذورە لە تخلف؟) وەبێ شک صاحبی وحی، بەدرۆیان هەڵناخەڵەتێ! فتامل ولاتکن من الغافلین! واقعاً نظر بەجهەتی خواو ڕسولی، صدق لە هەموشتێ باشترە، مایەی نجاتە! اما لەزەمانی سیاسەتی حاضرە، ئەوەی کەڵکی بۆ صاحبی نەبێ، بەڕاستی، ڕاستیە! بۆیە شریعەتی اسلامیە لە بعضێ مقام، ڕێی خلفی داوە!

لەو صادقانە مراد اشخاصی مخصوصە نیە! ئەمە دیارە! (سعید بن جبیر) و (ضحاك) ئەڵێن: (مع ابی بکر و عمر). (ابن عباس) و (ابو جعفر) ئەڵێن: (مع علي). هێشتا قسەی (ابن عمر)ی چاکترە ئەڵێ (مع محمد و اصحابە). بەڵام خطابی (یا ایها الذین آمنوا) شاملی هەموان و ئی هەموو عصرانە! ﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ﴾ شایان نەبوو. ﴿وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الْأَعْرَابِ﴾ ای مسڵمان. ولو حسب الظاهر فکریان دروست و موجە و مقبول و معقول بێ وە قت ناموساعید اسباب نا تە واو ڕێ دوور دوژمنێ قە وی! دەوڵەتێ معظمە، کثیر العدد، تام العدد، لەسەر جێ و ماوای خۆیان، وەلەگەڵ ئەوەش نەدەبا ﴿أَن يَتَخَلَّفُوا عَن رَّسُولِ اللَّهِ﴾ ئەو بچێ بۆ حرب، ئەوان چۆن خۆیان ئەگرن؟ ئەگەر خۆی نەچوبا، هەر نە یسە! فی الجملە جێی دەغدەغە و پرتە پرتی دڵ وبن لێوی هەبوو! بەڵام کە خۆی تشریفی

برد، بۆ ایمان داری ڕاست، جێی توقف نامێنێ! ئە وانە نەدەبا تخلف بکەن ﴿وَلاَ يرْغَبُواْ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِ﴾ ایثاری نفسی خۆیان لە سەر نفسی پێغەمبەری نەکەن! چۆن دڵیان بەبەر دەوەستێ ئەوان لە ژێر سایە بە استراحەت دانیشن، پێغەمبەر لەبەر هەتاو لە مشقەت و ناڕاحەتی دابێ؟ وە میل و محبتی خۆیان ترجیح دەن بەسەر میل و محبتی رسولی اکرم؟ ﴿ذَلِكَ﴾ بۆ چی فضل لەمە مؤمن ئەبی ڕسولی کبریائی لە خۆی و خۆشەویستی خۆی خۆشتر بۆێ، استراحەت و خۆشیشی ترجیح بدا لە سەر استراحەت و خۆشی خۆی؟ ﴿بِأَنَّهُمْ﴾ بۆێ ئەوان ﴿لاَ يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ﴾ تێنوایەتیان ناگاتێ! ﴿وَلاَ نَصَبٌ وَلاَ مَخْمَصَةٌ﴾ ماندوو بوون و مشەقەت و برسیاتیان ناگاتێ ﴿فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ لە ڕێیخوا! ﴿وَلاَ يَطَؤُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ﴾ پێ لە موقعێ دانانێن کە پێ دانانی وان لەوێ موجبی قینی وان بێ، وەک غەزای (تبوک) چوونی ڕسالەت پەناه بۆ ارضی عدو، لە وێ مانەوەی مدەێ، لاشک موجبی غیظیان بوو، وەهەراس و ترسی لە دلآ پەیدا کردن، قووەتی ڕسالەت پەناهیان لا معلوم بوو! ﴿وَلاَ يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ﴾ هەر دوشمنێ بێ! دیارە دوشمنی وان، دوشمنی دینە! ﴿نَّيْلاً﴾ بە کوشتن یا ئەسیرو تالآن کردن یا طعن لێدان! هەرچی بێ، پێی بگەن لەوان! ﴿إِلاَّ كُتِبَ لَهُم بِهِ﴾ ئەنوسرێ بۆوان، بە کلی لەوانە ی ذکرکران! ﴿عَمَلٌ صَالِحٌ﴾ موجبی رضای خودا ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ زۆر بێ، یاکەم، چاکەی چاکان بە خۆڕای نابا و نادا! ﴿وَلاَ يُنفِقُونَ نَفَقَةً﴾ شتێ کە صرف بکرێ. ﴿صَغِيرَةً وَلاَ كَبِيرَةً﴾ گچکە و گەورە ﴿وَلاَ يَقْطَعُونَ وَادِيًا﴾ شیوە ، دۆڵە، ئەویش گەورە و گچکە، زۆر صعب المرور بێ یاکەم. ﴿إِلاَّ كُتِبَ لَهُمْ﴾ بۆیان ئەنوسرێ، ثبت ئەکرێ. ﴿لِيَجْزِيَهُمُ اللّهُ﴾ تعالی بە فضلی خۆی! ﴿أَحْسَنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ کەم بە زۆر، گچکە بە گەوریان بۆ ئەنوسێ. ئەوان تەماشای گرانی و سووکی ناکەن ،ڕوو لە خوا، لە ڕێی خوا، ئەڕۆن! خواش هەمویان بە احسن و اغلا و اعلی و اشق و اکثر و اکبر، ئەنوسێ! ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ

لِينفِرُواْ كَآفَّةً﴾ بۆيان نە بووە لە سەريان واجب نەبوە و نيە، هەمو بچن بۆ جهاد! جهاد فرض الكفايەيە لە سەر اكفاء! وە قەدەری كفايەت واجبە، لە جهاد لازمتر و انفعتر هەيە، كە تفقه و تعلمی دينە! ﴿فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ﴾ فرقەیێ گەورە، لە عشيرەت، لە اهلی شار! ﴿طَآئِفَةٌ﴾ جماعە تێ تەواو بەقەدەر حاجەت و كفايەت لە اهلی لياقەتە. ﴿لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ﴾ مؤمنەكان گشتيان بزانن، تێبگەن و تێبگەێنن! ياخود (ضمير) بۆ طائفەيە، لەبەر ﴿وَلِيُنذِرُواْ﴾ ئەوانە ی تفقهی فی الدينيان بووە. ﴿قَوْمَهُمْ﴾ قوم و قبيلەی خۆيان، ﴿إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ﴾ طائفە بۆ ناو قوم، يا قوم بۆ لای طائفە! ﴿لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ ئەو مسلمانانە ی كە پێيان ناكرێ تحصيلی علمی دينی بكەن، بە ارشاد و تعليمی فقهاكانيان، دينی خۆيان بێغل و غش بزانن! خۆيان بپارێزن لە سۆی دونيا و قيامەت. ئەوەی دينی خۆی ئەزانێ، طبيعی نازانێ خۆی بپارێزێ لە نەكردنی مامور بە وكردنی منهی عنە! ئەوانە ی قابليەتيان هەيە بۆ مەلايەتی لازمە تحصيلی علومی دينی بكەن! ببن بە رجالی دين! سياسی دينی! مقصوديان حقيقەتی دين بێ! نەك مذهب و طريق تفقه بكەن و بەس! اولاً مەلايەكان لەگەڵ يەك دوشمنايەتی نەكەن، خۆيان و اتباعيان بە دقايق و رقايقی مسائلی مخيلە مشغوڵ نەكەن! بەڵكو بە دينێ سهل، ڕووحێ لطيف و نشيط، سايقی الی العمل، جالبی نفع، دافعی ضرر مشغوڵ بكەن! طلبی علم معذرتە بۆ نە چوونە جهاد، لە بەر فضلی لە مەيانی معازيری سابقە، ذكری نەكرد! اما بۆ نا اهلان، نا! وەك زەمانی سابق لە وەختی حكومەتی (عثمانی) گەلێ نانەواو امثاليان لە دەفتەری طلبە مقيد بوون، امتحانيش نەبوو، بە فرۆفێڵ دەردە چوون لە عەسكری! گەلی اهلی علميش لە بنباری عەسكری دا، ئەمردن! گواييا لە وەقتی خۆی لە دەفتەری (رديفی) ناويان بە طلبەی قيد نەكرايە! بەڵێ، قبل كل شيء كونوا مع الصادقين! ئەبايە مسلمانان زۆر بەر حذر بن لەوانە ی تراس فی الدين ئەكەن، مقاصد و منوياتيان بزانن، بەلام سوادی

أعظم طبعیان موافقی منافقەکانە، بە قسەیان هەڵ ئەخەڵەتێن، ڕووحیان لە ڕێ یاندا دائەنێن، لەبەر ئەوە تفرقە و فسادی دین زۆر بوو، بە ناوی دین احزاب زۆر بوون، بوون بە دوشمنی دین، ئاگایان لە دین و دوشمنی دین نەما! ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ﴾ ئەوانە ی دەورو پشتی خۆتان، لێتان نێزیکن، مانعن لە نشری دەعوەت، لەگەڵ وان شەڕ بکەن بیان کوژن ڕێ بکەنەوە! ﴿وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً﴾ توندو تیژێ مەردانە، بێ نەرمی و خنوثەت. ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ حتا لە حاڵی غلظە تیش‌دا. زاتاً ئەوە هونەرە! هەرشتێ حدێکی هەیە، لە افراط و تفریطی، خۆپاراستن لازمە! امر بە غلظەت لە حاڵی حرب، خاصةً بۆ قەومی عەرەب لەو عصردا، چونکی لە نظر هەمو امم و هەم جیواریان، ڕۆم و عەجەم، بێ حورمەت و قیمەت بوون، بەڵکو محقر و مهان بوون، نەرمی بۆ وان، حمل نەدەکرا سەر حسنی سیرەت و خلق، حمل ئەکرا سەر بێ مایەی و بێ قەدری، بەڵام پاشی استلایان طبعا ئەوە نامێنێ! تەماشاکەن شدید البطشێ وەک (عمری فاروق) معاملەی چۆن بوو لەگەڵ اهلی شام و قدس، چەند نەرم بوو چەند رەفیقانە بوو! من غلظەتم لەگەڵ غیرە دینی ناو خۆمان، لا خۆش نیە!، احترامی اجانبم، لەگەڵ دەسەڵاتا، لاقیمەتدارە! لە بێ دەسلاتی پێی ناڵێن احترام! انسان چاوی لە لطفی وانە! لە حربی عمومی کە قائدی فرنسی داخلی شام بوو ووتی: (معاملەی فاروق و صلاح الدینی ایوبی دەرحەق بە اجانب چۆن بووە، ئەمڕۆ لە پاداشی چاکەی وان، معاملەی ئێمەش لە حەق مسڵمانان، وا ئەبێ!). بەڵێ قورەی دەعیە دەماغ و شکیش خراپەی تەواویان‌دا، بۆ دار و دیاری اسلام!

﴿وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ﴾ اوامرو نواهی و تکالیف و مشاقی تیا بێ، خاصة مشتمل بێ بەسەر اموری کەلای وان محالە، وەک فتحی (سوریە) مثلا ﴿فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ﴾ لە منافقانە. کەسێ کە ئەڵێ ﴿أَيُّكُمْ﴾ ئەی حضاری کرام! ﴿زَادَتْهُ هَـذِهِ﴾ ئەم سورەتە، بەو محتویاتە! ﴿إِيمَانًا﴾ ئەرێ زیدەی

کردیه بڕوای؟ ئەمە ئەبێ؟ ئەو قسانە، ئەفسانەن! لە مجانین ناوە شێتەوە، چجایێ ڕسولی خوا؟ ئیمە لە کێ؟ ڕۆم و فارس لەکێ؟ ئێمە استلای ملک و تاج و تەختی وان بکە ین؟ ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بە ڕاستی و دروستی. ﴿فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ لە غایتی ظروف و احوالاتی دوور، لە دەوری شکۆە و استلا، لە نهایەت ذل و بێ دەسڵاتی، وەک شەڕی (خندق) مطمئن القلوب، بێ شک و شبهە و فرت و پرتی دڵ، بڕوا ئەکەن! ﴿وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ بە نوید و موژدەی فتح و فتوحی الاهی!

مقصد لە زێدەی ایمان، زێدەی قووەتیەتی! بێ شبهەیە ایمان لە قووەت دا زیاد ئەکا تاکو صاحبی سوق ئەکا بێ گرفت و خۆ خوراندن، بۆ اطاعە و اعمالی صالحە، تا ئەبێ بە ملکەێ غیرە قابل الزوال، هیچ قووەێ لە قوای شهوية معارضەی ناتوانێ بکا، بەسەر هەمو قوایێک غالب ئەبێ! و بالعکس، کەم ئەکا ضعیف ئەبێ لە بن قوای حیوانی ئەکەوێ، مغلوبی ادنی میلێ ئەبێ! طبیعی ئەو ایمانە لە معرضی زەوالە، خۆو طالعی، ئەگەر بمێنێ! زێدەی ایمان، بەزێدەی متعلقاتی، لێرە موضوعی بحث نیە! وەجێی نزاعیش نیە! ئەگەر تقلید لێ گەڕێ، انسان بە وجدان ئەزانێ، لە خۆی درکی ئەو زێدە و نقصە، ئەکا!

(سیدی آلوسی) کۆنە شافعی – پاش نقلی مذهب شکر لە سەر ئەم فکرە مایەوە، قول بە زێدە و نقصان ئەکا! وکذا (سید رشید) ڕحمەتیان لێ بێ لە و مقامە تفصیلاتێ جوانی هەیە! علمای منطق بۆ ضروری درجاتیان داناوە، لە اولیان تادێتە سەر متواترات. و من العجايبی بعضێ لە منکرینی زیادە، تقسیمی یقین ئەکەن بە سێ مراتب: علم الیقین، عین الیقین، حق الیقین.

﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ نفاق و کفر ﴿فَزَادَتْهُمْ﴾ سورەتی منزلە. ﴿رِجْسًا إِلَى رِجْسِهِمْ﴾ دیارە کفریش وەکی ایمانە! شدەت و ضعفی هەیە! ئەڵبەتە کفریان زیاد ئەکا بە امری (فاليجدوا فيكم غلظة) غلظە لەگەڵ ڕۆم،

محار بە لەگەڵ دەوڵەتی (ڕۆم) پەکو! ئەوە بە خیاڵی کێ دادێ؟ ﴿وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ رجس، بۆ رجس، بەسەر رجس دائەخەن. وامحکم ئەبێ، ئەبێتە کیفیەتێ ڕاسخی ممنوع الزوال، وە لە سەر کفر ئەمرن، اصلا آیات و عبر و سور تاثیریان لێ ناکات! ﴿أَوَلاَ يَرَوْنَ﴾ نابینن؟ نازانن؟ یا نایان بینن ئیوە؟ بنا لە سەر قراءتی (حمزە، یعقوب، ابیە بن کعب) بە (تا)ی خطاب! ﴿أَنَّهُمْ﴾ ئەو منافقانە. ﴿يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ﴾ لە کلی ساڵێ لە ساڵان امتحان ئەکرێن. ﴿مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ﴾ کرارا و مرارا بە انواعی بەڵاو مصائب. یاخود لە سەر ظاهری خۆی بێ، اختبارە کە با بە نصرەتی رسول اللەبێ! بۆ تەماشا ناکەن رسول الله لە چحاڵێ گەیشتە چحاڵێ؟ چەند ضعیف بوو، چۆن بە قووەت بوو؟ دفعی دوشمنی کرد! بلادی مسخر کرد! علی الأقل ساڵی جاری دووجار جهادی ئەکرد! بە انواعی امدادی الاهی موفق ئەبوو آیات و عبر دەر ئەکەوت. ﴿ثُمَّ لاَ يَتُوبُونَ﴾ لە سەر ئە و حاڵەش تۆبەیان نەئەکرد! ایمانیان نە دەهێنا. ﴿وَلاَ هُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ یادیان نەدەکرد، بە خاطریان دانەدەهات بیکەنە مایەی اعتبار.

﴿إِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ﴾ سورەتی هکذای، وە ئەوانیش لەوێ بووبن کە رسول الله ئەیخوێندەوە ﴿نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ﴾ ئەو منافقانە! ﴿هَلْ يَرَاكُم مِّنْ أَحَدٍ﴾ لە مسڵمانان، تا خۆیان بدزنەوە. دیارە واحاضری مجلسی رسالەت پەناه نەبوین، کە مسڵمانان بە ظریفی بیان بینن. پێیان ناخۆش بووە کە حضرەتی رسالەت بیان بینێ! خاصة سورەتێ بیانی حاڵی منافقانی تیابێ. ﴿ثُمَّ انصَرَفُوا۟﴾ لە جهەتی مجلسی نبوی. ﴿صَرَفَ اللّهُ قُلُوبَهُم﴾ لە ایمانی وەرگێڕا بوون بە مقتضای میلی خۆیان. ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَفْقَهُون﴾ تێ نەگەیشتین، لە حماقەت یا لە غفڵەت!

﴿لَقَدْ جَاءكُمْ﴾ ئەی قومی عەرەب! ﴿رَسُولٌ﴾ اما چرسول! بە حەق رسولی رب العالمین! ئەو رسولە ﴿مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ لە خۆتانە! عەرەبە! لە ملتی اجنبی نیە! با شعبی جوایەز بێ، اصلا یەکن! یا لە انفس و اکرم و

انجب الشعبی ئێوەیە! ﴿عَزِيزٌ عَلَيهِ﴾ گرانە لە سەروی، ﴿مَا عَنِتُّمْ﴾ پێی ناخۆشە مکروهات و سیئاتی ئەنجام خراپ، وەک ژێردەستی و مذللەتی عەرەب بۆ اجانب! ئێوە مەگەر حستان نە ماوە درکی ئەو گرانیە بکەن! ﴿حَرِيصٌ عَلَيكُم﴾ بۆ اصلاحی شاننتان تاماون. قابلی تداوین، سعی ئەکا بۆ زیندو کردنەتان، استقلالیەت و حریت و سەرکەوتنتان! ﴿بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ علی الإطلاق، عەرەب و غیرە عەرەب، یا لە بەر مناسبەی مقام لە عەرەب! ﴿رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ نابینن؟ خۆی شریکی مشاقە! بەڵکو زێدە گرانی بۆ خۆی دادەنێ! بۆ استراحەت، ترجیحی خۆی لە سەر مسڵمانان ناکا! بە هەمو وجە لە هەمو جهات زێتر لەوان تێ ئەکوشێ. ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ ایمانیان نەهێنا، ڕوویان وەرگێڕا ﴿فَقُلْ﴾ ئەی رسولی بەحەق! ﴿حَسْبِيَ اللّهُ﴾ بە ضایعم نادا، ناصرو معینمە! ﴿لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ﴾ چخوای ترنیە نصرەتی اتباعی خۆی بدا لە سەر تو! ﴿عَلَيهِ تَوَكَّلتُ﴾ فیما ارجو و اخاف لە نێک و بدی کارها! ﴿هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ خوداوەندێ گەورە، صاحبی سریر و اریکە، لە ملک و حکمداری بێ شریکە، ئیمە لە زللەتدا ناهێڵێ، گەورەمان ئەکا، ئەمانکاتە صاحبی عرش، ئەو عرش و تەختی فارس و ڕۆم و امثالیان ئەداتە ئێمە! وەعدەی الاهی هاتەجێ، بەڵام عەرەب حفظی ئە وعرشەیان نەکرد! جەنابی حەق، بە کە رمی خۆی، اعادەی مجدو عزی اسلام بکاتە وە![1]

[1] - تەواو بوو سورە تی (توبە) لە ڕۆژی جمعە ١١ ماهی *فرالخیر ١٠ نیسانی ڕۆمی ١٣٥٦ هجری قمری، ١٩٣٧ میلادی.

## سورەتی (یونس)

﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾

سورەی (یونس) مکیە، مدنیە، یەکمان لە سەر نە کەوتیە! آیاتی (١٠٩) یە یا (١١٠)یە، عدد چەندی بێ، دەعوای لە سەر ناکەین! اهمی مقصد لە و مقامە زانینی مناسبەیە! گەلێکی وەک (یونس) کەوتونە ناو زگی حووت، تاریکیان بەسەر داهاتیە، درکی مناسبەیان نەکردیە! حتا زاتێ وەک (سیوطی) کە لە رجالی اعرافی علم و تدقیق و سیما ناسینە، بیانی مناسبە، لە بەینی ئەو سورە تەو سورەتی (اعراف) ئەکا، کانە ئە لێ: (جێی ئەم سو رەتە، دوای اعرافە!).

﴿الر﴾ ئاگادار بن! گوێ ڕاگرن! لە﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ﴾ قرآن! ﴿الْحَكِيمِ﴾ شت لە موقعی خۆی دادەنێ. ئەم کتابە زۆر مرتبە، منتظم و محکمە، لە طرف خوداوەندی حکیم. نازل بووتە سەر ڕسولێ ڕؤف و ڕحیم، کە لە نهایەتی سورەی (توبە) فەرموی: (لقد جاءکم رسول من انفسکم....الآیة) حقیقةً ئەمە خاصة بۆ عەرەب، مایەی شکر و منت داریە! حضرەتی باری لە وان، بۆوان، ئەو ڕسولە هکذائیەی ناردیە! ئەبوایە بە کمالی سرور و نشاط، فوجاً فوجاً، بێن قبولّی دینی بکە ن! تابعی فەرمایشاتی ببن، اهتدا بە هدایەتی بکەن، وەهەم مسارعە بکە ن بۆ هدایەت دانی ملتی تر، چبۆ سەر (ڕۆم) چبۆ سەر (فارس) خودگیری نەکەن، اصلاً منافقیان لە بەیندا نەبێ. بە لام مع الأسف بە تەواوی وانە بوو! ئەو قووەت و قدرەتێ حضرەتی رسالەت پە ناە بۆی پەیا کردن، معظمی لە خۆبە خۆی صرفیان کرد.

ئەمەش بوو بەسببی تاخری انتشاری دین و گەلێ فساداتی تری لێ ترتب بوو. ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ﴾ عەرەب ﴿عَجَبًا﴾ تعجبێ انکاری چۆن ئەبێ خوا انسان بە رسالەت بنێری بۆ سەر انسان؟ وەهەم تعجبیان کردیە لە ﴿أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَى رَجُلٍ مِّنْهُمْ﴾ لە نفسی خۆیان لە انفسی خۆیان، بۆ میلتێ زیند و وحساس و بە انیەت، لە مە خۆشتر نیە هەموشتی لە خۆی بێ، خاصة شرایع و قوانین! هەر ملتێ لە قوانین احتیاجی بە ملتێتر هەبێ، لای من بە مستقل حساب نیە! استقلالی تام و ناجز نیە! زۆر خۆش ئەمەیە: (حکمی خۆت، خۆت، بەسەر خۆت، اجرای بکەی) بە لام ملتی مردوو ئەو نوعە حسیاتەی نیە! ﴿أَنْ أَنذِرِ النَّاسَ﴾ ئەوان، یان عام، ئەگەر ایمان نەهێنن. ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ بە ڕاستی و دروستی، ﴿أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ سابقە و تقدمیان هەیە لای خوای خۆیان، سابقەی خدمەتیان گووم نابێ، لە سەر ڕاستی ثابت قدم بوو ون! بۆیە لە دونیا و قیامەت (یوم تزل الأقدام) ڕاوەستاویان ئە کا، هەڵنازەلن، قدم صدقیان بووە سببی (ید الله فوق ایدیهم). ﴿قَالَ الْكَافِرُونَ﴾ لە قوم وعەشیرەتی خۆی، بۆ تنفیری عالەم! ﴿إِنَّ هَذَا﴾ ئەو پیاوە ﴿لَسَاحِرٌ مُّبِينٌ﴾ نازانم زانیویانە سحر چیە؟ امامی (رازی) و گەلێ مەلایان ترفهیان لێ کردیە، اما حقیقەتی، بێ شبهە، لایان مجهول بووە! ئەگەر ساحریان، بە تەمامی ئەیانزانی! کە ئەو رجلە ساحربێ، دیارە کتێبەکەشی سحرە! بناءً علی ما حررناه، بۆ اهلی نظر دەر ئەکەوێ، کەئەو سو ڕەتە لە نهایەت إتصال و إنتظامە لەگە ڵ سورەتی سابقە، کانە تفسیر و شرحە بۆ آیەتی (لقد جاءکم)، وە آیەتی (لقدجاءکم) بۆ نهایەتی (توبە) زۆر زۆر نهاية النهایەت مناسبە! گەرچی زاتێ وەک (سید رشید) وانازانێ، ئەفەرموێ: (لەگەڵ حاڵی مکە مناسبەی هەیە وە رب العرش العظیم) — وانیە وەک لە آخری سورەت عرض کران، ئەمە بشارەتە بە بشارەتێ عظیم!) خاصةً قبوڵی توبە ی قومی (یونس) لەگەڵ (توبە) چەند جوانە! لە بەر مناسبەی قومی و توبە، باسی یونسی تیایە! بە مقابلی رسول، لە

مياني رسل، له موقعێ مناسب، باسی (يونس) ئەكا! سبحان الله له و قرآنه چحكيمە! چ ڕوحێكی خالصە! جنة مكان (سيد رشيد)بە مناسبەی وحی تفصيلاتێكی زۆری ايراد كرديه له بعضه كتابی فرنسی دائر بە احوالآتی صاحب الرسالة خاتم الرسل مقبول و مردود تحريراتێ عجيبی نوسيوه لايەقی مطالعەيە، هەر وەک له آخری سورەی سابقه دائر به حسب و نسبی سيد الكونين و خلاصەی مندرجاتی سوڕەت زۆر قسەی بە قيمەتی ثبت فەرمووە، با ئەمە بۆ محشی بێ انشاء الله ترجمەيان بكا! من ئەوەندەتان عرض ئەكەم مستشرقينی ئەورۆپی نظر بە قديس و قسيسەكان باشن زۆر تاريخ تێک نادەن، نوعا ما منصفانه قسه ئەكەن، وە فائدەشيان بووە، سۆی ادبيان دەربارەی سەروەری كائنات اهون كرد، گەلێ درۆو افترای نامعقولی قسانيان بۆ ملت دەرخست. بەلآم ڕەگەشينكەيان نامرێ، كۆنه مسيحی كۆنه وە ئنين، دلّيان دەربارەی رسولی اكرم بە تەواوی خاوێن نابێتەوە، خۆيان تجريد ناكەن لە نزاعات، اما درۆيان ئەكەن خەلّكی هەلّئەخەلّەتێنن. وەئەوانە ی انكاری نبوەتی (محمد)(ﷺ) ئەكەن بەو معنايەی كەلە (نبي) ئەدەنەوە، ڕاستە! اصلا (محمد) مطرب و رقاص و سازندە و نەوازندە نەبووە! وە بەمزخرفی هدايەتی خەلّكی نەداوە! بە ڕاست و ڕوان، ئەمە چاكە، ئەوە خراپە، هدايەتی داوە! وبالجملە اورووپيون علی الإطلاق لە عليهی دينی حەق و اخلاقی فاضلی بشرين! وەميلی سوادی أعظم له اولادی آدەم، موافقيانە! بۆيە ئەتوانن (دانسيان) لێ بكەنه فنێ له فنونی جميله)! ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ﴾ علويات ﴿وَالأَرْضَ﴾ سفليات. ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ خلقێ بە كاوە خۆ لە ظرفی شەش (طور) هەر طورێ خوا ئەزانێ چەند دوورو درێژ بوە! كەس نەبوو، نه له اول نه له اوسط نه له آخری اوقاتی خلقی سماوات و ارض، ندی بێ، يا شريكی بێ! ﴿ثُمَّ اسْتَوَى﴾ پاش تەمامی خلقی اصول و گەلێ نتايج، اعتدالی بوو ﴿عَلَى الْعَرْشِ﴾ بێ اضطراب و ئەندێشه له شريک و معارض و مهاجم، بێ ماندی بوون. عرش

گەورە اریکەیْ خوداوەندی و حکمڕانی یە، استوای لە بۆ استلقای نەبووە وەک یهودی ئەڵێن! ﴿يُدَبِّرُ الأَمْرَ﴾ بە ڕاحتی، بە ڕعتدال و خۆشی، بێ ترس و هەراس محارب، بێ شریک و ظهیر و نصیر و ولد و خزم. کاران ڕێک دەخا، هەموی لە تێ فکرین و علم بە عاقبەت و غایتی بوونی، ﴿مَا مِن شَفِيعٍ﴾ (فی الدارین)، کەس نیە تکا کاربێ، فضل لە مجبرو مکابر، ﴿إِلاَّ مِن بَعْدِ إِذْنِهِ﴾ چ اذنی تکوینی یا تشریعی، ئەوانە ی ئێوە عبادەتی دەکەن لیاقەتی هیچیان نیە جمادانن. ﴿ذَلِكُمُ اللّهُ﴾ ئەوەی بەو نوعە و صف کرا ﴿رَبُّكُمْ﴾ الاهی ئێوەیە. ﴿فَاعْبُدُوهُ﴾ (وحده)، بێ اتخاذی شفعاء! فی الحقیقة ئەوانە ی اعتماد ئەدەنە سەر شفاعت معتقری خۆیان مقصدیان بەرەڵلابونە لە قیدی عبادەت. ﴿أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ﴾ لە پاشی ئەو ذکر و بیانەش تذکر ناکەن؟ تەماشای ملکوتی سماوات و ارض ناکەن؟ الاهی خۆتان ناناسن؟ ئەمە حقاً جێی تعجبە! ﴿إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ مؤمن و کافر، بر و فاجر، گەڕانەوە هەر بۆلای ئەوە، مبدا و منتهی هەرئەوە، کێ هەیە بە تەمای بن لە ڕۆژی جزا نجاتتان بدا؟ خوا وەعدەی بەگەڕانەوە داوە لە سەر لسانی رسل بە بشر گەیشتوە. ﴿وَعْدَ اللّهِ حَقًّا﴾ شبهە لە حقیەت و صدقی وعدی الاهی نیە، ئەگەر اساساً عقڵیش ڕێی پێ نەبا، سمعاً واجبە قبوڵی کەین. حتا بوت پەرست ایمانیان بە جزا هەیە آلهە بە شفعاء ئەزانن. ﴿إِنَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ جێی انکارو استبعاد نیە، ئەوەی خلقی کردیی لە عناصری مختلفە، ئەتوانێ ذراتی اصلیت گردکاتەوە بیکاتەوە بە هیکەلێ وەک هیکەلی پێشوو! لکن اعادەی معدومی صرف، محاڵە! چونکە اعادە نیە، خلقێ جدیدە! اعادە ئەبێ لە کەرەستەی کۆن و سابق بێ، یا قسمێ لەو هیکە لە صەد جار بوبێتە خواردن و خواردنەوە، لە خوا بزرنابێ! ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ بِالْقِسْطِ﴾ بە عدالت، بێ نقص. وادەر ئەکەوێ پاداشی ایمان و عملی صالح، بە عدلە، لە عدلە! اصحابی ئێمە

ئەفەرمون بە فضلە! یا وابێ! زاتاً عدلی الاهی فضلە! بۆ جزای حسنە یەک بەدەیە علی الاقل، وەهەم ئەزاندرێ موجبی اعادە عدلی الاهیە! فی الحقیقە انسانێ وەکی پێغەمبەری، وەکی صدیق و فاروقی، وە کی ابراهیم و موسی ی • وەکی افلاطون و ارسطوی، وەکی غزالی و رازی، وهکذا سائری سەرامەدان کە قیمەتی هەریەک لەوان دونیا و مافیهایە بفەوتێ بە خۆڕای بڕوا وەکی حیواناتی عجم، ئەمە نەک بێ عدالەتیە هەرقط نابێ! حتا طبیعەتیش نابێ وابکا! ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ خاصةً ائمەی کفر و فساد و امحای فضائلی بشری، نەژێتەوە عذاب نەبینێ، چۆن ئەبێ؟ ﴿لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ﴾ شرابی حمیم چەند ملائمی حالی کافرە! حمیمی دۆستە، کانە لە ڕووی دۆستی انسانی خانە وێران ئەکا! ئەوانە ی کە مایعاتی ناریە ئەنوشن، سەر گەرمی بادەی محبتن! ﴿وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ﴾ بە مقتضای قوەتی کفریان کەیفیان بە ایلام و ئازادی ضعفاء ئەهات، ئاگر بارانی شارو دێهاتیان ئەکرد، دەهەزار پیر و شەل و کوێر و سقط و ژن و مندالی معصوم و بێ دەسەلاتی تیابوو. ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً﴾ ڕۆژ وەک ڕۆژ دیارە، حاجت بە تعریضی خیالی ناکا؟ ضیا بە ڕووناکی زاتی ئەلێن، یعنی لە خۆیەوە بێ! ﴿وَالْقَمَرَ نُورًا﴾ مانگیش رەوشنە (نور) ڕوناکیە کە لە غیرەوە بێ. ئەلێن لە لغة مترادفن! (زمخشری) ئەلێ ضیاء اقوی ترە لە نور، مشهورە (نور القمر مستفاد من الشمس)ی. علمای جدید ضیایان چاکتر دەرخستوە بە عملیات کە لایان حجەتێ قاطعە، لە الوانی سبعە ضیاء پەیدا ئەکەن، گەرچی تجربە لای مەلایانی ئێمە علم نادا، اما لە حقیقەتدا دەلیلێ باهرە! ئەمڕۆ لام وایە کار بە دەرەجەێ گەیشتوە ئەگەر ئەو رواسایانە ی دینمان زیندوبان اعترافیان ئەکرد مسالەی استفادەی نوری قمر انکار ناکرێ! احتمالاتێ مەلایانی ئێمە ئەی فەرمون لەوهم و خیالیشانە ماون! اهلی تقویم خبر لە بون و نەبونی کسوف و خسوف ئەدەن، لای خۆمان یا لای امریکا

یعنی تحت الارض و بعبارة اخری لە شرق و غرب پار رۆژ کەمێ گیرا، وەتقویمی ایران ئەیکوت نحوستی تا بیست مانگیی تر دەوام ئەکا، ووتم مادام وابێ ئەبێ سالّی آتی رۆژ نەگیرێ، ئەمسالّ لە تقویمی نوێ ووتی لە جهەتی ئێمە یعنی فوقانی رۆژ و مانگیش ناگیرێ. من بڕوا ناکەم بە سعد و نحسی کواکب و احوالاتیان بۆ ادارەی معنوی عالەمی ارضی، وە زۆر بەبێ معنای ئەزانم! بەلّێ ئەگەر بلّێم نحس هەیە نحس النحوس انحس الکائنات کورەی ارضی خۆمانە! (سید آلوسی) مناقشات و مجادلاتێ زۆر ایراد ئەکا، اما مقصدی بەس اظهاری قوەتی ایمان و اعتقادە! بەلّام دوائ کەمێ اهونی ئەکا! خلاصە کەمم دیوە لە علمای دین و لو زۆریش متبحر و متفنن بووبێ بە إنصاف لەگەلّ حکمایان قسەی کردبێ، و علی الاغلب بە سلاحێ کە لەوانیان وەرگرتیە، شەڕیان لەگەلّ ئەکەن! ﴿وَقَدَّرَه﴾ ئەفەرمون لە بۆوی بۆ حرکەی وی. ﴿مَنَازِلَ﴾ ئەو منازلە بۆ شمس نیە! زێرا غیری خۆی چیتر نابیندرێ تا بەوگوێرەیە ناوێکی لێ بنێنن، ئەو منازلە بیست و هەشت منزلە، هەریەک بەناوی ستارەێ ناونراوە تفضیلی لە کتبی معیئتە. ﴿لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾ زاناندنی عددی سالّ و اوقاتی عبادات و معاملات بۆ عموم ربطی بە مانگ موافقە، حسابی شمسی قید و بەندی پێ ئەوێ، حتا بە دورانی قمر، حسابی شهور و اعوام، لە ژێر قطب ڕا ئەگیرێ! ﴿مَا خَلَقَ اللّهُ ذَلِكَ﴾ شمس و قمر بەو حالّ و کیفیەتە. ﴿إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ بێ هوودەنیە، حیاتی دونیا، نظامی کون و فساد، پێی ئەوێ!! بۆیە خلق نەکراون بیان پەرستن، معانە بە صەد هەزار دەرەجە لە فرقی معبودەکانی ئێوەن! خلقی وانە، بۆ عبادەت، خلقێ باطلە ناموافقە!! بۆ ئێوە مسخرن لە طرف خالقی بەرحەق!! ﴿يُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (الایات) آیاتی کونیّە. خوارق هەرچی بێ ناگاتە ئەوانە. (شمس) آیەتێ واعظیمە بۆ منظومەی خۆی حقاً باهرە! مسافەێ واپان و بەرین لە (عطارد) تا (نبتۆن) منوّر ئەکا، بە

مـدّەیّ غایـتکـەم شـعاعی مـسافەیّ سـیّ صـەد سـال ڕیّ بـە حرکـەی شەمەندەفەر ئەبڕیّ! ﴿إِنَّ فِي اخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ لە خطی استواء نێزیکی تساویە، لە آفاقی مائلە وەقتـیّ ڕۆژ درێـژ ئـەبـیّ شـەو کـورت ئـەبـیّ، وقتـیّ بالعکسە، لەو کورتی و درێژیە آفاق مختلفە تا حواڵەی قطب، لـە ژێـر قطب بە تەواوی اخـتلاف تبـدلی ئـەبـیّ، ظهـور و غیبـەتـی شـمس لـە دەورەیّ تـا نصفی ادواری سنوی ئەبیّ، تحت القطب ساڵێکی ئێمە شەو ڕۆژێکی شمـسی وانـە. ﴿وَمَـا خَلَـقَ اللّـهُ فِـي الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ زۆریّ بـۆ علمـای (فلـک) و (طبقـات الأرض) معلومـە. ﴿لآيَـاتٍ﴾ (لا تعـدو لاتحـصى). ﴿لِّقَـوْمٍ يَتَّقُـونَ﴾ خۆیان بپارێزن لە میلی فاسد و احمقانە، باریّ هیچ نەبیّ وەک (نمرود) بـن، بهت حاصل کەن! بە ادعای کاذب و لاف و گەزاف فسۆس پا لەوانانـە قـسە نەکەن، بە ناوی کرامت و تقربی الی اللەی و ولایت، دین بە فـساد نـەبـەیـن! خۆیان بپارێزن لە شرک و ضلال، بـۆ خـەڵکـی خۆیـان کـەرو کـافر نـەکـەن! ئەلێن (عیسی) خالقی سماوات و ارضە، یاخود علی مکور اللیـل و النهـارە! هەمو کشفی طریق خوا بە قوربانی علمی هێنەتیکا! هـەر علـم خۆیـەتـی!!! (الأرض أرضي و السماءُ سمائي)، نازانم بڵێم چیە؟ قسەییّ چـەپانـەیـە! بـە هیچ زوبانیّ نازانم تعبیری بدە مەوە! فلان بە ڕۆژی ووت ڕاوەستە، ڕاوەسـتا! مەبادا بە تاریکی شێخ حضرەتی بچێتەوە شار! ووتی: ئاوابە! آناً ئـاوا بـوو، بووە تاریکی!! ئایا (شێخ) سعات لەیەکی شەو چوو با ناو شار چ دەقـەوما تا خوا نظامی عالەمی بۆ تێکدا؟ سەیر ئەمەیە ایمانیان بە سعەتی قـدرەتـی الاهی زۆر واسعە! بەڵام بۆ حەق و حقیقەت نیە! بۆیّ بە استخدامی کـەن بـۆ عجایبـان و غرایبـاتی شـێخان. بعـضە مـەلا سـبب بـە تربیـەی منـدالی، بـە گەورەیش، ئەم خرافاتانەیان لە دەماغ دەرناچیّ! بەڵکو پفیان کردە کە ڕەنا مێشکی گەلیّ کەسیان برد و تێکدا. ئەوەی بە حەق ایمانی بە قرآن هـەبـیّ، ئەزانیّ نە لە خلق نە لە تـدبیر شـریکی نیـە، بـەس عائـدی خوایـە، وە هـیچ

كەس لە شاني الاهي سهمی نيە! وە ئەمەشتان عرض دەكەم هەرچەند كشف و كرامەتی اوليايانی ئێمە هەيە، ناگاتە كشفی كهربا و رادێو، وە هيچي بۆ ئەمرۆي امة، كە ڵكی نەبوو! بالعكس مضر بوو، والسلام علی من اتبع الهدی، هەرچی ئەڵێن با بڵێن!!!﴿إِنَّ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءَنَا﴾ توقع و امل وظن و خوفی لقای گەيشتنە لای ئێمەيان نيە. ايمانيان بە زيندو بوونەوە بالكليە نيە، يا تمام نيە! اتكاليان لەسەر شركا و شفعايە! ﴿وَرَضُواْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ مع انە حياتی زۆر پر اكدار و غەم و المە، دەردێكە شفای مردنە! ﴿وَاطْمَأَنُّواْ بِهَا﴾ بە حياتی دونيا ساكن النفس بێ دەغدەغەن، دلخۆش و سەرخۆش. ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَا﴾ كونيە و لفظيە. ﴿غَافِلُونَ﴾ ئەمانەشی وەكی سابقەكان ئاگايان لە لقای خوا نەماوە. ﴿أُوْلَـئِكَ﴾ هەمويان. ﴿مَأْوَاهُمُ النُّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ پشت و پەنايان ئاگرە، استعمالي موادی ناريە ئاگری كردە ماوايان. ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ (منە المبدا و اليە المنتهی) ئوميديان بە لقای خوا زۆرە وە ئەترسن ﴿وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوەی بە مكان و زەمان بخونجێ. ﴿يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ﴾ بۆ زێدەی. كە ايمان صحيح بوو، ئەبێ بە نورێ كلی سعات رێی بۆشتێ پێ ئەبا، فوقی ئەوی پێشو، نەك بۆ قيامت، بۆ دونياش! هدايەتيان ئەدا بۆلای خۆی بۆ حياتێ اعلی، لە دارالسلام! ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الأَنْهَارُ﴾ جۆو جۆبار. ﴿فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ شكر احتياجيان بە باران نيە! گاە گاە زۆر ببارێ وەك پار هەمو دەغل و دانی شكاند ژەنگی لێدا بێ كەلكی كرد، گاە گاە وەك ئەمسال كەم ببارێ مارتمان لێ بووە هاوين وەخت بوو دەغل و دان هەموی هيشك بێ دارو درەخت بە زۆری بەری فرێدا دەردە دار بوو. ئەو باغاتی وا جوان و خۆش و بێ ئافاتە، پاداشی ايمان و عملی صالحە! لە نظر حقير هەر ايمان زۆر بە قيمەتە، بەلام مقصد بۆ إنتظام و حسن معيشەت و ترقی، عملي صالح غايت لازمە! و حقيقةً ئەگەر تەماشا كەين عملی صالح، مقتضاي ايمانی بێ

غشه. ﴿دَعْوَاهُمْ﴾ دوعایان، ادعا و طلبیان. ﴿فِيهَا﴾ له بەهەشتدا ﴿سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ﴾ یا الله پاکی بۆ تووه! له هەمو نقص، مقدس و منزهـي، وه شـرکیش بۆ خوا، زۆر نقصه! ﴿وَتَحِيَّتُهُمْ﴾ خۆ به خۆی، یا ای خوا و ملائکەت بۆوان. ﴿سَلاَمٌ﴾ حیاتێ بێکدورت، بغض و حسد و حقد و غل و نفاق و حرص و طمع، به امن و ئاسایش، حتا ئەوانەی له دونیا یەکتریان نەویستوه، سلام لێک ئەکەن، ژەنگیان له دڵا نەماوه! ﴿وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ﴾ مقصدیان مطلبیان. ﴿أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ چۆن له اوڵەوه ووتیان: (الحمدلله رب العالمین) که تصدیری کتابی حکیمی پێکرا، آخریش هەر ئەمه ئەلێن، هەر ئەوەیان ئەوێ، چ نعمت نیه نەبێ و طلبي‌کەن! وه ئەو هەمو نعمت و لذائذه له تسبیح و تحمیدیان غافل ناکا، بەڵکو لایان الذه! اشتغالیان هەر بەئەوه. گەلێ کەس له کامل الإیمانان له دونیا له زەتی روحی و عقلی مشغولیان ئەکا له شهوات و لذائذي جسماني و حیوانی، فکیف له دارُالسلام!! ئەو ذەواتی کرامه، به حیاتی دونیا راضی نەبوون، دڵیان دائم له دەغدەغه و لێکدان بووه، به دل و جان ئارەزوی لقای خوایان بووه، نائلی ئەو حیاته و تحیاته بوون، خوا به نصیبمانی بکا!! تفسیري (دعوي) لای قومێ به دوعا کراوەتەوه، (سیدي آلوسي) بۆ توجیهي زۆر سعی فەرمووه، بعضێ تفسیری ئەکەنەوه به عبادت ئەلێن: (مقصد نفي عبادەته)، وه له طرازی ئەوه ووتراوه: (ممکنه معنای «دعوی» دوعا و سؤالبێ)، خۆدیاره ئەوه سؤال نیه! کەوابێ مراد، نفی سؤاله! زێرا ئەوەی طلب بکرێ، هەیانه حاجەت به سؤال نیه!! و علی کل بۆ ناظر دەر له هەر دووسه را سبحانک والحمدلله رب العالمین. ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ﴾ ئەوانەی رجای لقای خوایان نیه بۆ تکذیبی رسول و استهزاء ئەلێن: (ئەگەر راست ئەکەی بازوو خوا بما نگرێ بەرده بارانمان بکا،، ئەوانه استعجال به شرک ئەکەن، بەرغبەت و شوق و ئارەزوێ تەمام. ﴿إِسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ﴾ چونکی به وجدانی

خۆيان امين بووون لە عذاب و عقاب. مفسرينى نحوى لێره معناىتر ئەفەرمون وه منع و رديان لە بەينا جارييە، تەماشاى تفسيرى (روح المعاني) بكەن! خلاصەى معنايەكە ئەو عبارەتە ئەيگەيێنێ: (وَلَوْ يُعَجِّلُ اللهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ تَعْجِيلَهُ بِالْخَيْرِ). حاصلى ئەگەر خوا تعجيلى شرى بۆ كردبان ﴿لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾ ئەبێ ئەو اجلەى مقرَّر لا يتقدم و لأيتاخريان بەسەرا انفاذ بكرێ، خۆئەمەش ممكن نيە! ﴿فَنَذَرُ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا﴾ تعجيلى عذابيان ناكەين، تاجيلى ئەكەين، لێيان ئەگەڕێين ﴿فِي طُغْيَانِهِمْ﴾ هەستانيان وەك لافاو ﴿يَعْمَهُونَ﴾ دڵ كوێر ئەبن. ﴿وَإِذَا مَسَّ الإِنسَانَ الضُّرُّ﴾ على الأكثر انسان بێ صبر و تحمله، عند الشدائد ئەنوزێتەوه ئەپاڕێتەوه. ﴿دَعَانَا﴾ ولو مشرك بێ! بۆ لاداني، بەس لە خواطلب ئەكا! ﴿لِجَنبِهِ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا﴾ ئەمە، نوعە اضطرابێ بدنيە، تابعى اضطرابى سەخڵەتى دڵە! گاه لەسەر تەنيشت ئەكەوێ، گاه دادەنيشێ، گاه ڕا ئەوەستێ، بێ قرار و ئارامە، لە هەمو حاڵيش لەبەر خوا ئەپاڕێتەوه ﴿فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُ﴾ زۆرى وا ئەبێ خوا بەڵاى لەسەر لائەدا ئەكەوێتە خۆشى ﴿مَرَّ﴾ ئەڕوا تێ ئەپەڕێ بە نوعێ ﴿كَأَن لَّمْ يَدْعُنَا إِلَى ضُرٍّ مَّسَّهُ﴾ مبالاتى بە خوا نامێنێ. خوا ئەيزانێ ئێمە ئەو حاڵەمان ديت لەگەلێ كەس سالى قحط و بەلاى عالەمى، گەلێكى بە هەزار مشەقەت و ئەم لاو ئەو لاو سؤاڵ و صدقە، لەوێ گوێچكە نانێ، لە لاىتر فرە شۆرباى، تاكو نجاتى بوو، پاشيەك دوو ساڵ كەوتە زفاهيە تێ تەواو، حالى گرانى، لە فكرنەما! دەعيە و كبرو انانيەت و اسرافى لە حد بەدەر بوو! ﴿كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ﴾ متجاوزانى لە حد، نفقە و غيرە نفقە. ﴿مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ حاصلى انسان زۆر سەيره! لە عجايباتى مخلوقاتە! بە لاف و گەزافە، بێصبر و تحمله، ماضي خۆى لە فكر ئەكا، ايامى ذلت ناهێنێە بەر چاو، عبرەت ناكا. رۆژێ لە اطوارى بعضێ كەس دڵم زۆر تەنگ بوو ووتم: (خوايە! ئەوا لە دونيا علاج ئەكرێ بە مردن، لە صحبەتى

بشر نجاتمان ئه‌بێ، اما له آخره‌ت چی بکه‌م؟ بچمه به‌هه‌شت هه‌ر انسانی تیایه، بچمه جهنم_ العیاذ بالله_ پڕه له انسان، ئه‌وجا چی بکه‌م؟). وه‌گه‌لێ جار ئه‌لێم: (حقاً انسانی چاک له هه‌مو کائنات زیتره، انسانی خراپ له هه‌مو حیوانات خراپتره کمتره!). خوای تعالان به حورمه‌تی اشرفي کائنات ره‌حمێکمان پێ بکا!!!

لام وایه بشر قط وه‌ک ئه‌و عصره تێک نه‌چووه ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ ایها العرب! یا امة الدعوة! ﴿لَمَّا ظَلَمُواْ﴾ بێ ئه‌ندازه. ﴿وَجَاءتْهُمْ رُسُلُهُم﴾ قبل الهلاک! ﴿بِالْبَيِّنَاتِ﴾ ادله‌ی دال له‌سه‌ر صدقیان ﴿وَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ﴾ له شان و استعداد و قابلیه‌تیان ده‌رچوبوو. ﴿كَذَلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئێوه‌ش به‌ر حذر بن أیها المجرمون! ﴿ثُمَّ﴾ دوای وان، زۆریش دوور بوو ﴿جَعَلْنَاكُمْ خَلاَئِفَ فِي الأَرْضِ مِن بَعْدِهِم﴾ خلیفه و جێ نوشینیان. ﴿لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾ ئه‌وا ڕسولێ پاک و خاوێن بێ غل و غشمان له خۆتان هه‌نارد، ئه‌گه‌ر ایمان بێنن باشه، وه الاّ هلاکتان مقرّه‌ره! ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ﴾ قومی عه‌ره‌ب، یا امتی دعوه‌ت. ﴿آيَاتُنَا﴾ ئایاتی قرآنی حاوی به‌سه‌ر ئایاتی اکوانی ﴿بَيِّنَاتٍ﴾ ئاشکرا، به‌ئاسانی تێی ئه‌گه‌ن. ﴿قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا﴾ املیان نیه، انه که‌یفیان به ملاقاتی ئێمه نایێ، ئه‌وانه ئه‌لێن: ﴿ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا﴾ قرآنێکی تربێنه! ﴿أَوْ بَدِّلْهُ﴾ ئه‌و ئایاتی ئێمه پێمان ناخۆشه بیگۆره! مقصدیان وه‌ک (آلوسي) به تَرَجّي ئه‌فه‌رموێ الزام و استهزاء به‌ڕسول بووه، نه ایمان علی تقدیر الأجابة! (سید رشید)یش زیده تفضیلي داوتێ!! ﴿قُلْ﴾ له جوابیان. ﴿مَا يَكُونُ لِي﴾ که ئه‌من مرسلم. ﴿أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي﴾ بۆمن نیه، غیره ممکنه، به رای و اجتهادی خۆم بیگۆرم! اتیاني قرآنێتر، هه‌ر هیچ!! ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ﴾ خلافي (وحي)، محاله بلێم! ﴿إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي﴾ گوناهێ بکه‌م، ◘ جایێ تبدیلي وحي الاهي!! ﴿عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ لاشک ئه‌بێ رسول له هه‌مو که‌س زیاتر له

مرسلی خۆي بترسێ لە طرف حفظی (ما ارسل به)، حاجت بە توجیهی نا وجیەنیە! خۆی ئەفەرموێ: (أنا أعْرَفُكُمْ بِالله و أخْشاكُمْ منْهُ)، دیارە عذابی یوم عظیم، عظیمە! زاتاً عظمەتی لەبەر اهوالیە!! ﴿قُل لَّوْ شَاءَ اللَّهُ﴾ ئەگەر حەزی کردبا من قرآن بەسەر ئێوەدا نەخوێنمەوە ﴿مَا تَلَوْتُهُ عَلَيْكُمْ﴾ لەو عبارەتە تعلقی مشیەت بە (انتفا) ملاحظە کرایە! ﴿وَلاَ أَدْرَاكُم بِهِ﴾ علمی ئێوەی بە قرآن حاصل نەدەکرد، یعني مني نەدە هەنارد بە ڕسالەت! قرآنی نازل نەدەکرد، ئێوەی لەسەر جهالەت دەهێشتەوە! ئەو علوم و حقایقی کە لە قرآندا هەیە، بە ئێوەي فێرنەدەکرد! بەڵام ارادەی تلاوەتی من و تعلیمی ئێوەی کرد! قرآنی کریمی نارد، بەو نوعە کە ئەیبینێ، من تبلیغي ئێوەی ئەکەم، بلا تبدیل و تحریف و زیادە و نقصان!! ﴿فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا﴾ عمرێ درێژ. ﴿مِّن قَبْلِهِ﴾ پێشی نزولی قرآن، ئەمناسن چ نوعە پیاوێکم! تا ئەو وەقتە چم ئەکرد، بەچی مشغول بووم؟! ئایا لە زومرەی شعراو متتفنان بووم؟ یا لە گرۆهی خطبا و کهنان بووم؟ یا تابعی هەواو هەوس، یا خیالیون بووم، ئەوەی بێتە کەللەم، دوای کەوم، هەرچی بادا باد، یا تخیلات تاثیرم تێبکا، ها ئە مرۆسبەی ئەبم بە رسول، تا ئەمرۆ بۆ ملائکەت تاخیر بوو نەهات؟، یاخود خەریکی اساطیری مزەخرەفات و درۆ و دەلەسە بوووم، انسانێ درۆزن شرتي و پرتی شتێبێ اصل و اساسی تێکەلاو بکەم؟، هەوای ملک و سلطەنەت و استیلام بوو، تا لەو پەنایە بە مقصد بگەم؟. من ئەوەم خود سەرانە بە بێ خیال و بە بێ لهوو هەوەس مقابلی عالەم ڕاوەستم! ملیون و غیرە ملیون نصیحەتکەم بانگیانکەم بۆ ڕێی راست، هەمو قوانین و شرایعیان لێ تێک دەم، شریعەتێ کامل و شامل دانێم!!! ﴿أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾ حاصلی ڕسولێکم، لە خۆتان! حسب و نسبم معلومتانە! بەچی اتهامم ئەکەن، ئەو جۆرە تکلیفە سخیفە ئەکەن؟، وەیا ئەوەندە بە بسیطی ئەزانن کە لە مضمونی سؤآلتان ناگا؟ ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ بە درۆ

ادّعـاي (وحـي) بكـا، بلّـێ: (ئـەوە وحـی الاهيـە)، يـا تبـديلی بكـا. درۆی بوختانی ئەوەيە، جهەتیڕنەبێ! ﴿أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ﴾ وەک ئێوە بە هيچی اعتبار و بروايی ناكەن!! ئەو دوو كەسە اظلم الناسن! يا يەكێ لە يەكێ اظلـمتريـێ! ﴿إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الْمُجْرِمُونَ﴾ فوزيـان نـابن، بـە مطلـب ناگـەن، ئـەمڕۆ ياسـبەی درۆزن بۆف لای دەرئەچێ! ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ﴾ ايمانی بە رسولی خوا و ئاياتی، نايێنن! ئەو رسولە، رؤوف و رحيمە! عبادەتی خوا ناكەن! ئەو خالقـە حكيم و كريم، نافع و ضار! عبادەت ئـەكـەن﴿مَا لاَ يَضُرُّهُمْ﴾ لێـی بترسـێن. ﴿وَلاَ يَنفَعُهُمْ﴾ طمعيـان پێـی ببـێ، ئـەزانـن هيچـە! ﴿وَيَقُولُونَ﴾ لـەسـەر ئـەو حالّە! ﴿هَـؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِنـدَ اللّـهِ﴾ عبـادەتـي (مَـنْ عِنْـدَهُ الـشَّفاعَة) ناكـەن! انكاری رسالەتی بشر، رجلێ لە خۆيان ئەكەن!، ئەو جماداتـەش بـەتكـا كـار ئەزانن، ئەوانە چۆن فلاحيان ئەبێ؟ بە چ روو ئەڵێن ئێمە انسانين؟ ﴿قُـلْ﴾ (ايها الرسل!). ﴿أَتُنَبِّئُونَ اللّهَ﴾ اعلامی ئەكەن، خـەبـەری ئـەدەنـێ؟ ﴿بِمَـا لاَ يَعْلَمُ﴾ بەشتێ كە خوا نـايزانێ علمـی پـێنيـە. ﴿فِـي السَّمَوَاتِ﴾ لـە عالـەمـی علوی. ﴿وَلاَ فِـي الأَرْضِ﴾ لـە عالـەمـی سفلی. لاشـک ئـەگـەر هـيچ شـريک و شفيعی بووبا، لە ئاسمان يا لە ارضی، لە جهەتێ لـە جهـاتی عالـەم، شـتێ لە كائنات وابا، خوا ئەيزانـی! مـادام عـلام الغيـوب علـيم و محـيط نـەيزانـێ، ديارە نيە!! ئێمەش و جن و ملک، هەرچی لە عالەمی امكان دابێ نسبەتيـان بە مقامی الوهيەت، يەكە! فـەرقـی نيـە (سـها)ونيـری أعظـم نيـە شـفيع بـۆ شفيعە؟ لەبەر تقرب و عبادەت! تۆش عبـادەتـی خـوا بكـە بـە قـەدەر حـاڵ، مقرب ئەبی، حاجەتت بەشفيع نابێ!! ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ حقيقـةً شفيع بەو وجهی ئەوان تێی ئەگەن، شـريكە! شـريكێكە كـە مخالفـەی ممكـن نيە!، وە (من) وە (ما) لەو مقامە وەک يەكن، جەنابی حـەق لـە شـرک و ومـا بە الشرک، منزّهە و مقدسە! شرک و شفاعەت بەو جوورە نهايەت نقـصە بـۆ حـضرەتـی كبريـائی!! ﴿وَمَـا كَـانَ النَّـاسُ إِلاَّ أُمَّـةً وَاحِـدَةً﴾ عـەرەب يـا بـشر

وەحدەتێ فطری عیشی ساذج بێ طمع وشقاق، وە هەروها هەمو امتی لە اوَّلي نشاتیان وا بووین، حتا حیوان! تەماشای (جووجیلان)کەن تا فەراقە ئەبن، چەند لەگەڵ یەک یەکن! دوایێ چۆن بەگژ یەکا ئەچن، دەست هەڵناگرن تایەکێ یەکێ ئەبە زێنێ بەسەریا غالب ئەبێ!! ﴿فَاخْتَلَفُواْ﴾ اختلافی عظیم لە حد بەدەر! ﴿وَلَوْلاَ كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەی رسولی مختار! کلمەیێ رەحمەت و لطف، کە رسل بنێرێ بۆ اتحادیان وە رفعی نزاعیان وەرێک خستنیان و اصلاحیان! ﴿لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾ بە هیلاک ئەچوون، مەحو نابوود ئەبوون. ﴿فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ تەماشای حالّي عەرەبان کەن! بێشک حضرەتی (محمد) نەبا، لە مێژبوو سبب بە خلاف و شقاق و قتل و سلب و نهب و غارەتگەرییەک، مەحوو ئەبوون! لە ناو مافیە الأختلاف، بە هیلاک ئەچوون! اختلافیان نەئەبراوە، تا ئەفەوتان!

من لام وایە معنای ئەو ئایەتە ئەوهایە!!! گەرچی ئەوانیتر بە نوعی دیکە تفسیری ئەفەرموون. بناءً علیە عەرەب ئەگەر حسیاتیان هەبا، لە ذلەتی استعباد و مصیبەتی إستئصال بترسابان، مسارعەیان ئەکرد بۆ ژێر لوای محمدی، بە کمالی افتخار و سەربڵندی!! ﴿وَيَقُولُونَ لَوْلاَ أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ﴾ بە گوێرەی مراد و ئارەزووی وان! ﴿فَقُلْ إِنَّمَا الْغَيْبُ لِلّهِ﴾ . ئەو غیبە بویتە موجبی اضطرابی أقوالی نظار. (سید رشید) اختیاری تفسیري (غیب) بە ئایەت ئەکا، بەڵام ئایاتی اعجازی هیچی لە اموری غیبیە، نیە! ئەگەر بێتەجێ، لە اموری حسیەیە! (طیبي) ئەیکاتە جواب (علی الأسلوب الحکیم)، وە (غیب) ئەکاتە إستئصال لە رەگوریشە فەوتان، بەڵام (في الحقیقة) اسلوبێ نا حکیمانەی اختراع کردیە! بعضـێ ئەڵێن (غیب) عبارەتە لە صارف یعنی صارف و مانع چیە بۆ انزالی ئایاتی مقترحە؟ خوا ئەیزانێ! ردّی ئەکەن و ئەڵێن: (صارف معلومە! چیە؟ عنادیانە!). (سیدي آلوسي)_ روّح الله روحە_معنایەکی بە خاطری مبارەکی خطور کردیە،

حقیقةً لەگەڵ معنای ئێمە بۆ ئایەتی سابقە، زۆر موافقە! بنا لە فەرمایشی ئەو (غیب) عبارەتە لەصلاحی حالی وان، انە ئەڵێن: (ئەگەر مقصد صلاحی حالی ئێمەیە، بابەگوێرەی اقتراحی ئێمە ئایەت لە طرف خواوە، بێ!، صلاحی ئێمە، بەو قرآنە، نابێ!) ﴿فَانْتَظِرُواْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ﴾ ئەبینن ئەم قرآنە چ اصلاحێ چ حیاتێ ئەداتە بشر! وەخوارقی کونیە نظر بە ئایاتی قرآنی، عادیە، بۆ اصلاح هیچ فائدەی نیە! شتێکە دێو دەڕوا، ئەبێتە حکایەت! ﴿وَإِذَا أَذَقْنَا النَّاسَ رَحْمَةً﴾ لام وایە ئەو جۆرە (ناس)ە لەو ناسانەن کە پاش کشفی (ضر) ئەڕۆن، کانە لەبەر خوای قط نەپاڕاینەوە! قاسی ترن وە لە کفرا ڕاسخن! ئەو نوعە کە خوای تعالان رەحمی پێکردن، اثري کرم و رافەتی الاهیان تام کرد ﴿مِّن بَعْدِ ضَرَّاء مَسَّتْهُمْ﴾ نەخۆشی، گرانی، بێباراني!، وەک (آلوسي) ئەفەرموێ: (حسني ادب وایجاب دەکا، نسبەتی مسی ضرّاءْ بۆ حضرەتی باري نەدرێ) وەکو حەضرەتی ابراهیم ئەفەرموێ«وَ اذا مَرِضتُ فَهُوَ یشفینی» . بە لێ وایە! حسنی ادب لازمە، اما لە طرف کەسێ کە نسبەتی اشیاء بدا بۆ خودا! لێرە قائل خۆیەتی! من لامولیە مقام وا ایجاب ئەکا وەک عبارەتی (واذا مس الانسان الضرّ) کە رابورد، زێرا مقصد بیاني حالی ئەوانەیە، پاش رفعي عذاب دەرحەق (کاشف الضر مذیق الرحمە)، حتا لە ئایەتی سابقە بۆ خاطری جوابی (فلما)ی، (دعانا)! ﴿إِذَا﴾ بێ توقف، آناً، فجاةً! ﴿لَهُم مَّكْرٌ فِي آيَاتِنَا﴾ ئەگەر ماڵە، ئەڵێ: (بەسعي و کسابەت و ضربي بازووم بەدەست کەوتووە)، گەر بارانە، نسبەتی بە انواء و ستارە و حضرەتی شێخ ئەدەن!! ئەر صحت و عافیتە، کاري با بەگەورەیە! خوا ئەزانێ ئەو نوعە انسانە لە عالەمی اسلامیەتدا گەلێ خراپترن لە کفاران! ئەوان ئەوا کافرن قابلە پەردەیان لەسەر چاو لا کەوێ دەست لە عناد هەڵگرن دڵیان نەرم ببێ، اما ئەوانە قابلەنیە، کفرە، بەعینی ایمانی ئەزانێ! حتا لەگەڵێ مەلایانی قسە حجەت

معتمد علیهان وەرگرتیە، خوا امری (کن فکان) ئەداتە بعضێ خۆشەویستی خۆی!! سبحان اللە العظیم_ خوا شانی خۆی چۆن ئەبەخشێ؟! قابلە. (انما امرة) تێکدرێ، تاویلبکرێ، لەبەر هذیاني عمر و زید!! نظر بە اعتقادی فاسدی سوادی أعظم، اولیایەکان بۆچی شریکی خوا بەڵکو لە فوقی خوانین؟ ﴿قُلِ اللّهُ أَسْرَعُ مَكْرًا﴾ بۆفیان دەرئەخا، ادعای کاذبانەیان ئاشکرا ئەکا. هەر چەند تافرصەت ذەواتەکانیان سری خۆیان و طریقیان دەرنەخەن، اما تەنکی ظەرفەکانیان، تحملی ناکەن، بێجێ دەری ئەخەن، تەرت و توونا ئەبن. ﴿إِنَّ رُسُلَنَا﴾ حفظەی، کرام الکاتبین. ظاهروایە داخلی جواب نەبێ! یعنی لە مقولەی (قل)نیە! راساً لە طرف باری بۆ تجهیلیان وارد بووبێ. ئەفەرموێ رسلی ئێمە ﴿يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ﴾ مکریوان، مابە المکری وان، لە کتبی خوا، بزرنابێ ئەینوسن ثبتی ئەکەن! چۆن لە علام الغیوب بزرئەبێ؟ بەڵام علی تقدیری بوونی لە تتمەی جواب، احتیاجی هەیە بە تقدیری مصحح! انە ﴿هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ ئەتان ڕوێنێ لە برو بحر، بۆ خۆی یا بەواسطەی ئالات و قووەت و مکنەتێ کەپێیداون. وا ئەبێ ئەڕۆن لە بر بۆسەفەری بحر بەتجارەت یا بەسیاحەت. ئەڕۆنها ﴿حَتَّى إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ﴾ هەتا ئەچنە ناو کەشتی، کەمیە، سفینەێ شراعی، لە ئەوێ ئارام ئەگرن. ﴿وَجَرَيْنَ﴾ سفینە. ﴿بِهِم﴾ بەسکان، عام لەوان و ربانیان! ﴿بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ﴾ بای خۆش وەخۆشبایێ، موافق! سفینە بەبای حرکت ئەکا، بە واسطەی حرکەی سفینە، سکانی انتقال ئەکەن بۆصوبی مقصود!! ﴿وَفَرِحُواْ بِهَا﴾ بەو حاڵە خۆشە. ﴿جَاءتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ﴾ لە طرفی مخالف، مقابلی بایە خۆشەکە، ئەوجا ئەبێتە شەرەبا، لە هەمو اطرافیان، بحر ئەکەوێتە تلاطم! ﴿وَجَاءهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾ یمین ویسار و قدام و خلف، دەهەشەت دەیانگرێ! ﴿وَظَنُّواْ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ﴾ اعتقادێ بەقووەت. عجایب تا (آخر) نفس انسان املي نجاتی ئەمێنێ! واتێ ئەگەن کە

دەوريان درا، اطرافيان گيرا، مەفەريان نەما ﴿دَعَوُاْ اللّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ بێشائبەی شرک، چونکی ئەزانن لەو هەنگامە بەغیری خوای کەس بەفریادیان ناگا، ولو ئاگاشیان لە حالّیان بێ، نجات بەس مربوطی ارادة اللهیە! نە (خضر) لە (الیاس) نە (قیس) نە (شماس) نە (لات) نە (عزي)، بەکار نایێ! الاه الأنام! ﴿لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَـذِهِ﴾ لەم حالّە ناخۆشە کە هولی تعریف ناکرێ، بەس بەمشاهدە ئەزاندرێ! ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ لە زومرەی موحدانێ کە هەر تۆبە منعم ئەزانن! شکرانەی تۆ ئەکەن! کەس بەناوی منعمی حقیقی یاد ناکەن!! ﴿فَلَمَّا أَنجَاهُمْ﴾ زۆر بووە. خوا نجاتی داون، گەلێ جاریش بووە بەعمومی غرق بوین. ﴿إِذَا هُمْ﴾ بلا توقف و تاخیرا ﴿يَبْغُونَ فِي الأَرْضِ﴾ ظلم و افساد ﴿بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ وا ئەبێ تجاوز لە حەق، خدمەتی حەقی پێئەکرێ! یەک یەک ئەڵێن: (ئەو زاتەکەی اهوالی دیتیە؟! کەی وا رەزیل و زەلیل و بێ دەسەڵات بووە؟! چۆن خالصا هاواردەکاتە خوا؟ کەی کردویەتی؟ حقیقةً گەلێ کەس پاش نجاتبوون لە فلاکەت و هلاکەت، خراپتر ئەبن!، من پاش قحط (گراني) و غلای عام دیمن! وەکەسێ تەماشای حالّی مشرکینی رابردوو بکا وە لەگەڵ حالّی موحدینی ئێستا لێکیی داتەوە، فرق زۆرە لەو نوعە هەنگامە،! وە لە مقامی مناظرە لە شئونی الوهیەت نەختێ فرق ئەگەێنێ! نەت دیوە لەو هەنگامە ئەوان هاواریان ئەکردە خوا؟! رائەوەستان!؟ لە ادعا ئەکەوتن؟! لکن موحدین لە هیچ حالّێ راناوەستن! ناوی خوایان بۆ سوێندی بەدرۆنەبێ لانیە! هاوارکەنە بەرخوا؟! حاشا!! تۆباڵی ئەوانە بەئەستۆی (ابن حجر) و (شعراني) و امثالیانە! عالەم بەقسەیان ماڵوێران بوو، حکایات و مزخرەفاتیان زۆرە، حەزناکەم لێرە شتێ لەوانە بنوسم! فيالحقيقة (بغي) بغير الحقیان، لە ئەندازە بەدەرە! وە بەناوی کمالي دین و قوتی ایمان و تقربي الى الله، قبوڵکرایە!! ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنفُسِكُم﴾ خۆتان زەرەر دارئەبن، بەو جۆرە تجاوزە، روحتان بەفساد ئەچێ، غرائز و فضائل و

محامد و مآثری بشری، بەرزائل ئەگۆڕێ! آخري ماڵ وێرانيە! بۆ قوم، بۆ دەوڵەت! كەسێتر بەسەريان غالب ئەبێ! دار و دياريان ئەگرێ! لە امواجی فتن و هرج و مرج، ئەخنكێن!! عالەمی اسلاميەت لە جزای بغی و عدوان لەگە ڵ ييەک، توشی ذللەتی عبوديەتی غرب بوو! الآنيش لە فسادی خۆ بە خۆی، لە عداوەت و بعضای قومی مذهبی زێدە ئەكەن، عبرەت ناگرن!! (عكرمة بن ابي جهل) لە طرف صاحبی رسالەت بێخوێن كرابوو، هەلات، لە بحر تووشی فرتە نەبوو، كەشتيەوان بە سكالی سفينەی ووت: (هاواركەنەخوا، بوت و موت لێرە بە كەڵک نایێ)! (عكرمە)ووتی: (مادام لە بحر غيری اخلاص الله نجات دەرم نەبێ، لە بريش نابێ! خوايە عهدبێ ئەگەر تو نجاتتدام لەو فرتەنەيە، بچمە لای محمد (ﷺ) دەستی لەناو دەستینێم، يعنی ايمانی پێبێنم)! نجاتی بووهات مسڵمانبوو. اما مسڵمانی كاملی خالصی مجاهدی عازی شهيدی ئێمە، هەزار عبرەتمان ديتيە، گوێش نادەينێ! وە حالاً ئەوانەی لە بحر بەپاپۆڕی بخاری حربی و تجاری سيری سفر ئەكەن، ئەو فرتەنەيە بەاموری طبيعی ئەزانن، تعبيری ئەدەنەوە بەغضب الطبيعة. خلاصە بشر زۆر گۆڕاوە، سوادی أعظم لە موحد و مشرك، رووبان لە خوانيە، بۆيە بشر لە حالێدايە رۆژی روناكی لێبوتيە شەو، لە هەمو اطراف امواجی شەڕ و دەرد و بەلا رووی تێكردوە و محاطە، وە أصلاً بۆ اصلاحی حاڵ، خوای بەدلا نایێ!! (سيد رشيد) حكايەتی مسڵمان بونی (مستربرواني) انگليزی ئەكا، كەيەكێبووە لە (قبطاني) پاپۆڕ لە ترجمەي قرآن چاوي بەو آيتە وەسائری آياتي دائر بەبحر و گەميەی كەوتووە، زۆرچاک تێيی فكريە، دوایێ لە بعضی اشخاصی اسلامی سؤال كرديە: (ئايا محمد (ﷺ) سەفەری بحري بوووە؟)، ئەڵێن: (خير نەبيستراوە)، (ئەوجا) دەزانێ ئەمە وحی الاهيە، وە ايمان بەحضرەتی محمد (ﷺ) ئەينێ! دوای تركی (قبطاني) ئەكا، دێتە (مصر)، تعلمی عەرەبی ئەكا، يعنی بۆ چاک زانينی قرآن! (سيد) ئەفەرموێ: (منديم وەناسيم، يعنی

بوینە ناسیار). بەڵێ بۆ ایمانی ڕاستی، هەرعلم و نظر خۆیەتی!! باقی فەند و فێڵە!! ﴿مَّتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ (متاع) بەسەروبەر(نصب و رفعە) خوێندراێتەوە، چەندوجهیان بۆ نصبە ذکر کردیە. خلاصە حیاتێ پڕوپوچ بێمایە و ما حصل، دنی و دون و سفیل، تمتعی پێئەکەن. ئەی (باغي)نە ئەومتاعە هیچە! ئەبێتە سببی تعدی و جور لە خۆتان! ئەمڕۆ یاسبەی ئەبڕێتەوە!! ﴿ثُمَّ إِلَينَا مَرْجِعُكُمْ﴾ گەڕانەوەتان هەر بۆلای خوایە! لە بحر شریکتان فائدەی نەبوو! ئەبێ بڵێن؟ (مرجعمان لە قیامت بۆلای شرکامان ئەبێ؟) ﴿فَنُنَبِّئُكُم﴾ لەو ڕۆژەدا. ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لە داری دونیا! گەلێ کەس لە علمای اسلام لەو نوعە آیتە امل ئەکا ئەمڕۆسبەی عقابی الاهي بەسەر (فەرەنسە و انگلیز) دابێ چونکی بغی ئەوانە بەسەر عالەمی اسلامیەت لە ئەندازە بەدەرە! ئایا تەماشاکەن بغی مسڵمانان خۆبەخۆی حتا لەو مذلتەدا لە بغی وان خراپترنیە؟ خۆیان ئەبنە باعث، بەڵکو التجایان پێئەکەن، کە تداخل بە ئیش و کاریان بکەن. زۆر لە مێژنیە سبب بەعداوەتی خۆبەخۆی سلطانی (فاس) دەخالەتی بە (فەرەنسە) کرد وە کە وتە حمایەتی ئەو!، لە بو ادارەی ملک، لە ناو گەڕێن! مسڵمانان چکەڵکیان پێوە هەیە؟ حاصلی ئەمڕۆ ئێمە کەوتوینە ڕۆژی جزا، وە دەست هەڵناگرین لە ئیشي ناسەزا! ﴿إِنَّمَا﴾ بۆحصرە! ﴿مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ آن گوزیدە و ممتاز و خۆش، نیە الا ﴿كَمَاءٍ﴾ باران. ﴿أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ﴾ جای بڵند. ئەو بارانی لە میعاری خۆی بێ، بۆ نباتات، لە ئەوی دیچاکترە! ﴿فَاخْتَلَطَ بِهِ﴾ بەئاوەکە_ رغم انف الأشاعرة_ باران بە انتظامبێ، لە وەقتی حاجت و بەقەدەر حاجت، گیاوگوڵ زۆر عجایب هەڵدەستێ، خوررەم و شادان ئەبێ، بەمل یەکا ئەچێ، تێکەلاو ئەبێ! ﴿نَبَاتُ الأَرْضِ﴾ ارضێ منبت! ﴿مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ﴾ ڕێواس، دۆریە، خەرتەلە، چاوبازە، ترشۆکە، بن بەردەقە، شنگ، ئەندرێشە، وە غیری ترکە نائژمێردرێ کە بەخاوی انسان ئەیخوا یا ئەیبرژێنێ، بێجگە لە حبوبات و اقواتی بشری! ﴿وَالأَنْعَامُ﴾ گیای حیوانات

بیخوا، زۆره! ﴿حَتَّـىَ إِذَا أَخَـذَتِ الأَرْضُ زُخْرُفَهَـا﴾ حسن و بهجەتی خۆی وەرگرت بەلباسي اطلس سەبزخەملی! ﴿وَازَّيَّنَتْ﴾ بە انواعی گڵوک خۆی ئاڕاستە و پیراستەکرد، مشاطە بووکی ارضي بەبدایعی صنعی، انواعی الوانی ازهار، ئارایشدا!! ﴿وَظَنَّ أَهْلُهَا﴾ سکانی ارض. ﴿أَنَّهُـمْ قَـادِرُونَ عَلَيْهَـآ﴾ بێمانع ئەتوانن لە زیب و زینەت و ثمرات و فواکهی استفادە بکەن. غافڵ لە حوادثاتی دەهر چیان بەسەر دێنێ! ﴿أَتَيهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا﴾ امری خوای بەسەر ئەوباغ و داغ و مێرگ و مێرخوزارە داهات. ئەو امرە موهلیکە وەک کلۆی مراکشی و نجدی وەک تەرزە تەزرەی رۆژی دوو شەمو شەشی مانگی مولود ٤ی مایس رۆمی ئێمە لە (هەولێر) بوین دونیایەکی وێرانکرد. وەک ژەنگی ئەوساڵ دونیای بەربادا. ﴿فَجَعَلْنَاهَـا﴾ ئەو ارضە جنة مثالە. ﴿حَصِيدًا﴾ ئەرزێ دروێنەی لێکرابێ. ﴿كَـأَن لَّـمْ تَغْـنَ بِـالأَمْسِ﴾ کانە گیای تیاشین نەبوو بوو، لەسەر ساق رانەوە ستابوو. لە ساڵی پار پارچە گەنمەکی بەهاریم هەبوو لە (پێبازۆک) زۆر مدحیان ئەکرد، حتاسەپان خۆیان ئەهاتن ئەپارانەوە بیانگرین بەسەپانی ئەو پارچە دەغڵە. ووتیان کلۆ گەیشتە (دار دێدەوان)، ووتم والله لەوێ بفڕێ یەکسەر ئۆتراغی لە ناو دەغڵەکەی من ئەکا، گەرچی مابەینی دوورە، اما شینای تیا نەمابوو، ئەمزانی طبعاً روو ئەکاتەجهەتی ئەو سەبزەزارە. (نورالدین)ی برام لەوێبوو ووتی: (پاش عصر رۆژێ چوومە تەماشای دەغڵەکە، بەخ بەخ چاوی پێ رووناک ئەبوو، لەو آنە کلۆ هات لێی نیشت، سبەی چوومەوە تەماشای، دیم بەنوعی سوێندت خواردبا کەدوێنێ یاساتێ پێش خورانیی کە لە گیایەکی تیانەبووە، سوێندت لێنەدەکەوت). (الامس) لای (زمخشري) مثلە لەسەر نێزیکی، کانە ئەڵێ: (ئێستا). (امسي) بێ، الفولام، بەمعنا دونێیە! ﴿كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ ئەوانەی بەظاهر تەماشاي مناظری لطیفە ئەکەن، لە جمالی، ادنی شتێ نازانن! تەماشاکردنیان سەرسەریە وەک بهائمە. ئەوەی اربابی دقت وقتی نظر بێ. لە تەماشای بعضێ مواقع

مدهۆش و حه‌یرانی حسن و جمالی ئه‌بێ. گه‌لێ که‌س (طاقي کسرا)یان دیت اما ئه‌و دقته‌یان نه‌کرد وه‌ک شاعر ئه‌ڵێ: (شکافی‌کي بیني درایواني کسرا دهانیست گۆید بقا نیست کسرا). دیده‌ی اعتبار، عجاییات مشاهده ئه‌کات! که‌سێ له ابتدای منداڵی به‌ناز و نعمه‌ت به‌خێو ئه‌کرێ، له زه‌مانی بلوغ ئه‌بێته صاحبی قه‌صر و قصور و غلمان و حور، هه‌روا عمر رائه‌بوێرێ به‌کمالی سرور و حبور، له ناکاو هادم اللذات بناغه‌ی وجودی تێک ئه‌دا تفرقه ئه‌بن، زۆر ناچێ (کان لم یکن بین الحجون الی الصفا انیس ولم یسمر بمکة سامر) انسانێ به‌و نظره بنۆڕیته حیاتی دونیا، چۆن مغرور ئه‌بێ؟ کو بغي و تعدا ئه‌کا؟ حق الأنصاف هه‌مو دونیا ئه‌وه‌نده نایه‌نێ دڵی. بێچاره‌ێ ضعفێکی له‌سه‌ر عاجزبکه‌ی. خلاصه دونیا داری شه‌ڕو شۆڕ و بغی و ناڕاحه‌تی و هلاکه‌ته. جه‌نابی حه‌ق امرئه‌کا پێی مغرور مه‌بن! به طماعی ئه‌م متاعه دونه، به‌د ڕه‌فتاری و کرداری له‌گه‌ڵ یه‌ک مه‌که‌ن! ﴿وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلَامِ﴾ ئه‌وی له دونیا به‌سلم و ئارام راي‌نه‌بوێرێ، ایجابه‌ی ده‌عوه‌تي خوا ناکا! ئێوه دونیا بکه‌ن به‌دارالسلام بێ بغی و افساد، توجه ئه‌که‌ن بۆ دار السلام. له دونیا و آخره‌ت له هه‌مو ئافات و بلیات و کدورات سه‌لامه‌ت و امین ئه‌بن. ﴿وَيَهْدِي﴾ خوا! ﴿مَن يَشَاءُ﴾ له عباد! ﴿إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ که له دونیا سلوکی پێدا بکا، ئه‌ڕوا بۆ دارالسلام! ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى﴾ جزاێ چاک جوان محبوب، مثلی چاکه‌ی خۆیان. ﴿وَزِيَادَةٌ﴾ ئه‌مه‌ش، ده‌ره‌جاته! تقدیری بۆ اهلی حسنات، عائدی (باری)یه! حسنی مقابله، وائه‌گه‌یێنێ! گه‌رچی چه‌ند روایه‌ت هه‌یه تفسیری یا تعبری ئه‌کا به (روءیة الله)!، نازانم له دوای روءیة الله ﴿وَلاَ يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلاَ ذِلَّةٌ﴾ چی قیمه‌تێکی هه‌یه؟ ئه‌و مسڵمانانه چی‌وایان نه‌کردوه ببێ به‌سببی ڕوو زه‌ردی ڕوو ڕه‌شی و شه‌رمه زاری، تا معاذ الله، له قیامه‌ت اثری، له‌سه‌ر ڕوویان ده‌رکه‌وێ! دێنه مه‌یدانی عرصات به ڕوو وێ صبیحی وه‌ک کوکبی دری، ادنی دووکه‌ڵ و ره‌شی و کدوره‌تی ذلله‌تی شه‌رمنده‌گیان، به‌ڕوودا، نایێ!

﴿أُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ بالأتفاق!! ﴿وَالَّذِينَ كَسَبُواْ السَّيِّئَاتِ جَزَاء سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا﴾ زێدەی نی‌یە! ﴿وَتَرْهَقُهُمْ﴾ بەسەر هەمو بەدەنیان دا دێ ﴿ذِلَّةٌ﴾ ذللەتێ زۆر گەورە! ﴿مَّا لَهُم مِّنَ اللّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾ کەس نی‌یە حفظیان بکا لە عذاب و عقابی خوا، حتا بەتکا! ﴿كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا﴾ بە ڕوویان‌دا درابوو، ڕوویان داپۆشرابوو، پێیان داکێشرابوو، پارچە پارچە، هەر ڕووێ، چەند پارچە، (بنا لە تقریری سید رشید)! ئەو پارچانە لە شەوی تاریک (بیمي موج و گردابێ هائل نەسیارە پیدا نەپروین نما). زاتاً شەوی تاریک، قطعەی تاریک ئەبێ! قطعەی تاریک، لە شەوی تاریک ئەبێ! لە وجهی اعرابی (مظلماً) إضطرابیان هەیە. حقە کەسێ لە تاریکی بڕوا، حرکاتی نامنتظم ئەبێ!! ئەوشەوە نمونەی ئەوشەوە ڕەشانەیە کە بە انواعی فسق و فجور ڕایان ئەبوارد، لە هەر قطعەێ بە نوعێ لەوانە مشغول ئەبوون. لەو ڕۆژە (علی ملأ الناس) سوادي ئەو شەوانە، لەسەر ڕوویان ئاشکرا ئەبێ! ﴿أُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ ئاگرێ ڕەشی بێ ڕووناکي. ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەگەر (ابن القیم) و (سید رشید) لێیان گەڕێن!! ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ مشرکین و شرکاء، یافریقین، شەدا و اشقیاء، موحدین و مشرکین. لەو ڕۆژە بەدەر ئەکەوێ- علی رؤوس الأشهاد- کە هیچ عاصمیان نیە! ﴿ثُمَّ﴾ بعد الجمع! ﴿نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾ ثنوی، وثنی، و من شاکلهم! ﴿مَكَانَكُمْ﴾ لە جێی خۆبن! ڕاوەستن! انتظارکەن! ﴿أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ﴾ تا حقیقەتی حاڵ، معلومتان بێ! ﴿فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ﴾ لێکمان جودا کردن. ئەو ڕابطەی خیاڵی وهمی کە بوویان، بڕا! ﴿وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم﴾ لە ڕووی انکار! ﴿مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ﴾ دوای هەوای خۆتان کەوتبون. ﴿فَكَفَى بِاللّهِ شَهِيدًا﴾ لەو آنە هەمو کەس ایمانی بەو کفایەتە هەیە! ﴿بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ خوا ئاگادارە ئەزانێ ﴿إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ﴾ قطعیاً ئاگامان لێنەبووە، چ جاێ کە امرتان پێ بکەین! چ (ملک) چ (عیسی)، ئاگایان لە عبادەتی ئەو مشرکانە

نیه! (عیسی) خۆی اعترافی کرد، وه (ملک) لازم نیه وەکی خواي ئاگاداری هەموشتێ بێ!! ئەو گفتو گۆیه قسەی (اصنام) نی یه! قسەی ممثله کانه که احیا بووین!! ﴿هُنَالِكَ تَبْلُو﴾ له محکی تجربەی ئەدا! ﴿كُلُّ نَفْسٍ﴾ مؤمن و کافر، معبود و عابد ﴿مَّا أَسْلَفَتْ﴾ ئەو عملی له داری دونیا پێشی خستبوو، تا زین و نقدی بەدەرکەوێ. ﴿وَرُدُّوا﴾ طوعاً اوکرهاً! ﴿إِلَى اللَّهِ﴾ واحدی بێشریک. مؤمن و کافر، ڕوو له خوا ئەکا! بۆ اهلی شرک کەس نیه التجای پێ بکەن، غیری ئەو خوایه ﴿مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ﴾ لکن مع الأسف بەمولای باطل، مولای حەقیان له قیس خۆیاندا! ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ گومبوو به ضایعچوو افترایان، ما به الإفترایان! خوا ئەیزانێ ئەوڕۆش دیاره ضلاله!، بەڵام سوادی أعظم له بشر بەڕاستی ڕوو له مولای بەرحەق ناکەن! وه ئەو شرک و ضلال و کفری نەزانانەی که له ناو مسڵمانان‌دا هەیه، قط نەبوو، بەڵام او محکەم بۆ تبیني حەق و ظهوری وحدەتی الاهي، ضرورەتی نیه! بۆ تصویری احوالی مشرکەکان و شرکایان، له حالی دونیا، نومایانه!! ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ بەباران باراندن و نباتات ڕواندن، یا ئەو موادی له ناو ارض و له هەوای دایه! ئایا الاهی ئێوه ئەزانی، ڕزق چیه؟ ڕازق کێیه؟ ﴿أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ﴾ قیمەتی سمع و بصر، دقایقی صنعی بصر و سمع، عجایباتی دیتن و بیستن، ئەمڕۆ دەرئەکەوێ!! گوێ له (ڕادیو) ڕاگرن! چاو له صوری منقولەکەن! بنۆارنه سینەمای ناطقه! نقالەکانی ئێمه ئەلێن: (رسلي عیسی) قوڕیان هەڵ ئه خراند وەک (کەلا) ئەیان هاویشته ناو قەپێلکه چاوی (اکمه) دەستێکیان پێدادەنیا، ئەبووه چاو!! ﴿وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾ حقیقةً ئەوه موجبی حیرەته، مادەی (حیاة) له ارض چۆن پەیا بووه؟ موادی حیه له موادی میته ئەبێ؟ وکذا بالعکس؟ طبیعیون نزاعیانه! لکن چارەنیه، ئەبێ بڵێین: (لێک پەیدا ئەبن) ئەمەش له کیمیاگەری حقیقي، دوورنیه!! ﴿وَمَن

یُدَبِّرُ الأَمْرَ﴾ له خلق و ایجاد، اباده و افنا و نطوری عاله‌م، ئه‌وانه به‌تدبیری کێ‌ئه‌بێ؟ تسخیری طبیعه‌ت، وضعی قوانینی طبیعی، کیمیای، میکانیکی عاله‌م، به‌کێ ئه‌کرێ؟ به‌که‌سێ که فوق الطبیعه‌ت بێ، به غیری واجب الوجود، حی قیوم، که‌س فوق الطبیعه‌ت نیه، هه‌رچی هه‌بێ مقهوری طبیعه‌ته مدبره، نابێ به مدبر!! اهلی عقل و إنصاف و تامل، له مشرکانی عصری رساله‌ت په‌ناه، بێ‌توقف جواب ئه‌ده‌ن ﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ (سیدي آلوسي) ئه‌فه‌رموێ: «بلا تلثم و لاتاخیر). ﴿اللّهُ﴾ جل جلاله و احاط علمه وكمل قدرته، حکیم و علیم و ڕزاقه! مالکی گێو و چاوه! زیندی له مردی، مردی له زیندی هاوێژه ده‌ره، مدبر الأمره! ﴿فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ﴾ له شرک. ئه‌وانه له‌سه‌ر کفری خۆیان، اعتراف به‌حه‌ق ئه‌که‌ن! اما موحدینی کامل الإیمان صفوة خلق الله، بێ‌توقف ئه‌ڵێن: (حضره‌تی شێخ، گشتی، خۆیه‌تی! خوا امریه‌ره، نه‌فه‌رێکه بۆ قطب مسخره). خوا ئه‌یزانێ خۆم له شخصێ کاملیانم بیست ئه‌یگوت: (خوا، واسطه‌یه). ﴿فَذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ﴾ ثابت و محقق، موهوم و مخیل، نیه! فی‌الحقیقة انسان ته‌ماشاکا، به‌غیری خوا و طبیعه‌ت، بۆ خلق و تدبیر، که‌سي‌ترنیه! هه‌ر هیچه! ئێمه محصولی طبیعه‌تین (منها خلقناکم)، پابه‌ندی طبیعه‌تین، له حیات و ممات، قوای طبیعه‌ت عاملن! عاله‌م معمله! موجد و مرتب، خوایه! والسلام! حتي هیکه‌لي انسانی پڕه له عمله، خۆی سێ معمله، طبیعی و کیمیای و میکانیکی (هو الله الخالق الباری المصور)! ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ﴾ ئه‌گه‌ر اتباع نه‌کرێ ﴿إِلاَّ الضَّلاَلُ﴾ زاتاً اتباعی حه‌ق، علماً وعملاً، هدایته! عکس، ضلاله! لاهوایه احتیاجیمان به احتباک نیه ﴿فَأَنَّى تُصْرَفُونَ﴾ کوو ڕووتان پێ‌وه‌رئه‌گێردرێ له حه‌ق، بۆلای ضلال، له هادی، بۆ مضل؟ ﴿كَذَلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ﴾ حکمی. ﴿عَلَى الَّذِينَ فَسَقُواْ﴾ خارج بووین له طوری هدایه‌ت. ﴿أَنَّهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ ولو هه‌زار خوارقیان بۆ بنوێنین! که‌وابێ ایمان

نەهێناتیان، لەبەر خبرنیە! بەڵکو اخبار، اخبارە، بەامرێ خارجی! خبر وەک علم، لە احوالی خارجی تاثیرێنیە! ایمان بەشتێ ئەگەر لە طریقی فکر و نظربێ، باشە! کە فسادی نظر دەرخسترا، صاحبی لێیعیان ئەبێ، کە ایمانەکەی فاسد بوو وە! اما ئەگەر لە ظنی مع المیل، یاقومیەتبێ، چارەنیە! کەوابێ شرکی ئەوانە، هیچ اساسێکي شبهەیێکی نیە، تا بەدلیل ازالەبکرێ!! ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَائِكُم مَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ تا بەتەواوی ئاشکرابێ، ئەوانە ایمان نائێنن، زێرا، شرکیان لەسەر نهجی عقل و فکر دانەندراوە، تا بە آیاتی بینات علاج بکرێ! سؤالیان لێبکە، (هەیە لە شرکای ئێوە کەسێ بدای خلق بکا و پاشان اعادەی بکاتەوە؟). ئێوە ئەوا ئەبینن نباتات اشجار عالەمی امکانی استعدادی عالەمی تطورات، مثلاً خورما ترێ چۆن ئەبێ، دوایێ انحلالي ئەبێ! ئەچێتەوە عناصری خۆی، لە دەوری آتي کالأول پەیدا ئەبێتەوە لە عیني عناصر! ممکنە عینی موادی ساڵی پار، ئەمسال ببێتەوە میوە! ئەو تحولات و تقلبات و جمع و تفریقە کێ ئەیکا؟ بەشرکای ئێوە ئەکرێ؟ جواب چیە؟ بهتە، بۆیە لە عبارەت جوابیان نیە، گەرببێ بەغیری (لا)، چیترنیە!! ﴿قُلِ﴾ بۆ اظهاری حەق، نە لە جواب! ولو گەلێ کەس وایان فە رموبێ!! ﴿اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ ئەو معنایە وەک لە بعضێ محققین نقلکرایە، معنایێ ئاشکرایە! موافقی عبارەتی قرآنە! وەتفسیری (بدا) و (اعادە) بەو نوعە، ای خۆمە! حمل لەسەر اصلی خلق و اعادە بۆ حشر، لام خۆشنیە! بۆ توجیهی احتیاجی بە تکلفات هەیە! (سید رشید) هەر چەند تعرضی بۆ ئەو خلق و اعادە فەرمووە اما نەیکردوتە تەفسیری بدا و اعادە، لەسەر قولی اکثر ڕۆیشتە. (سیدي آلوسي) نصرەتی داوە، لکن هیچی لای من جواننیە! شێوەی سؤالي ئێرە لە سؤالی سابق جوودایە؟ (فاختر لنفسک مایحق!!). ﴿فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ رایتان چۆن قلب ئەکرێ؟ فکرتان چۆن ئەگوردرێ؟. لە مقامی تطورات کەسنیە مقابلەی ئێمە

بكا، الا طبيعيون نەبێ! ئەوا ئەبينن، تبدلی احوال و اطوار بەتبدلی فصول، قرب و بعدی شمس، تبادلی حرّ وبرد، تناسب و تباين مواد، ئەبێ! قوای عاملەی طبيعەت، ئەم تركيب و تحويل و تفكيك و تكليفە، ئەكات! هەموێ بۆ اهلی تجربە، عيانە! بەڵێ وايە ئێمەش ايمانمان بە طبيعەت هەيە، لە جهتی قابليەت، نەک فاعليەت! بەلێ قوای عمل ئەكا، اما ئەبێ كەسێ ئەو قوايە چ طبيعی ێ چ كيميائی چ مكانيكی، لە هيكەلێ لە معملێ گرکاتەوە، نظم و ترتيبيان بدا، هەريەكە كاری خۆی پێبسپێرێ!!، بەلێ حقاً ئەوە لازمە ضروريە! عقل بێ توقف بەو حكمە، جازمە! ئەو كەسە بێعلم و قدرەت و حكمەت و تدبير و دقتێ فوق الغايە، ئەو معملی پێئاراستە ئەكرێ؟ حاشا!! كەوابێ صنعی تطوری، بێخوا و طبيعەت، ناكرێ! خوا مدبر، طبيعەت مدبرە! خوا مسخرە، طبيعەت مسخرە! خوا فاعل، طبيعەت قابلە! هەر چەند انسانيش بۆ تحسينی محصولی متصورات، دەخلێكی گەورەی هەيە، اما لە حصولی، هيچ تاثيری نيە! كانە انسان ازالەی بعضێ موانع ئەكا! لكن اكثری علمای دين تەماشای صانع ئەكەن و بەس!! طبيعيون تەماشای كارخانەێ حاضر و مهيا پڕ لە عملە و ئالات و ئەدەوات بەكمالی فاعليەت لە كاردايە، ئەكەن! اصلی واصع و مرتب، نابينن!! ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم﴾ اولاً فەرمويانە: (كمافي السابق، مراد اصنامە!). ثانياً تەماشا ئەكەن لەگەڵ ﴿مَّن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ﴾ ملامەی نيە! جماد لەكێ؟ هدايت لەكێ؟ تو جيهاتيان بيان فەرمووە!! اما اول توجيە، (فخرالدين الرازي) ئەفەرموێ: ( دوورنيە مراد رواسای دينبن! ئەوانە اتخاذيان كردوونە، بە ارباب!). (سيدي آلوسي) ئەمە ئەكاتە تفسيری (شركاء)، وە بە (قيل)ی نقل ئەكا وە ئەفەرمومێ: (دوورنيە!)، لام قسەێ زۆر جوانە!! لەگەڵ عبارەتی قرآن زۆر موافقە! چ حاجت بە تاويل و تكليف نيە! ئێوە تەماشای رواسای دينتان بكەن، بەغيری تلبيسی رای وڕێگۆڕين، عقل زائل كردن،

استلای اعراضی و اموال، چ فکری تریان نیە! غایەیان، استلایە! ئەوانە بۆ حەق ڕێتان نیشان نادەن! ئێوە بە مجردی میلێکی نفسی، تابعی قولیان ئەبن، لێک نادەنەوە، ئەوەی تعلیمتان ئەکەن هەموی گواهیە!! ﴿قُلِ اللّـهُ﴾ خالق الکل، بێ میل و محابا، رب العالمین ﴿يَهْدِي لِلْحَقِّ﴾ مرادی حەقە و، بەس! هادی الی الحق، للحق، هەرئەوە! هدایەتی باري، ئەنواعە، بەغرائز، بە حواس، بە عقل، بە ارسالی رسل، (قطعاً للحجە بۆ) وایضاحی (ما خفي علي العقل، اوغلب علي الهدي)! ئەفەرموون: (حەقي ) (رسول الله)ش وایە، ئەبێ وێنەی خوابێ لە بێ میلی و محابای، فرقی ولذی خۆی و اجنبی نەکا! حقاً بە دڵ و جان شاهدی ئەدەم رسولی کبریائی خاتم الرسل وابووە! مقصودی بەس هدایەتی بشر بووە! ﴿أَفَمَن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ﴾ هەر کەسێ بێ! ﴿أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ﴾ لە مصالحی دارین! ﴿أَمَّن لاَّ يَهِدِّيَ﴾ بەشدی (دال)ی. اهتدا ناکا، ڕێ بەشت نابا، یا لەبەر فسادی فطرت، یا لەبەر بلاهت! ﴿إِلاَّ أَن يُهْدَى﴾ هدایەت بدرێ بەواضحی ڕێی نیشان دەن: (کیندسی محتاجی هیمت بردە دەنێروە قالدی غیر لە همت ایرە حقاً رواسای دین خۆیان محتاجی هدایتن، وە هدایەتیان مشکلەیە! خۆیان بەشتێکی دی تێئەگەن، خۆیان ئەپەرستن! خواو عالەمیان بۆ خۆیان ئەوێ! تەماشای عاقبەتی امت ناکەن! خۆیان معززین، هەرچی بادا باد!_ سبحان اللە_ امتیش تابعی ئەو نوعە مفسدانەن!! مەلاێ ڕاستبێ، ڕاستیان بهڕاستی نیشاندا، عقلیان زیندوو کاتەوە، نایانەوێ! ﴿فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ سببی چیە، چۆن میلتانبێ، وا حکم ئەکەن؟ بێ تدبر و تفکر و تامل! بێدلیل و برهان، اعتقاد بەوجماداتە بەو مفسدانە ئەکەن؟! مجردی محبت و میل و تقلید، سوقتان ئەکا بۆ اتباعی ئەوانە، بڕوایان پێئەکەن!! لە مصالح و مفاسد نافکرن! ﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ﴾ ئەو رواسایانە. ﴿إِلاَّ ظَنًّا﴾ ظنێ واهی_ مع هوی النفس_! کە ئەوە حالی متبوع بێ، فکیف حالی تابع؟ من گەلێ جار بە فقێیانی خۆم ئەڵێم: (قبل کل شيء لە مامۆستای خۆتان امین مەبن، مەبادا مزاجی سفسطی

غالب بووبێ، وە یاخود تقلیدێ کوّری کردبێ!). وە اکثری ئەمرێ، وایە!! ﴿إِنَّ الظَّنَّ﴾ مطلقا بالقوة. یا ئەو نوعە ﴿لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ چونکی افادەی یقینی نیە! زاتاً صاحبی (ظن) تجویزی نقیضی حکمی خوّی ئەدا! بەلاّم حمقای عصر چ جایێ ظن وهم و گومانی خوّیان لە ایمانی (جبریل) محکمتر ئەزانن احتمالی غیری (هي) (هو) قابلە شێخ وای فەرمو! لە فلاّن کتێبی وە هانوسرایە! ﴿إِنَّ اللّهَ عَلَيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ ئەو رواسایانە کە بوّ اغوای خلق، چ حیلەکاری ئەکەن! ﴿وَمَا كَانَ هَـذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَى مِن دُونِ اللّهِ﴾ کەسێ ڕاست ئەکا ئارەزوی هەیە اتباعی حەقبکا، بێشک و شبهە اتباعی قرآن بکا، لە اعتقادیات لە اعمال لە اخلاق لە آداب و محاسنی اجتماعیات! ئەو قرآنە قابلنیە لێی ناوەشێتەوە هەڵبەستراوبێ، بەدرۆ نسبەتی بوّ خوا درابێ! کلامێ حەقە! داعی بالحق للحق، الی الحقە! دوورە لە افترا و کذب و اختلاق! قرآن بوّ اهلی نظر، خوّی شاهدی صدقی خوّیەتی! تحریری آیاتی اکوانی و آسمانی، تفریقی حەق و باطل_ من کل الوجوه_ بە افترا ناچێ!! ﴿وَلَـكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ لە کتبی سماوی وەک (تورات) و (انجیل)! ﴿وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ﴾ سماوات و ارض (وما فیها) لە آیات و عبرە! حقیقةً لەگەلێ جێ ئەو کتابە مبارەکە تفصیل و تحقیقی آیاتی (کونیە) ئەکا، شایانە بە (قرآن) بڵێین (تفسیری اکوانە)! ﴿لاَ رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ بێمیل و محابای، کافیە بوّ اثباتی ئەو حکمە. لەسەر ئەو حالەش ئەوانە ایمانی پێنائێنن! بەصراحەتی کە قابلی هیچنیە، ابطالی شرکیان ئەکا! (مع انە) واز لە شرک نائێنن، وە قسەی پڕوپووچ ئەکەن مثلاً ئەڵێن: (ئەو قرآنە مفترایە، محمد هەڵی بەستوە، بشرێ فێری ئەکا). توخوا ئەمە قسەیە؟! نابە خوا!! ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ﴾ یا محمد (ﷺ)! ﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ﴾ ولو سوورەتێ کورت بێ وەک (والعصر) وەک (سورەی کوثر). بلاغەت و فصاحەت زوّر قیمەت دارە، اما لە حقیقەتدا مقصودی بابِ (التبع)ن، بوّ

خاطری استماع بکرێ، ئەو معانیەی کە لە کلامەکەدا هەیە، بچێتە ذهن! تەماشای (سجع) و فقرە فقرەی عبارەت مەکەن!! بنۆڕنە حکم و حکمێ کەتیایەتی! مثلاً عصر، ج عصر؟! کوثر، ج کوثر؟! تا ئەتوانی، حقایقی لێوەرئەگری! بەڵکو آیەتێ وەک (ان الله لايغير ما بقوم. ألآية) حاوية! ڕوحی تەرەقی و تدلی جمیعی امه_من لدن آدم الي انقراض العالم_! ﴿وَادْعُواْ﴾ بۆ معاونە! ﴿مَنِ اسْتَطَعْتُم﴾ حتا ئەوانەی کە ئە لێن: (اتیان بە مثلی، ممکنە، اما صرف کراوین)، حقا قسەیێکي جوفاء!! ﴿مِّن دُونِ اللّهِ﴾ لە انس و جن و ملک! ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ لە ادعای افتراتان. ﴿بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِ﴾ ئەو اتیانە لەوانە طلب مەکە!، معارضەیچی؟! ئەوانە لە علمەوە ناڵێن: (ئەو قرآنە افترايه!)، تا بەمعارضە اثباتی دەعوای خۆیان بکەن! ئەوانە تێگەیشتوون لە قرآن؟ حاشا! دەورەیان داوە لە علوم و حقایقێ کە تیایەتی؟ کلاّ! گەلێ گوێیان ئەگرن تا نەیبیسن! ئەم آیتە ئەگەێنێ، ڕدی شت، پێش تێنەگەیشتن، مذمومە! حقیقةً بێ انصافیە، ناڕەوایە، نەدەبا لە مەلایانی ئێمە صادر ببێ! (معانە) لە مقابلی خصم خاصة حکماء بێ توقف و تامل بەڵکو (مع التحريف والتبديل) هجوم ئەکەن. حتا اکثری منازعاتی اصولیان کلامیان، لفظیە! بێاستفسار، بەگژ یەکا ئەچن! ﴿وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ﴾ تکذیبی آیتێ، حکمێ ئەکەن، پێش ئەوەی کە تاویل و تفسیریان بۆبێ بەتەواوی تێیبگەن، باز ڕاناوەستن، تا بیانێ دێ لە آیتێ دی، لە موقعێتر!! دەیکەن بەهەرا، موجبی طعن و ڕدی قرآن! (معانە) تاویلێ متوقع و منتظر بووە!! جەنابی (سید رشید) دەرحەق ائمەی کلام و اصول مفسرین و متفتنین، کەسێ سۆی ادبی نواندووە. حقیقةً دەربارەی غیری (سلفییان) زۆر بێقەیدی ئەدوێ! ئەوە! بۆ علمای ئەم عصرە، زۆر عەیبە! (مع انە)، (سلفي) جیق بکەن وفیق بکەن تاویلێ مصطلح، لە بعضێ مقام، ضروریە! ئەبێ بکرێ! وەالاّ، تناقض، دفع نابێ!

وە هیچ دڵێ ڕاناوەستێ لەو نوعە مقامە، بڵێین: (خوا ئەزانێ مرادیچیە)! حاصلی تفویض ئەمڕۆ وە لە پاش (خصام)، بێمعنایە! ممکنە ئەو قسمە رواسای (یهود)ین کە ئەیان ووت: (نازانین عاقبەتی ئەو دینە چۆن ئەبێ؟ ( لەبەر حسابی (الم، المر، المص) کە حملیان ئەکردە سەر حسابی جمل وە اشارە بۆ بقای دین. ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ بێ علم و بێاحاطە_ حسب الهوی والتقالید_! ﴿فَانظُرْ﴾ (ایها الناطر المتامل في عواقب الأمور)! یاخود (ایها الرَّسول)! ﴿كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ﴾ ئەوانیش ئەگەر دەست لە ظلم هەرنەگرن، عاقبەتیان وەک عاقبەتی ظالمەکانی پێشو ئەبێ! ﴿وَمِنهُم﴾ لەو مقابلانەیە! ﴿مَّن يُؤْمِنُ بِهِ﴾ (ولو تحت بارقة السيوف) بێ! ئەوانە نەگەیشتونەتە دەرەجەی افساد ﴿وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِ﴾ ولو ارض و ئاسمانیان بۆ قەلبکەی! ئەوانە انمەی افسادن! ﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ﴾ لە هەمو کەس! ﴿بِالْمُفْسِدِينَ﴾ ناسینی دجالەکان، مشکلەیە! خاصةً کە بەناوی دین، دین بە فساد ببەن! چارەی ممکن نیە! ئەوانەی (یسارعون في الكفر)ی، قابلی ایمان نین! حسد و عناد و کبر، کوێری کردونە! ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ﴾ مصرا علیە. ﴿فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ﴾ هەر کەس عملی خۆمان! چتاقمان دەسەڵاتمان بەسەر ضمیر و وجدانی ئەویتر نیە! مسیطر خوایە! ﴿أَنتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ غایتی ڕسول، تبلیغی لەسەرە، تاثیر بەمست ئەونیە! نەئێمە بەخراپەی ئێوە، نەئێوە بە خراپەی ئێمە، ئەگەر هەبێ، مؤاخذە ئەکرێین!! لاشک ئەو حکمە ثابت و مقررە، قابلی نسخنیە، نەبە آیتی (سیف) نەبە آیتی (بۆمبا)! اما (بیضاوي) ئەفەرموێ: (چونکي ایهامی اعراضي وڕێ بەردانیاني تیاهەیە، «قیل»ە و وتراوە «ئەوە منسوخە بە آیتی «سیف»»!) ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ﴾ گوێت لێڕائەگرن کە قرآن ئەخوێنی اصوات و حروفي ئەبێن، موانعی معنوی مانعە لە نفوذی معنای! وە بەتۆش ناکرێ تفقهی معنایان تیا خلقکەی! ﴿أَفَأَنتَ

تُسْمِعُ الصُّمَّ وَلَوْ كَانُواْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ کەلێ کەڕ هەن بەهۆشن عاقلن بەاشارە زۆر چاک تێئەگەن، حتا بعضە شتێوا ئەزانن انسان تعجب ئەکا، چۆنی تێگەیشتوونە؟! ﴿وَمِنهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ﴾ تەماشات ئەکا ئەتبینێ، اما لە دیتنی مآثرت، کوێرە! حقیقةً مجرداً، بیستن و دیتن، چ نیە! کەر و انسان وەک یەکن! هونەر ادراکی حقایق و دقایقی مسموعات و مبصراتە! بۆیە جەنابی حەق بە سمیع و بصیری، منەت لەسەر انسان ئەکا! نەتەنها بەگوێداری و چاوداری!! ﴿أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُواْ لاَ يُبْصِرُونَ﴾ بێنوری بصر و بصیرەت. بنۆڕنە (طه حسین)ی مصری! تەماشای (عثمان افندي) بصیری موصلی کەن، حسن دیتم داعیێ مشهورە! (العیاذ بالله) ئەوانەی بەگەورەی کوێر ئەبن، زۆر کۆڵن کۆلەوارن! ئەوانەش لە دیتنی حضرەتی محمد، بەگەورەی کوێر بووون_ کما هو هو_ نایبینن! ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا﴾ ئەمە (متفق علیه)یە لە بەینی اشاعرە و معتزلان! اما اشاعرە ئەفەرمون: (هەرچی بیکا، ظلمنیە، تصرفە لە ملکی خۆی!). لکن حق الإنصاف- آیة ئەو معنایە ناگەێنێ! ﴿وَلَـكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ ئەوەی عائدی خوایە لە اسبابی هدایت، تکوینی و تکلیفي هەموی بەجێ هێناوە، ئەمێنێ تۆزێ پێ لە نفس نان نەرم کردنی بۆ قبولی حەق. ئەوەندەی نەرمن بۆ قبولی ناحەق، عشری معشاری، کافیە بۆ هدایت و اطاعەی خوا و رسولی خوا! بەو خضوع و خشوع و خوف و اجلالە کە لەبەر دەست بوتێ یاشێخێ ڕاوەستن، بەسیە!! بێ (لم)ە، ئەو هەمو خرافات و جهالەتەی ئەچێتە دڵی، نەدەلیل، نەبرهان، نەآیت، نەرسول، نەشبهە!! بەهەزار آیت و رسل حەقێکی ناچێتە ذهن! بۆ؟! حقیقةً انسان ظالمە، هەر ظلمێ بیکا لە نفسی خۆی ئەکا! ڕەزیل و سفیل و مدنسي ئەکا، گەرچی لە اساسا جوهرێ قدسیە! ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ﴾ انذارێکە تفهیمیان بەفەرمۆو! ﴿كَأَن لَّمْ يَلْبَثُواْ﴾ نەمابوونەوە لە دونیایێ، یا لە (برزخ)، ئەگەر معذب نەبن، فافهم!! ﴿إِلاَّ

سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ﴾ ساعەتێ لە ڕۆژ. ڕۆژ وەقتي مشغەلەتە، وەقتي زوو بەسەر ئەچێ! يعني مدەێكەم، زۆركەم! ﴿يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ﴾ بەمقداری ساعەتێ، جزاێ لە زەمانی تعارف، يەك ديتن و بەسەر كردنەوە! ياخود ئەو ڕۆژە، يەكتر ئەناسنەوە! ئەمەش لە اوائلی حشرە! دواێ هەر كەس بەحالی خۆي مشغول ئەبێ! خەبەريان لە يەك نامێنێ! حياتی دونيا هەر چەند درێژە، كورتە! چونكی ئەبڕێتەوە! ئەگەر هەمو عصر، وەك عصری ئێمە بووبێ، حيات چۆن ناخۆشە وايە! لە زەتی، لە بلاهەت، يا لە غفلەتە! بۆ ئەو حياتە، خۆ محروم كردن لە حياتێ لذيذ ابديی، خسارەت مەنديە!! ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَاء اللّهِ﴾ ڕۆژی جزاء! واقعاً ئەوانەی انكاری (حشر) ئەكەن، هەر خۆيان ئەزانن لە چكيفێك دان!! بێ المی وجدان، گوناهو سفاهەتو سيئات ئەكەن! ئەوی ايمانی بە جزاء هەبێ، شهواتی بهيمائی، بێكدورەت نابێ!! ﴿وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾ ڕێيان بەچاكە نەبردووە، اختياری دونيايان كردووە_ مع انكار الآخرە_! ﴿وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ﴾ لە عذاب. نيشانت ئەدەين، پێش وەفاتت، بەسەريان دێ! ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ بێنيشاندان! ﴿فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ علی الحالين! تۆ مداخلەت نيە ايمان نەێنن، محققاً ئەيچێژن! ﴿ثُمَّ﴾ پاش وەفاتی تۆ ﴿اللّهُ شَهِيدٌ﴾ (وحدە دونك!). ﴿عَلَى مَا يَفْعَلُونَ﴾ لە چاكە لە خراپە! ياخود لە سيئات! مقصد وەك (سيدي آلوسي) ئەفەرموێ: (لەم شهادەتە، جزادانە!). ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ﴾ حتا (كورد)! ﴿فَإِذَا جَاء رَسُولُهُمْ﴾ لە دونياێ (بالبينات)_ كما اختارە الرشيد - يا لە موقف - كما قالە السيد المحمود_لعلە لەگەڵ ظاهري ﴿قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ﴾ عدل، نصيبێ تەواوی! ﴿وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ انسبە!! وە معناي (مختاري) (رشيد)يش، تفصيل فەرمووە! ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَـذَا الْوَعْدُ﴾ ای دونيا، يا اخري! لكن نظر بەآياتی تاليە، عذابی دونيا اظهرە! ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ (ايا كان) نيشانمان بەسەرمان بێنە! ﴿قُل﴾ لە جوابيان. ولو

سؤاليان لە مجد و استهزاوە بێ، تۆ بە جدى تلقى كە! ﴿لاَ أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا﴾ فكيف لغيرى؟ فكيف بەو نوعە امورە، كە محضاً فعلى الاهيە؟ ﴿إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ﴾ وەقتێ حەزبكا قوەتم داتێ، اسبابم مهيابێ، ئەوسا بە ضربى بازوو بەشمشيرى ئابدار، تالآوى مەرگيان پێ‌ئەچێژم! ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ﴾ تازە نشاتبكا، يا بەكمال گەيشتبێ ﴿أَجَلٌ﴾مدەێ. مقدار ێ لاى خوايە! ﴿إِذَا جَاء﴾ بێ (ف)ێ! ﴿أَجَلُهُمْ﴾ تقررى كرد. ﴿فَلاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً﴾ ادنى زەمانێ! ﴿وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ هيچيان بەدەست خۆيان و اختياريان نيە! (ساعة) ئەگەر تكاملە ئەگەر تناقصە، تدريجيە! بە لآم اجلى ئێوە محقق دێ، بحولە تعالي) ئێمەش تكامل ئەكەين.﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ﴾ خەبەرم دەنێ!﴿إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُهُ﴾اى خوا! عذابى خواى انواعى هەيە! ﴿بَيَاتًا﴾ شەو. ﴿أَوْ نَهَارًا﴾ ڕۆژ. زاتاً ڕۆژيان وەک شەو، هەر بەبێ خەبەرى ئەڕوا! ﴿مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ الْمُجْرِمُونَ﴾ كامە نوعيان ئەوێ؟ فائدەى ئەو استعجالە چيە؟ عذاب ناخۆشە! چۆن تالوكەى بۆ ئەكرێ؟ ﴿أَثُمَّ﴾ ئايا پاشان؟ يعنى ﴿إِذَا مَا وَقَعَ﴾ كە عذاب واقعبوو هاتە سەرتان ﴿آمَنتُم بِهِ﴾ بە قرآن، يا بە عذابى موعود! ﴿ ﴾ إيمان دێنن بە مجبورى مضطرى! ﴿وَقَدْ كُنتُم بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ زێرا قطعياً جوازتان نەدەدا، نەعذابى دونيوى، نەعذابى اخروى، بنا بەوەعدەى ئەو ذاتەبێ! لە پاش ئەو انكارە شديدە كە واقعبوو، ايمان دێنن، معانە لە دائرەى ايمانى نظرى دەرئەچێ، ئەبێتە عيانى! كەوابێ وەک (طيبي) ئەفەرموێ: (لێرە «نستعجلون»ە لە «تكذبون»ە ابلغترە!)، گەرچى بادى النظر دێتە خيالّ لەبەر مقابلەى ايمان ئەبوايە بفەرموێ «تكذبون»، ذاتاً استعجاليان لەبەر شدەتى تكذيب بووە! ﴿ثُمَّ قِيلَ﴾ پاش وقوع و حلولى اجل، يعني لە ڕۆژي جزا! ﴿لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ لە نفسى خۆيان! خوا ظلمى لێ‌نەكردينە! ﴿ذُوقُواْ عَذَابَ الْخُلْدِ﴾ دائمي ابدى! ﴿هَلْ تُجْزَوْنَ إِلاَّ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ بەاختياري خۆتان! اشاعرەش ئەفەرمون (كسب) اختياريە! اما

(کسب) ئەکەنە (قصد)، معانە (قصد) و (ارادە) مقدمەی افعالی کسبیە! وە کسب و خلق ئەهاوێنە سەر یەک شت، وە ئەو وەقتە معنای (کسب) نامێنێ! با وجودی ئەبێ خلقی خواو کسبی عبد، متعلقیان جوایەزیێ!!

﴿وَيَسْتَنبِئُونَكَ﴾ طلبی خەبەر دانت لێئەکەن! ﴿أَحَقٌّ هُوَ﴾ وایە ئەو عذابە چدونیوی چاخروی، بۆ ئەو معاندانە ئەبێ؟ ڕاستە؟ یان هەروا ئەیان ترسێنێ بۆ خاطری إصلاحیان؟! ﴿قُلْ إِي وَرَبِّي﴾ ئەدی! سوێند بەربی خۆم ئەخۆم!! ﴿إِنَّهُ لَحَقٌّ﴾ بێتاویل و بێصرف لە حقیقەت. سوێند حجەتێ قوتی نیە! حتا لە «فقه» بەس تایدی اصلێکی پێئەکرێ کە براءتی ذمەیە، بۆیە (ولو بعد الحلف) مدعی شاهد بێنێ، قبوڵ ئەکرێ! لکن بعضە مواقعێ هەیە نظر بە بعضێ اشخاص، قسم جێگای دەلیل و برهان ئەگرێ! هەندێ کلماتی اقناعیە هەیە، لە برهان چاکتر ئەچەسپێ! علمای (کلام) و (منطق) لەوە غافلنین!! وە ئەوانەی سؤالیان کردوە، ئەگەر خۆیان ڕاستگۆ بووبن، وە شارەزاییان بووبێ بەمیلی ڕسالەت پەناە، لاشک ئەو سوێندە تایثریان تێئەکا، بڕوا ئەکەن، وە ایمان دێنن، وە الأ، فلا!! من گەلێ جار لەسەر دەرسی فەقێیان گلەیی لە بعضە نظاری ئەکەم کە خەریک ئەبن هەرچی کەوتە بەر نظریان، بەقیاسێ قطعی اثباتی بکەن! باوجودی لەگەلێ جێ، ناچێتە سەر!! ﴿وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ چتان پێناکرێ، بەهیچ وجە قورتار نابن، خوا عاجزنیە لە عذابی ئێوە، وە پێتان بێ هێز و دەسەڵات ناکرێ! فاعل، قوی! ئێوە، مستحق! مقتضی، بێمانع! بۆ نابێ؟

﴿وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ﴾ لە نفسی خۆی، مدنیسی کردبێ، کەڵکی ایمانی پێوە نەهێشتبێ! ﴿مَا فِي الأَرْضِ﴾ هەموی هیئەوبێ! ﴿لاَفْتَدَتْ بِهِ﴾ پێی لە عذاب قورتاربێ، ئەیکاتە فدای خۆی، بەڵام معالأسف فدیە قبوڵنیە! ﴿وَأَسَرُّواْ النَّدَامَةَ﴾ یعنی لە عمقی دڵەوە، پەشیوان بونەوە. زاتاً ندامەتی جهری ئەگەر لەگەڵ سری نەبێ، ندامەت نیە! ﴿لَمَّا رَأَوُاْ الْعَذَابَ﴾ کەدیتیان،

ئەو جاجێی انکاری نەما! ﴿وَقُضِيَ بَيْنَهُم﴾ لە طرف خوا، بەینیان کرا! ﴿بِالْقِسْطِ﴾ بەعدل، بێطرف داری. ظالم و مظلوم، تبین ئەکات! ﴿وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ لە جهەت جەنابی حەق. اما خۆیان کردووە! با کەس توهم نەکا، طرفداری ڕسولی خۆی ئەکا! زێرا ئەو رسولەی، بۆ خاطری وان ناردبوو، ئەگەر پەیرەویان کردبا، ناجح ئەبوون!! ﴿ألا إِنَّ لِلّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەموی ای خوایە! عبد و مملوکن! رسول و قوم وەک یەکن! میل و محابانیە! نسبەتی اساسي یەکە! باخەڵکی سعیکا، گوێ لە حەقکا، تاکوببێتە مظهری فیض و لطفی حەق! خوایێ مالکی علویات و سفلیاتبێ، فدیە قبوڵ ناکا! ﴿أَلاَ إِنَّ وَعْدَ اللّهِ حَقٌّ﴾ دێتەجێ. کەس مانعنیە. خوایێ قوی و قاهر بۆ وەعدەي نایەتەجێ؟! ﴿وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ بەلام هەرچی ئەیڵێن و ئەیکەن، لە بێ علمییانە! نابینن ﴿هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ شبهەينیە، شتێ فطریە، عائدی فاطرە! ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (منە المبدا والیە المنتهی). خە ڵکی دیچی؟ هیچ!! وەک حضرەتی امامی (علي) ئەفەرموێ: (رحم‌الله امرأً عرف من أين و [illegible] أين وإلى أين). ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ مؤمن و کافر، بر و فاجر، شاهد و غائب، حرّ و عبد! ﴿قَدْ جَاءتْكُم مَّوْعِظَةٌ﴾ نازانم بە (کوردی) لە جێی (وعظ) بڵێمچی؟ ﴿مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بۆیە بێ افراط و تفریطە! هەر واعظێ بەگوێرەی میلی تجاوز ئەکا لە حد! ﴿وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ﴾ لە امراضی قلبی. دڵ لە رزائل لە قسوەتی جاهلي، لە انوثەت و خنوسەتی مسیحیین، لە بعضی متصوفینی، لە حسادەتی مەلایانی متحسدین، پاک ئەکاتەوە!! لاشک لێرە ئەوە مرادە، نەک شفا لە امراضی و ناصاغی جسدی! بەڵێ آیاتی شفاء دەنوسرێتەوە، زۆر وا ئەبێ نەخۆش، دوای سوانەوەی، ئەیخواتەوە، خوا شفای ئەدا! حضرەتی (کاکە احمدي شێخ) ئەیکرد وە اجازەی دابوووە بعضێ زەواتیکرام، یەک لەوان (بابم) بوو، یەک لەوان (مامۆستا مەلا احمدی اۆمەر گومبەدی) بوو ـ ڕەحمەتی خوایان لێبێ ـ. بەڵێ وایە، بەلام

خوای تعالان بۆ شفای دەرد ناصاغی، قواعدی داناوە! اعتنا بەوان، لازمە!! اما مع الأسف ئێمە حالاً، محرومین! معنویاتمان چوو، مادیاتمان نەبوو!! ﴿وَهُدًى﴾ عینی هدایەتە، ڕاەنومایە، ڕێی چاک و خراپ نیشانئەدا، (فاختر لنفسك ما يحلو أو يجلو)! ﴿وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ زاتاً اهلی ایمان خێری لێ ئەبینن، مادی معنوی ڕوحی بدنی اعمالی خصال، ئەوان نوری لێ اقتباس ئەکەن!! ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ﴾ ئەو قرآنە بەو مزایای عظیمەوە، هاتوتە سەر ئێوە، کن ئێوە! لای من وا خۆشە حرفی جر متعلق بێ بە (جائتکم). ﴿فَبِذَلِكَ﴾ بەهاتنی قرآن. ﴿فَلْيَفْرَحُواْ﴾ لای اهلی علم آیەتێ بزانێ، احاطە بەعلمیدا، لە دونیا خۆشترە! وەکی حکماء ئەفەرموون (لە زەتی عقلی، قیاسی لە لەزەتی حیسی، ناکرێ!)، کمالات جوهری انسانە! ماڵ شتێ زائلە، لەبەر ارازل نەبێ، چ نیە! گەر خودا کرم بکا بۆ حفظی نفس، لە ذللەت و ڕەزالەت، زۆر باشە، زیاتر، چ نیە! مشقەت و دەردی سەرە! ﴿هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ اهتدا بە قرآن، چاترە، نافعترە، لە ماڵی دونیا! خڕی ئەکەنەوە، خێری لێ نابینن، حتی سبب بەبێ هدایەتی حتا ئەوەی خوا بۆیان ئەنێرێ، نازانن نەدنیاً نەدونیاً، حسنی تصرفی تیابکەن!! ﴿قُلْ﴾ ئەی (مهبط)ی قرآن و (وحي) الاهي! ﴿أَرَأَيْتُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ﴾ بێمداخلەی هیچ کەس! ﴿لَكُم﴾ بۆ نفعتان! ئەوەی لە طرف گەورە وە بێ، ولو لە عەردە و دەرکوڵێ، تعبیری بەنزول ئەدرێتەوە! ﴿مِّن رِّزْقٍ﴾ انواع! لە نباتات، لە حیوانات! ﴿فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلاَلاً﴾ بەو نوعەی کە کردووتانە. ئەڵێن: (ئەمە بۆ آلهە! لە غیری وان حرامە! ئەمە بۆ ژنان، ئەمە ذکور، ئەمە مشترک!). ئایا ئەو آلهانە چ مداخلەی خلقی ڕزقیان هەیە؟ حیوان لەوان اشرف ترن، بەڵکو نباتات لە حالی (نما) دا، لە اصنامتان قیمەت دارترن!! کەسێ تەماشای حاضربکا، ئەزانێ گەلێ احکامی وان، لە احکامی جاهلیەت بالاتر نیە! خصوصاً (عطری خۆشبۆی خودا)، بەهیچ ناچێ! گاجوتێ

بەهەمو پێست و قۆ چ وسم و چەوراى، ئەسوتێنن ئەڵێن: (ئەمە عطرى خۆشبۆي خودايە!). پف لەم عطرە! انسان لە بۆنى، معدیى تێک ئەچێ هێڵنجى دێتێ!! ﴿قُلْ آللّٰهُ أَذِنَ لَكُمْ﴾ وەک بنى اسرائيلى ئەڵێن: (ئەمە، امري الهەيە! وەک خاصةً تداوى «كمه وبرص» حقاً بەچاكى يعنى صرفى كليان، تايبەتيە، دخلى الاهى بەسەرەو نيە!) ﴿أَمْ عَلَى اللّٰهِ﴾ كە گومان ئەبەن، ئەو لە ئێوەى حرام كردووە! ﴿تَفْتَرُونَ﴾ ديارە اذنى خواىنيە، كەوابێ افترايە! كەسێ بزانێ خوا حكيمە، كەشتى بێمعنا نسبەت بۆ ئەودرا، ئەزانێ درۆيە هەڵبەستەيە! (سيد رشيد) ئەفەرموێ: (اذن نيە، چونكى ئێوە انكارى و چى ئەكەن)! ﴿مَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّٰهِ الْكَذِبَ﴾ درۆبە زوبانى ئەو هەڵ ئەبەستن ئەڵێن: (خوا وا ئە لێ!) ئەڵێن: (حدثنى قلبى عن ربي!) ئەڵێن: (ئەوەندە ساڵەيە قسان لەگەڵ خواى ئەكەم، خەڵكى وا ئەزانن قسانە لەگەڵ وان ئەكەم!) ئەڵێن: (خوا شانى كن فكانى، دلوەتەمن، داوەتە فلان، «اذا ارادشيئاً ان يقول له كن فيكون»)!! ئەبێ ئەوانە ظنيان بەخوا چبێ؟ ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ چيان لێئەكا؟ ﴿إِنَّ اللّٰهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ﴾ مؤمن و كافر! غدر و ظلم لە كەس ناكا! بەخلق، بە رزق، بەقوا، بەعقل، بەارسالى رسل، امداديان ئەدا! جبريان لێناكا! بەاختيارى خۆيان، رێيچاكە يا خراپە، بابگرن!! ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ﴾ هەر قومێ بێ! ﴿لَا يَشْكُرُونَ﴾ شكرى خودا ناكەن، نسبەتى اشياء، بۆ غيري ئەو ئەدەن! مثلاً ئەڵێن: (بەهمتى شێخ، نائلى هەموشت ئەبين!)، كەوابێ خوا ئەگەر ئەمانە بەاشدى عذاب عذاببدا، حەقيەتى! ﴿وَمَا تَكُونُ﴾ (ايها الرسل!). ﴿فِي شَأْنٍ﴾ لە شئونێ عامە، ياخاصە، مهم و مقصود، معتنابە!! ﴿وَمَا تَتْلُو مِنْهُ﴾ لەبەر ئەو شانە! يا لە طرف كبريائى! ﴿مِن قُرْآنٍ﴾ كە بۆتى ئەنێرى، بيخوێنى و تبليغىكەى! ﴿وَلَا تَعْمَلُونَ﴾ ئەى امتى دەعوەت! يا عام لە رسول و مرسل اليە، مؤمن و غيرە مؤمن! ﴿مِنْ عَمَلٍ﴾ هەر عملێ ببێ! چاكە، خراپە، ظاهر، خفى ﴿إِلَّا كُنَّا

عَلَيْكُمْ شُهُودًا﴾ ئاگادارین بەتەواوی، بێ نقص و خلل، کەم و کورتی! ﴿إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾ وەقتێ شروعی تێئەکەن. (سیدیآلوسي) ئەفەرموێ: (ئەم دیوە کەس تعرضی کردبێ بۆ بیانی وجهی اختیاری نفی بە «ما» لە دوو جملەی پێشەوە، وە بە«لا» لە جملەی ثالثدا!) وەئەفەرموێ: ( اختلافی خطابە! لایەق بەخطابی امت، کە دەوامی ئەبێ_ الي ما شاء الله_، نفی، بە«لا»یە، کە بۆ استقبالە_ لای اکثر_، وە«ما» بۆنفی حالە ئەگەر قرینەی صارفە نەبێ!) ﴿وَمَا يَعْزُبُ﴾ دوور، نابێ! بزر، نابێ! ﴿عَن رَّبِّكَ﴾ لە خوای تۆ! ﴿مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ﴾ گێرکە، ذەرنووقەکە لە ناوتیشکی ڕۆژدێتە ناوهۆدە! ﴿فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء﴾ لە هیچ جهەت و طرف! ﴿وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ﴾ وەک کچکە ترینی مکرۆب! ﴿وَلا أَكْبَرَ﴾ لە صفردا! وەک هێلکەی مکرۆب! وەک کوردی ئەلێ (سەر ئەنگوستێ) ﴿إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ کتابی اصلی. کائنات هەموی، لە عملی خوا ظاهیر و نەمایانە! ئەوانەی شکری ناکەن و بەهدایەتی کیف خۆشی نابن، خۆیان و اعمال و منویاتیان، لای خوا ئاشکرایە!! پێرێ کەوتە بەرچاوم، (فخرالدین الرازي) لە تفسیری سورەی (کهف) نقلێ ئەفەرموێ لە (هیشام بنحکم) کە: (خوا «قبل الوقوع» حوادثی جزئیە نازانێ)! بعضە توجیەی، نالێم دلیلی، پڕوپوچی ذکر کردووە بۆ اثباتی مدعای خۆی، گەر خوا عمردا، لەوێ عرض ئەکرێن!! ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ دڵیان شیفایابە بەموعظەی الاهی. بەفضلی ئەو مسروورن. ئەوەی اعدای خوای لێی ئەترسن، ئەوان لێی ناترسن! ئەوەی اعدای خوای بۆی عاجزن، ئەمانە بۆی عاجزنین! مبالاتیان پێی نیە! (قل بفضل الله و برحمته فاليفرحواه علي الرأس و العين)یە. اولیاء، کێنە؟ ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ کافیە، لە جواب! ئەوەی ایمانی هەبێ، بەایمانێ دروست، بێشک و شبهە و نفاق و شرکی الاهێ عالم بەکلی اشیاء قبل الظهور، ایمانی بەحضوری الاهی، لە دڵیا راسخ بێ، هیچ ئیشی خراپە

ناکا!! له چاکه بێدرێغ و قصور ئەبێ! لەبەر حیا له خوا! علمی بەخوا، ناکاته مایەی اقدام لەسەر معاصی! کشفی سری قدر، مشاهدەی لوح المحفوظ که ئەڵێن: (شەو ڕۆژ (٣٦٠) سێ صه دو شەصت جار منظوری نظری خودایه)، سوقی ناکا بۆ عصیان! حاصلی له اعتقادیات و عملیات، پاک و خاوێن ئەبن! خوفی غیریخوا، استلای وان ناکا! خاصة خوف له آلهەی موهومه، له اولیای مزعومه، خوف لەوانه، وەک خوف له (غول) و (مێردە زنۆکه) بەدڵیان داناێ! بۆ دونیا محزون نابن! له فزع و جزع ناترسن، غەمگین نابن! بەدونیا پابەند نابن! دونیاشیان بۆ دینیان ئەوێ! بەفضلی خوا، کیف خۆشن! آیاتێ له آیاتی خوا بزانن، قبسێ له نوری هدایەتی قرآنی وەرگرن، بەهومو دونیای نادەن!! اولیاء الله، له خوا ئەترسن! لەسەر فواتی خیر، محزون ئەبن! ئەمڕۆ بۆ حاڵی مسڵمانان، ئاگریان له جەرگی بەر ئەبێ! حتا (شێخي عەرەبی) ئەفەرموێ: (اولیاء تا نەچنه ناو بەهەشت، امین نابنن، و حزنیان ناڕوا! که چوونه ناو بەهەشت، ئەوجا ئەڵێن: «الحمد لله الذي أذهب عنا الحزن» ﴿لَهُمُ الْبُشْرَى﴾ بۆ مؤمن ومتقی وولی الله! ﴿فِي الْحَياةِ الدُّنْيا﴾ یا خوا بەزیاد نەبێ لەو کەسەی که تفسیری (بشری)، بەس بەخەون ئەکاتەوە! (معانه) خەو نەکانیش وەک کرامەتەکان هیچ و پووچ دەرچوون، چیوامان نەدیت خێری لێببنین! (ابن جریر) و سائری محققین، (بشارەت) عام ئەکەن! ئەوانەی (ولي الله)ن، موژدەیان لێبێ بەفتح و استلای (انام)، بەسەر بەرزی لەسەر ئەرزي ئەژێن (لاخوف علیهم ولاهم یخرنون)! حقیقةً تا (اولیاء الله)ی بەڕاستی بووین، واژیاین، عالەم له مسڵمانان ئەترسا، ئەوان ترسیان نەبوو! که (ولایته) که بووه خرافات، ئیش گۆڕا! بن کەوتین! (اولیاء) له ئۆغری دین، ڕوح و ماڵ صرف ئەکەن، پێی مسرور ئەبن، چ جاێ پێی محزون ببن؟! بەحیاتێ خۆش راي ئەبوێرن! کدورەتیان نیه، گوزەرانێ بسیط، بێنتیجەی توخمه و دەرد و بەڵا!! ﴿وَفِي الآخِرَةِ﴾ موژدەیان لێبێ بەرضواني خوا -ورضوان من الله اکبر-

هەموی تیایە! حاصلی ئەوانە نائلی سعادەتمەندی حیاتی دونیاو آخرەت ئەبن، لە عذابی غضبی الاهی مصونن! ئەوانەی (اعداء الله)ن بەمقابلی وان، دووچاری شقاوتی دارین ئەبن! ﴿لاَ تَبْدِيلَ﴾ (بوجه من الوجوه)! ﴿لِكَلِمَاتِ اللَّهِ﴾ بۆ فەرمودەی خوای، تغیر و گۆڕان نیە! جوازاتی خیاڵی، مقابلی وەعدی الاهی عالەم، تاثیری نیە! ﴿ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ بەحصر! (ذلک) لای حقیر اشارەیە بۆ ایمانی مع التقوی، (بشری) و (تبشیر) و (ما بە البشری)، ثمرەی ئەوەیە!! جەنابی حەق تعریفی (اولیاء الله)ی کرد بێقەیدٍ و شرطی کرامات و خوارق و فوارق_ ولاتبدیل لکلماته_ و معلومیشه خاصةً بۆ علمایان مقصود لەو تعریفه چیه_ (وذلک هوالفوز العظیم)_، ومع هذا باسی اولیاء الله و کرامەتی اولیاء الله وحکایەتی اولیاء الله بووە ژەهری هەلا هل، بۆ هەیکەلی اسلام، بۆ زیادە اتحادی مؤمنین، بۆ سعی وتێکۆشنی لە اسبابی مادی اعتمادیاندا سەر اولیا و سەر کرامەت، ڕوویان لە مادیات وەرگێڕا، وە مەلایانیش خۆبەخۆ بوونە عدوی یەک تکفیر و لعینی یەک ئەکەن. (ابن تیمیه) و اشیاعی طعن ئەدەن لە ئەوانەی وەک (شێخی عەرەبی) و (ابن فارض) وە ئیتر، کە بعضە اقوالی نامعقولیان لێ نقل کراوە! حتا (شێخی ابن تیمیه) لە حەق (شێخ محیی الدین عەرەبی) ئەڵێ: (طاغوت)! طرفدارانی صوفیه تضلیلی (تیمیون) ئەکەن! ئەو خلافە، ئەو اعتمادە، عاقبەتی زۆر خراپبوو! ئۆباڵی زۆری، لە ئەستۆی (شێخی ابن الحجر) و (شێخی شعرانه)یە! ئەوان بەجارێ دوای خیالات کەوتوونە، لە وادی کرامەت، گووم بووین!! کرامات ئەگەر لە ئەوەندەش ڕاوەستابا، باشبوو! لکن تجاوزی لە حد و حدود کردووە! مستبعد، هیچ! مستحلیش، بەکرامەت ئەبێ! (سبحان الله) ئەوەی ممکن نەبێ، هەر مقدور نیە! چۆن ئەبێ؟! کە محال، واقعی بێلای، نەدین دەمێنێ، نە (علي)، نە (وەلي)!! ئەگەر تصوف وابێ، لەگەڵ ڕوحی اسلامیەت، موافق نابێ! و ڕوو لە دونیا وەرگێڕان، بەریاضەت مشغول بوون، بۆ شەل و کۆر و سەقەت و بێ هێز و

قدرەتان، باش‌بوو وەک اصحابی (صفە)! بۆ ئەوانی تر، نابێ!! ئێمە لە عالەمی مادیاتین، (باشیر بەشمشێر سخن باید گفت)، بەخوە ئاسینی سارد نەرم نابێ! بەاشارەی (عمرو) و (زید)، طیارە سقوط ناکا! دانەی طوبی شرابنێل، بەدەست ناگیرێتەوە! بلاد بەهمت وممەت، محافظە ناکرێ! ئەمرۆ ئێمە احتیاجیان بەکراماتی (اختراعات) هەیە، اختراعاتێ، فوقی اختراعاتی اجانب، بۆ خاطری لە ژێر دەستی دەرچین و سەرکەوینەوە!! نازانم بۆ اولیاء اللەی ئێمە، کشفی ارضی (سمیان)کرد، بۆ کشفی (امریکا)یان نەکرد؟ تا ئەو حورمەت و احترامە بۆ ئێمەبێ!! وەهەم اولیاء اللەیان لەو مقامە تقسیم کردووە بەپێنج تقسیم: (١) أقطاب (٢) اوتاد (٣) ابدال (٤) نقباء (٥) نجباء. لێرە (سیدي آلوسي) تایدی بوونی ئەوانە ئەکا، بەحدیثی مرفوع و موقوف و مرسل و آثاری (تابعین) و من بعدهم! باوجودی گروهێ لە علماء ئەڵێن: (حدیثي معتبر، دائر بەبوونی ئەوانە، نی یە! وەنین!)، وە (آلوسي) خۆشی اولاً لەم گرۆهە بووە، دوایێ پەشیمان بووتەوە، وە تایدی بوونی کردوون!!. لە (بغدا) سؤالم لە جنة مکان حفیدی «آلوسي، شکري افندي»کرد: (باپیرت بۆ لە قولی سابقی پەشیمان بۆوە؟) فەرموی: (من ڕاست ئەڵێم، ئەو قولەی دوایەی بەدڵي نەبوو، اما عظمای رجالی عثمانی اعتقادیان بەصوفیان زۆربوو، انکاری ئەوانەیان لا خۆش نەبوو، بۆ خاطری نفرەت نەکەن لە تفسیرەکەی، گەڕایەوە!). من کە ئەو قسانەتان عرض ئەکەم معنای وانی‌یە کە اعتقادم بەکرامەت نیی یە! من ایمانم بەکرامەت هەیە، اما بە ئەندازە، بۆ خزمەتی دین! وەک ندای حضرەتی (عمر) بۆ (ساریە). وەهەم ئەڵێم: (با «ولي» اقسامی هەبێ، بەڵام ئەو وەظیفانەی کە بۆیان مقرر ئەکەن، خۆی نی‌یە!!). عزیزانم تێبگەن! تێبفکرن! بەئیشی بێ‌فائدە و بێ‌استفادە بەقسە و قسەرۆکی نامعقول، خۆتان مشغول مەکەن! تێکۆشن! بزانن کە ئە مرۆ دەردتان چیە؟ دەرمانی بەچی ئەکرێ؟ تەماشای صنعی بشرکەن! چیان‌کرد؟! چیی ئەکەن؟! بەچی بەسەر ئێمەدا غالب

بوون؟! ﴿وَلاَ يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ﴾ ئەگەرچی (مؤذي)یە، مستلزمی حزنـە،! مُقـابلی دەعوەت و آیاتی بینات، قسەی بەقەشمەری لە زەمانیبێ سـەلاتـی، زۆر محزنە!! بۆیە عبارەتی وا داناوە نەیفەرمووە (لاتحزن بقولهم). حقاً قـسەیـان گرانە، قورسە لەسەر دڵان، غەم و سستی ئەدا، لکن جـەنـابی رسـولی اکـرم صاحبی عزم و صبر و ثبات، بەقسەیان متاثر نابێ، خاصةً خوا نهـی لێبکـا، رێی حزن نامێنێ! بۆ قسەیان عاجزت نەکا؟ ﴿إِنَّ الْعِزَّةَ لِلّهِ جَمِيعًا﴾ رسـولی خۆی و اتباعی، لە ذللەت نجات ئەدا! عزیزیان ئەکا! بـە قـووەتیـان ئـەکـا و غالب ئەبن! ﴿هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ چی لێ بزربابێ، لە احوالاتی جارییە! هـەر کەس بەجزای سزای خۆی، ئەگەیێنێ! ﴿أَلا إِنَّ لِلّهِ مَن فِي السَّمَاوَات وَمَن فِي الأَرْضِ﴾ قطب واوتاد وابدال ونجبا ونقبای ئێمە، ئەگەر هەبـن!! وە ئـەوانـەی بەعقڵ و قوەت و دەسەڵاتن، کە گەلێ کلی ئەوانـە، بـە آلهـە ئـەزانـن، ملکـی خوان و مخلوق و عبدن! وەک جماداتەکان! بەعزت و غلبەی خۆی، ادارەیـان ئەکا!! ﴿وَمَا يَتَّبِعُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ شُرَكَاء﴾ لە حقیقتدا شـریکی نیـە، تابعی چ بن؟ ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ﴾ ظنێ واهی ـ علـی کـیفهمـ! ﴿وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ﴾ درۆی ئەکەن! ئەزانن درۆی ئەکەن! ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ﴾ شەوی بۆ ئێوە داناوە. ڕووناکی ڕۆژ لەسەر عـەرد نـامێنێ! ﴿لِتَسْكُنُواْ فِيهِ﴾ ئـارام بگـرن ایـستیراحەت بکـەن، لـە تعب و ماندیـەتـی ڕۆژ، بحـەسـێنەوە! ﴿وَالنَّهَارَ مُبْصِراً﴾ ڕووناک. چاو هەڵدێ، قووەتی عودەت ئەکاتـەوە، دەمـاری بەهێز ئەبێتەوە، سستی نامێنێ! ئەوجا دەست ئەکەن بە گەڕان بۆ کسابەت و گوزەران! ئەمە، پێی ئەڵێن (صـنعة الإحتبـاک) زۆر جووانـە!﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ لەم (جعـل)ە! ﴿لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ آیـاتێ زۆر، بـۆ قـەومـێ گـوێ دێـرا! قەومێ عاقل اوضاعی فلکیان، بەحسی، مـشاهدە کـرد! بـەخـیـاڵ، تنظیمیـان دائێ! نهایەت ئالەتی رصدیان اختراع کرد! دقایقێ عجیبیان بـۆ انـسان، هێـنـا قەلەم! قەومێ وحشی، بێهۆش و گۆشی، بـەپێگـرتنیش، تێـی ناگـەن! هـەر

وەک کوێرن، نەزانیشن! ئێوە و خودا ئەم وضعە تکویری لیل و نهار، بەکەس ئەکرێ؟ خوا ئەیزانێ بەهەمو عالەم ناکرێ!! ئەو نظام و انتظامە، عائدی (علی الأعلی)یە! کاری حضرەتی (کبریا)یە!﴿قَالُواْ اتَّخَذَ اللّهُ وَلَدًا﴾ ذکر، انثی! اولاد الله، ابناء الله، احباء الله اولیاء اللەی ادعائی، هەموی لە وادیێکن!! لە اتباعی هوایە، میلی کاذبە!! أساساً لە میانی (وثنیان)ی مدنی، بۆ ادارە و سیاسەت و تشجیع، الحاقی بعضە کەسەکیان ئەکرد بەآلهە یا ابنای آلهە! وەک ئێستا کە بۆ اربابی هونەری فوق العادة، هیکەلێ دروست ئەکەن. لکن ئەوەی مشرک بووبێ، ایمانیان بەخوای (فوق الکل)بووە! ئێستا لە ناو ئێمە، گۆڕاوە! شریکی أعظم، غیری خوایە! خوا تابعی میلی وانە! ئەوەی ئەوان بیانەوێ، خوا ئەیەوێ، هەرچی ببێ! ئەوەی ئەوان نەیانەوێ، (خوا)ش، نایەوێ! با (ملاذ الإسلام) و (علامەی جهان)بێ!! نازانم ئەمە بۆ وایە؟ ئەگەر لە خوا بگەڕێن، خوا کاری خۆی حسب الأصول ئەکا! کە امری (شێخ) هاتەناو، بەجارێ ئەگۆڕێ، قواعد و اصول نامێنێ، هەموی تێک ئەچێ! بە لێ خیاڵ و اوهام، هەموشت ئەکا! بەڵام بێاصلە!! ﴿سُبْحَانَهُ هُوَ الْغَنِيُّ﴾ ولی و ولدی، بۆ چیە؟ نامرێ، تا ولدي بێتە جێنوشینی! قاعدەێ طبیعیە، ئەوەی ولدي ببێ، ئەمرێ! عاجزنیە لە ادارە! کەس ناکاتە شریکی شئونی خۆی!! خوداوەندا چۆن مەلاێ ئەتوانێ بڵێ: (خوا شانی خۆی، مثلا وەک امری «کن» ئەواتە عمرو و زید؟ لا الە الا الله شان چۆن ئەدرێ؟! جەنابی حەق لە شئونی ذاتیەی، اختیاری نیە! چۆن بەخەڵکی ئەبەخشێ؟ هەر چەندي عبادی خوای هەیە، بڵێن: (کن)، بەولفظە چییان پێناکرێ!! امری تکوینی، لفظي نیە! امری لفظی مخالفەی ئەکرێ، حتا امری خوا!! ایمانیان بەعمومی قدرەت بۆێیە، چە شم بەندی خە ڵکی پێبکەن! خوای واجب الوجود، لە ذات و ذاتیاتی، محتاج بەهیچ نیە! (فوق الطبیعة)ە، بەبەر قواعدی طبیعەت ناکەوێ! ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوات وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ جامد و نامی، اصول و فروع، بسیط و مرکب، محصولی

طبیعی و کیمیائی و میکانیکی هەموی ای وییە! ولدی بۆ چیە؟ ولی بەو گوێرەی ئەڵێن، چ حاجەتی پێهەیە؟ ﴿إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَانٍ بِهَـذَا﴾ حجەت و برهان نیە، حاشا! دەلیلی قاطع، برهانی ساطع، لەسەر وحدانیەتی، زۆرە! عالەم بەامکان و حدوثی، شاهدە! ولی کە(العارف بالله، المواظب علی طاعتە، المجتنب عن معاصیە، وعن الإنهماك فيالللذات) بۆ ئەبێتە مدبري انام؟ معانە و ئەوانەی ایامی ئێمە، جاهلی باللەن! دوورن لە طاعەت! بەڕاستی ڕوو چووون لە معاصی ولذاتی بهیمی! لەگەل ئەوەش (ولي)ن و آمري علی اللەن؟ کوا دەلیل؟ کوا برهان؟ کوا سلطان لەسەر ئەو هذە یاناتە؟ ﴿أَتقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ خوا ئەزانێ، سفهای ئەو ایامە، ئەزانی، وانیە! وەدەربارەی خواش، ئەیلێن! قسەیان لە خرص و گومان و هە میش. بەدەرە!! ﴿قُلْ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ﴾ ئەڵێن: شریک، ولد، ولي، هەیە! ﴿لاَ يُفْلِحُونَ﴾ لە آخرەت. لکن لە دونیا حقیقةً نائلی حفظی خۆیان بوون، بونە مالک الرقاب صاحبی مبانی شاهقە، وەک (فاتیکانی) پاپ! خوا ئەیزانێ قفصی زێڕو قبەی بنای دەرەوەی ئەدرە و شێتەوە وەک سراب، هەموی لمعانی کذب و افترایە، شعشعە ئەدا!! ﴿مَتَاعٌ فِي الدُّنْيَا﴾ بەکەیفی خۆیان، چۆن ئارەزو ئەکەن، وا لە متاعی دونیا استفادە ئەکەن! ﴿ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ خاک بەسەر بەهەشت فرۆشان! دەچنە کێ؟ بستێکیان لە بەهەشت بۆ نەماوە!! ﴿ثُمَّ نُذِيقُهُمُ الْعَذَابَ الشَّدِيدَ﴾ خوایە لە دونیاێش پێیان بچێژێ!! ﴿بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ﴾ (حسب شدة کفرهم!). ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ﴾ لەسەر هەمو مشرکان. ﴿نَبَأَ نُوحٍ﴾ خەبەري ذی عبری حضرەتی (نوح) لەگەڵ قەومی خۆی. ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ﴾ عشرەت و خوێشی خۆی، لە پاش طولی دەعوەت، کثرەتی مجادلە و معارضە و تشدی عنادی قەوم! ﴿يَا قَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ﴾ گرانە ﴿عَلَيْكُم مَّقَامِي﴾ اقامە و دەوامی من، لە ناو ئێوە! بەرسالەت و تبلیغ و دەعوەت! ﴿وَتَذْكِيرِي بِآيَاتِ اللّهِ﴾ صنوفی آیاتی دالە لەسەر وەحدانیەتی، قدرەت و

عـزت و سـطوتى! ﴿فَعَلَـى اللّـهِ تَوَكَّلْـتُ﴾ مقـابلى ئێـوه، قـووەتـى مـن توكلـه اعتماده لەسەر خوا! هيچ قدەرت و قووەتى شخصيم نيه، مقابلـەى مـاديـاتى ئێوه بكەم! ﴿فَأَجْمِعُواْ أَمْرَكُمْ﴾ هەر قدرەت و قووت و مكر و كيـدى هـەتانـه، گرى كەنەوه! ﴿وَشُرَكَاءكُمْ﴾ ئەوانيش لەگـەڵ. ﴿ثُـمَّ﴾ پـاش ئـەو اجماعـه ﴿لاَ يَكُنْ أَمْرُكُمْ﴾ ئەوەى عزمى لەسەر ئەكـەن. ﴿عَلَـيْكُمْ غُمَّـةً﴾ لـەسـەر ئێـوه بـزر نەبێ! بەئاشكراى بەهەمو قووەتى خۆتان، ئامادەبن! ﴿ثُمَّ اقْضُواْ إِلَيَّ﴾ اوامـر ادا بكەن! بۆلاى من! بەسەر مندا انفاذى بكەن! ﴿وَلاَ تُنظِرُونِ﴾ آنـێ مهلـەتـم مەدەن! ئەگەر پارچه پارچەمكەن من دەست له رسـالت هـەڵنـاگرم تبليـغ و تذكيريان ئەكەم! مثقاله ذەررەێ ترسم لێتان نيه! هەرچـى ئـەيكـەن بيكـەن! هەزار ئافرين لەو مەرديه لەو غيـرەت و شـجاعته! ﴿فَإِن تَـوَلَّيْتُمْ﴾ لـەو امـره ﴿فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ﴾ تابلێين ئەوه مقـصدى مـاڵ و ڕێاسـته لـەسـەر ئێمـه! وجهى انكارتان چيه؟ ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللّهِ﴾ اجرم لەسـەر خوايـه و بـەس! طمعم له كەس وه بەكەس نيه! محضاً بۆ خوا سعى ئەكەم! ئێوه لـه كفـر و ضلال، نجاتتان ببێ! ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُـسْلِمِينَ﴾ گـەردەن دادەى امـرى الاهـم، چ امـر ئـەكـا وا بكـەم! ﴿فَكَـذَّبُوهُ﴾ كالـسابق ئـەو قـسانه تـاثيري تێنەكردن! ﴿فَنَجَّيْنَـاهُ﴾ خۆى ﴿وَمَـن مَّعَـهُ﴾ لـه مؤمنـان، ايمـانداران! ﴿فِـي الْفُلْـكِ﴾ سـفينه. ﴿وَجَعَلْنَـاهُمْ خَلاَئِـفَ﴾ لـه ارضـى ئـەوانمـان بـەجێنوشـينى هێشتنەوه! ﴿وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا﴾ كافرەكانى قـەومـى! ﴿فَـانظُرْ كَيْـفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنـذَرِينَ﴾ انـذاركران و نـەترسـان! دەسـتيان لـه شـرک و سياتى خۆيان هەڵنەگرت! قەومى توش ئەگەر ايمان نەێنن، عاقبەتيان و خيمه! زۆر نێزيكه خوا ئێوه له تێنان بجنكێنێ! ﴿ثُمَّ﴾ پاش نجات و غرقى قەومى نـوح ﴿بَعَثْنَا﴾ هەناردمان بەبعثێ تكليفى! ﴿مِن بَعْدِهِ﴾ پـاش حـضرەتـى (نـوح). وادەرئەكەوێ له زەمانى حضرەتى (نـوح) رەسـولێكيتـر نـەبـووه! ﴿رُسُلاً﴾ بوزرگەوارانى ذوى المقدار و اقتدار! ﴿إِلَى قَوْمِهِمْ﴾ هەريەک بۆ قەومـى خـۆى!

﴿فَجَآؤُوهُم﴾ كلي رەسولێ، بۆ قەومي! ﴿بِالْبَيِّنَاتِ﴾ آياتي ئاشكرا، ظاهر الدلالة لە صدقيان! ﴿فَمَا كَانُواْ﴾ قەومەكان. ﴿لِيُؤْمِنُواْ﴾ پاش دەوامي دەعوەت، زێدە إيضاحي آيات! ﴿بِمَا كَذَّبُواْ بِهِ مِن قَبْلُ﴾ بادي الراي. في الحقيقة سوادي أعظم، سريع الإنكارن، بۆشتي جديد و مخالفي عنعناتي اسلافيان! وا ئەبێ بعضێ ئەگە رێنەوە صبرە صبرە تێئەگەن، دەست لە انكار هەڵدەگرن. ئەوانەي لە كبر و حسد دابن، الى الأبد، دەست لە كفر و عناديان هەڵناگرن! ﴿كَذَلِكَ نَطْبَعُ عَلَى قُلوبِ الْمُعْتَدِينَ﴾ متجاوز لە حد، كە قسوەتيان گەيشتبێتە، نهايت! خوا انه مۆري ئەكا اصلاً نفوذي ايمان لە دڵياندا نابێ! بەڵكو لە دەور و پشتيشيان، ناخولێتەوە! حقيقەتي حاڵ، وايە! بەگوێرەي ميل، قلب شتي بۆ دێ! بەتۆبزي كەسي مسڵمان ناكا، بەتۆبزي كەس كافر ناكا! انسان تەرەقي لە احوال ئەكا، تابۆي ئەبێتە ملكە! ﴿ثُمَّ﴾ پاش هلاكيان ﴿بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِم﴾ ئەو رسلانە. ﴿مُّوسَى وَهَارُونَ﴾ (صل الله على نوح وعليهم وعليهما)! ﴿إِلَى فِرْعَوْنَ﴾ قووەتي متجاوز بووە. ﴿وَمَلَئِهِ﴾ اشرافي قەومي! زاتاً ضعفاء_ على الأكثر_ تابعي شرفان! بۆيە حضرەتي رسالەت پەناە ئارەزوي بوو گەورە گەورەكان زوو ايمان بێنن! اقلا نەبن بەعائقي نشري ديني بەحەق. ﴿بِآيَاتِنَا﴾ مفصلات! آياتێ كە نێزيك بوون ملجابن! ﴿فَاسْتَكْبَرُواْ﴾ چ وجهيان نەبوو بۆ اعراض لە ايمان بەآياتي الاهي، كبر و استعلا نەبێ! ﴿وَكَانُواْ قَوْماً مُّجْرِمِينَ﴾ رۆو چوو بوون لە ظلم و فساد. ﴿فَلَمَّا جَاءهُمُ الْحَقُّ﴾ ئاياتيان اظهار كرا ﴿مِنْ عِندِنَا﴾ لە طرف خواي. هەمويان ئەيانزاني ئەو آيتانە، مداخلەي قدرەتي (موسى)ي تيانيە! حەقێ مقرر و ثابتە، لە طرف خوا بۆيان هاتووە! ﴿قَالُواْ إِنَّ هَذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەوانە ثابت و مقررنين! سحرێ ظاهرن! ئەوە هەروا بووە! شتێ خارق ظهور بكا، اكثر ئەڵێن: (ئەوەسحرە)! وەنا شزانن سحرچيە! ﴿قَالَ مُوسَى أَتقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءكُمْ﴾ ئەو قسە ئەكەن: (ئەڵێن سحرە)؟! ﴿أَسِحْرٌ

هَـذَا﴾ ئـەمـەی ئـەیبیـنن، وەک قلبـی عـصا، ئـەمـە سـحرە؟! ﴿وَلاَ يُفْلِـحُ السَّاحِرُونَ﴾ ساحر لەکێ؟! دەعوەتی (الی الحق) لـەکـێ؟! اصـلاحی شـئونی بشری، منعی ظلم، نجاتی مظلوم، بەفکری ساحران داناێ! نـەئایاتم سـحرن، نەشانی خۆم سحرە!! ئەوانەی ساحرن، نـائلی فـوز و فـلاح نـابن! ﴿قَـالُواْ﴾ چیان پێنەما، غیـری تـشبث بـەتقلیـدی اسلافیان! ﴿أَجِئْتَنَـا لِتَلْفِتَنَـا﴾ بمـان پێچـی، صـرفمـانکـەی، وەرمـانگێـڕێ؟ ﴿عَمَّـا وَجَدْنَا عَلَيْـهِ آبَاءنَـا﴾ دینـی اسلافمان! ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا﴾ خۆت و برات ﴿الْكِبْرِيَاء﴾ گەورەی ملـک، رئاسـەت و عظمەت و تکبر. ﴿فِي الأَرْضِ﴾ ارضی مصر، وطنی عزیز! ﴿وَمَـا نَحْـنُ لَكُمَـا بِمُـؤْمِنِينَ﴾ ئێـوە و دخیـل و ذلیـل، ببنـە سـەرداری ئێمـە؟ ئـەمـە، نـابێ؟ والسلام! ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ﴾ بۆ إبطالی آیاتی (موسـی) اظهـاری سـاحریی خـۆی ﴿ائْتُونِي﴾ امریـی دا امـر بـەران ﴿بِكُـلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ﴾ بیـان هێننـە لام، هـەر ساحرێ کە زۆر زانایە بەفنـی سـحر و إبطـالی. ﴿فَلَمَّـا جَـاء السَّحَرَةُ﴾ حـسب الأمر! ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَى﴾ بەسحرە. ﴿أَلْقُواْ مَا أَنتُم مُّلْقُـونَ﴾ (بعـد المحـاورة)! وەک لە بعضە مقامێتر ئەیفەرموێ! مقـصد، خـلاصـە، مبـالاتم پێتـان نیـە! ئەوەی ئەیهاوێنە مەیدانیی معارضە، بیهاوێن! ﴿فَلَمَّا أَلْقَـواْ﴾ حبـال و عـصی. ﴿قَالَ مُوسَى مَا جِئْتُم بِهِ السِّحْرُ﴾ هـەر ئـەوە، سـحرە! نـەک ئـیمن! ﴿إِنَّ اللّـهَ سَيُبْطِلُهُ﴾ اظهاری بطلانی ئەکا. ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ﴾ خوا عملـی مفسدان رێک ناخا. ﴿وَيُحِقُّ اللّهُ الْحَقَّ﴾ ثبت و تقدیری ئەکا. ﴿بِكَلِمَاتِهِ﴾ اوامر و قضا و حکـم و ارادە. ﴿وَلَـوْ كَـرِهَ الْمُجْرِمُـونَ﴾ بـا هـەتـا ئـەدرێـن، پـێیـان ناخۆشبێ! ﴿فَمَا آمَنَ لِمُوسَى﴾ پاش إفتضاحی سحرە. ﴿إِلاَّ ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِـهِ﴾ لە قومی (موسی) یعنی شبان!، یا لە قومی (فرعون)! میلی من (سـیدین) لەسەر ترجیحی اولە! ﴿عَلَى خَوْفٍ مِّن فِرْعَـوْنَ وَمَلَئِهِـمْ﴾ اشـرافی خۆیـان، یـا ملائـی قـومي فرعـون! ﴿أَن يَفْتِـنَهُمْ﴾ عـذابیان دەن بـۆ وەرگێـڕان لـە ایمـان. ﴿وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الأَرْضِ﴾ پایـەی بڵنـدبـوو، بـەقـدرت و قـوت و سـطوت

بوو! ئەوەی بیکردبا، ئەیکرد! مزاحمی نەبوو! دەربارەی ئەو نوعە ضعفایانە، بێڕەحم بوو! ئەیتوانی بەانواعی عذاب، عذابیاندا! ﴿وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ﴾ لە سفکی دماء، بێپەروا بوو! لە کبر، لە عناد، لە حەد بەدەر بوو! ﴿وَقَالَ مُوسَى﴾ بەمؤمنەکان. ﴿يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ﴾ وە بەو ایتانەی کەمنی ناردووە بۆ خلاصی ئێوە، لە چنگ فرعون و ملائی! ﴿فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا﴾ ترسی لە دڵی خۆتاندا مەهێڵن! یەک بن! دڵ بەخوا بەستن! ﴿إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ﴾ ئەگەر تسلیمن، گەردەن دادەی اطاعەن! الآن ئێوە اسبابی نجات شک نابەن، ئەسیر و ژێر دەست و زەبونن! لەسەر ئەو حاڵەش بعضێک بچن خدمەتی فکری فرعون بکەن، بۆ خاطری نفعێ ڕەزیلانە، ابداً نجاتتان نابێ! وە هەموتان ڕەزیلتر ئەبن! توکل لەسەر خوا کەن! خیانت لەگەڵ من و قەومی اسرائیل مەکەن! ﴿فَقَالُوا﴾ بەیەک دڵ و یەک زوبان، بێتوقف و گورفت. ﴿عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا﴾ لەگەڵ خوا و توو و قوم، خیانت ناکەین! اعتماد ئەدەینە سەر خودا، بڕوا بەدوشمن ناکەین، بۆ نفعێ خسیسا نەخۆمانیان لەگەڵ ڕێک ناخەین، بەدڵ پشتیان پێنابەستین! ﴿رَبَّنَا لاَ تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ نەئێمە بەوان بەهلاک بچین مادي و معنوی، نەئەوان بڵێن: (ئەگەر ئەوانە شعب اللەن؟ خوایان علیم و قدیرە؟ ئەو زاتانە رسولی ئەون؟ ئەبا نجاتیان بێ، مادام ئێمە لە سەروان دائماً مسلطین، دیارە ئەو قسانە ئەفسانەیە!!). ﴿وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ یاربی ئێمەش نجاتدەی لە دەست ئەوانەی کە لە کافران خراپترن، بەغیری سفاهت و عیش و عشرەت، چ وەظیفەی تریان نیە. عالەم بەاسوتی ئەوان، خەریکی بەستەو بەزمن. معری ئەڵێ:

(وإذا تساوت في القبيح فعالنا فمن التقي؟ وأينا الكفار؟) خۆزیا لەو عصرەش تساوی با، راضی بوین! ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى وَأَخِيهِ﴾ (بعد الدعاء). ﴿أَن تَبَوَّءَا﴾ دانین! دروستکەن! مسکنێ ثابت و محکم، مرجع و

ماوا! ﴿لِقَوْمِكُمَا﴾ بني اسرائيله. ﴿بِمِصْرَ بُيُوتًا﴾ لای حقير وايه: (مقصد بنی اسرائيلی نەڕۆن، له مصر دەر نەچن! بناو بارەگاهی باش دامەزرێنن!). ﴿وَاجْعَلُواْ﴾ ئەی بنی اسرائيلی. ﴿بُيُوتَكُمْ﴾ کەيله کانتان. ﴿قِبْلَةً﴾ خەڵکی رووي تێکا بەميوانداری، وه دەستگرێنی فلاح و فقراء! خۆتان بکەنه مرجع! وورده وورده! رعايا ئێوەيان ئەوێ! دۆستيتان لەگەڵ ئەکەن! ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ﴾ رابطەی بەينی خۆتان و بەينی خوا، بەتەواوی بکەن! حقيقةً نوێژی بەرێوجێ، ڕوحێ عجيبی هەيه! گەلێ بەجاذبەيه! ﴿وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بەمکملی ئەگەن بەمقصد! نجاتيان ئەبێ، صبرکەن! چاوەنۆري تۆڵەی صبريان بن. (وەک کوردی ئێستا، خۆبەخۆڕای مەفەوتێنن)! بەلافوگەزافو غروری نسب، هەڵ خەڵەتێنن!) ﴿وَقَالَ مُوسَى﴾ فيالحقيقه زۆر موافقه امرت بەجێيه، اما شتێ هەيه، خۆت ئەيزانی ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلأَهُ زِينَةً﴾ ئارايشی دونيوی، له خدم و حشم و مجوهرات. ﴿وَأَمْوَالاً﴾ منقول و غير منقول، کنوز و جنات. ﴿فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ حالی حاضره. ﴿رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ﴾ تا، وايانی لێهات! انه هەمو ثروەت و سامانيان، بۆێيه خه ڵکی گومراەکەن، له ڕێی توويان لادەن! مقابلی ئەوانه- والحالة هذه- ئەوی بنی اسرائيلی بيکەن، بۆفه! بەڵکو لێی يان ناگەڕێن! شتێکی تري پێئەوێ! ﴿رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ﴾ ماڵيان مەهێڵه، فقيريان کە. ﴿وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ دڵيان بگوشه، سەغڵەتيان کە، که بزانن بێدەسەڵاتن! قومی متکبر و دەوڵەمەند، بەفقر و ذللەت نەبێ، نايەتەڕێ ايمان بێنن! ﴿فَلاَ يُؤْمِنُواْ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾ زاتاً ايمان نائێنن، تا عذابێ بەئێش نەچێژن! ئەگەر بێدەسەلاتيانکەی، به زۆری ايمان دێنن! ﴿قَالَ﴾ حضرەتی کبريائی فەرموی: ﴿قَدْ أُجِيبَتْ دَّعْوَتُكُمَا﴾ خۆم ئەزانم چۆنيان ڕەزيل و نابووت ئەکەم. ﴿فَاسْتَقِيمَا﴾ لەسەر تبليغێ بليغ، بەحکمت و سياسەت. ﴿وَلاَ تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ نازانن چۆنيەتی دعوت! کەوابێ دعوەتی رُسليش،

بێسیاسەت و کیاسەت، نابێ! بەفکری قیسکەتەنگان مەکەن! بەتالووکە فرصەت لە دەست مەدەن! لە تفسیری ئەم جملەیە، قسەی مفسرانم نەچوە ذهن! و بعضە نقلیاتیش دائر بەطمسی مالْ، جێیبڕوای نەبوو، نقلمان نەکرد، با لە تورەگەی نقالان دابێ!! ﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ﴾ لە بحرمان تێپەڕاندن. ﴿فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ﴾ لە شکری! ﴿بَغْيًا وَعَدْوًا﴾ دوایان کەوتن، بێحەق، بەظلم و تجاوەزێ، فرعون و جنودی، یلغار بەدوایان غاردان، خۆتان لە بحر نەگرتەوە، کەوتنە ناوي! ﴿حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ﴾ نێزیک بوو لە خنکان، زاتي فرعون صاحب الجلالة، ربي اعلی‌ی مصریان! ﴿قَالَ﴾ لە غایتی ذل و بێدەسە لاتی ﴿آمَنتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ﴾ چ نا! ئەبا بیگوتبا: (دعی الیه موسی و هرون)! ﴿وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ تسلیم، گەردەن کەچ! کەچی، خنکا! ﴿آلآنَ﴾ تازە؟ ئێستا؟ ﴿وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ﴾ پێش ئەم حالە. اما چ عصیان؟! نایەتە تحریر! ﴿وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ (معانه) ملک ئەبێ بەیەک نظر تەماشای حالْی ڕەعیەبکا، اسبابی عدل و امن و ئاسایش، لە بلادی، مقیم بکات! ﴿فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ﴾ کە لە شت! ﴿لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً﴾ لە اهرامی خۆی نیشتیان.

لەو سالانە مفتاحی اهرامیان دۆزیەوە، هیاکلی فراعنەیان هێنادەر بردیانن بۆ شار. اهلی شاری قاهرە و، ئەوانەی أخصاءی بوون لە ڕەسم و وێنە، کە لەشی فرعونی موسایان، ناسیەوە! حقا آیتێ عظیمە! ماشاءالله قومێ لە بنای اهرام بەو مهارەتە، وە بۆ مومیای هەیکەلی انسان، بەو علم و صنعتە دەقیق کە ئەمڕۆ حکمای ئەوروپای ڕێی پێنابەن! لە اعتقادیانیش وا چروک! حتا وەقتێ تقدیس پشیلەیان ئەکرد!

﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ﴾ حیوانی دووپێ! ﴿عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾ کانە بێچاوو گوێن، گێژو وێژو بێخودن! ﴿وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ﴾ چ

فلسطيني بێ، کە- بعد اللتيا والتي- لەوێ دامەزران! ئەو مکانە مکينە، لەسەر وەعدی ڕاستی الاهی، نائلی بوون! چ (مصر)بێ!!

بنا لە فەرمودەی صاحبی (نظره) کە بنی اسرائيلی پاشی غرقی فرعون، گەڕانەوە مصر، وە (١٣) سێزدە ساڵ لەوێمان، دوای فرعونێ جديد بەجێهشتەوە هات بۆ اخراجی بنی اسرائيلی، ئەوانيش تابی ديداری دوشمنيان نەهێنا، هەڵاتن، بەجارێ ڕێيان لە دياری (مصر) برا! باشە! اما ئەوەی ثانی لای من خۆشترە! چونکی نێزيکترە! دوای ديتم (امامي رازي) اولاً تفسيری (مُبَوَّأ) بەارضی مصر ئەکاتەوە، زۆرم پێخۆشبوو!! وە لەگەڵ آياتي سورەتي (دخان) زۆر موافقە!

﴿وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ بێخوف و خشيەت لە فرعون. ناز و نعمەتی ملاءی فرعونمان دايە بنی اسرائيلی! ﴿فَمَا اخْتَلَفُواْ﴾ تفرقەی خصومانە! ﴿حَتَّى جَاءهُمُ الْعِلْمُ﴾ بەيقين زانيان اتفاق مواجبی سەر کەوتنە، اختلاف باعثی مەحو بوونە! بەطمع هەر کەس ئەيەوێ بۆ خۆی بێ، عاقبەت زواليان ئەبێ! نەبۆ ئەو ئەبێ، نەبۆ ئەم! قەومی کورديش وەک بنی اسرائيلی ئەزانێ، اما بەقەد بنی اسرائيليش سعی ناکا! ئەوانيش دوای خياليون کەوتوونە، بۆيە کەوتينە! تفسيری علم بە (ما في التوراة)_لەگەڵ (مختاري) ئێمە، موافق نيە! اما تفسيری بە (قرآن)، تفسيری بنيی اسرائيلی بە (بني نضير) وە سائری يهودی زەمانی خاتم الرسل، لای من بەکلی دوورە! هيچ مناسبەی لەگەڵ مقام نيە!

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ڕۆژی جزا. ﴿فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ ئەگەر دينيش بوو، بۆ دونيا بوو! چەشم بەندی بوو! . حقيقة ئەوانەی لە اصل لا ئەدەن، بەناوی دين لا ئەدەن، تا اولاً خەڵک نفرەتيان لێنەکەن، دوای ڕام ئەبن! ﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ﴾ (بالفرض و التقدير)- ﴿مِّمَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ﴾ لە باس و خواسی (نوح) و (موسى) و برای و قەوميان. ﴿فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَؤُونَ الْكِتَابَ﴾ لە اهلی تواريخ. ﴿مِن قَبْلِكَ﴾ يعنی سؤال لە

خوێنده‌واران بکه له اهلی تواریخ! ئه‌لـێن فـه‌رمـوی: (لا اشـک و لا اسـال!). ﴿لَقَدْ جَاءكَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ حه‌ق خۆی شاهدی له‌سه‌ر حه‌قانیه‌تی خۆی ئه‌دا! که‌سێ عاقل‌بێ، لـه شـهاده‌تـی ئـه‌گا! ﴿فَـلاَ تَكُـونَنَّ مِنَ الْمُمْتَـرِينَ﴾ ئـه‌وانـه، تعریـضن! وه‌ک ﴿وَلاَ تَكُـونَنَّ مِـنَ الَّـذِينَ كَـذَّبُواْ بِآيَـاتِ اللّـهِ﴾ هـه‌ر دوو نـوع. ﴿فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (العیـاذ بالله)! لـه تقدیرێ تـۆوابی، وابـێ، ئـه‌وانـه ئه‌بێ چۆن‌بن؟! ئیتر ئاگادارین بێهووده انکار مه‌که‌ن! تێ‌فکرن! سؤالکه‌ن له اهلي إنصاف!! ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ﴾ فـه‌رمـوده‌ی خـوای تـۆ! ﴿لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ کفریـان بویتـه ملکـه! عـلاوه‌ی کبر و حسد و حـسب، جـاه و رئاسه‌ت و ده‌وڵه‌مه‌ندي، قووت و مکنه‌ت، به‌قطعی نایه‌ڵـێ رائحـه‌ی ایمانیـان بۆ بچێ، تروسکه‌یێ له‌و نوره عظیمه ببینن!

﴿وَلَـوْ جَـاءتْهُمْ كُـلُّ آيَـةٍ﴾ هـه‌زار ده‌ره‌جـه فـوقی آیـاتی (موسـی)! رقـابتی قرابت، فـوق الکلـه! ﴿حَتَّـى يَـرَوُاْ الْعَـذَابَ الأَلِـيمَ﴾ وه‌ک حـضره‌تـی (موسـی) فه‌رموی قه‌ومی تۆش، وان! ئه‌بێ عذابی الیم بـه‌ئـێش بچێـژن! ﴿فَلَـوْلاَ كَانَـتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ﴾ امتێ له امـمی سالفه، به‌عمومی بنا له‌سه‌ر انذاری رسول، ایمـانی نه‌هێنا، ﴿فَنَفَعَهَا إِيمَانُهَا﴾ (قبل العذاب! یالدی ظهـور الأمـارة!) یعنـی ئـه‌گـه‌ر له‌و حاله ایمانیان هێنابا، قبـوڵ ئـه‌بوو! وه قورتـار ئـه‌کران لـه عـذاب! امـا ایمانێ هکذابیان نه‌هێنا ﴿إِلاَّ قَوْمَ يُونُسَ﴾ (لدی ظهور العلائم) ایمانیـان هێنـا به‌ایمانێ دروسـت. ئـه‌وان ﴿لَمَّـآ آمَنُـواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ﴾ لاماندا لـه‌وان. ﴿عَذَابَ الخِزْيِ فِي الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ ذل و هوان و ڕزالت. ﴿وَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ﴾ قـسه لـه عـذابی دونیایـه! کـه‌وابـێ (فـي الحیـوة الـدنیا) مفهـومی نیـه! زه‌مـانێ زۆر به‌خۆشی ژیان، نفعیان له حیـاتی دونیـا دیـت، ترغیـب و حـث، بـۆ قـه‌ومـی رساله‌ت په‌ناه! ئه‌وانیش پێش به‌سه‌ر داهاتنی عـذاب، بـا ایمـان بینن! وه‌الاّ دووچاری عذاب و خزی، ئه‌بن! محقر و مهان و مه‌حو و نابۆد، ئـه‌بن! ﴿وَلَـوْ شَاء رَبُّكَ﴾ (جل جلاله). ﴿لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾ به‌تبدیلی مزاج و مشره‌ب لێک نێزیک بن، بێ طمع، یاکه‌م! نه‌زانن، کبر و حقد و حـسد چیـه!

بەڵام تباینی مشارب تباعدی خلق و خلق، حاڵی حاضر، مانعە! بەو حاڵە ممتنعە! وە معلومە اجرای ئەو مشیتە بەس عائدی خوایە! انتخابی طبیعی، ڕووی لە ایمان و خێرنیە! ئەوە ئەگەر ڕاستبێ، شتێترە!

﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ﴾ جبریان لێئەکەی؟! ﴿حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ الجاء بای صورەت بێ، ای خوایە! غیری ئەو، کەس دەسە لاتی نیە! ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ اذنی تکوینی! وەتا لە دائرەی امکانی استعدادی بێ، خوا اذني ایمان هینانی هەیە! ﴿وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ﴾ کفر. ﴿عَلَى الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ کەوابێ تا عقل هەبێ، خوا اذنی ایمانی هە یە! کە عقل نەما، اذنی ایمانی نامێنێ! ئەوجا حتماً ئەبێ بەکفر و ضلال! حقاً کفر بانواعە، ثمری بێ عقلیە! تقلیدە، دوای هەوای نفس کەوتنە، بێ وجدانیە! کەسێ ادنی عقلێکی هەبێ، چۆن حیوانێ وەکی خۆی ئەپە رستێ؟ خضعە الرقاب نواقص الأبصار، لەبەر دەستی ڕادەوەستی؟! فضل لە حیوانێ لە خۆی بەرەژێرتر! فضل لە جماد! بۆیە هەرکەس لە سەرامەدان خەریکی ازالەی عقلی امتە. ﴿قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ لە عجایباتی صنع وە ایجادی نظری وا باشە کە فائدەێ معنوی و مادی هەبێ بۆ نفعی بشر، خەریکی بەدەرخستن و بەدەست خستنی بێ. هەروا ماشاء اللە لەو خودایە چی خلق کردیە، زۆر باشە! اما سعی بکەی بزانی شتی چۆن خلق ئەکا و خلقی کردیە، قواعدی طبیعی و فطری بزانی عملی پێبکەی، دەها چاکترە! نوری علی نورە! ئێمە بە (لاهوتي)، حکمای ئەورووپا بەناسوتی، تەماشای علویات و سفلیات ئەکەین! بەڵام تەواوی، ئەمەتە بەهەر دوو وجە تەماشای بکەی! ﴿وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوی ایمانی بەمبدع نەبێ، بدایعی صنع، عباراتی بلیغ فائدەیان ناداتێ کفایەتیان ناکا، پێینابن بەدەوڵەمەندی علمی! ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلاَّ مِثْلَ أَيَّامِ﴾ ئەوانە کە امریان ئەکەیتێ بەنظر کردن لە کائنات، علوی و سفلی، ئایا إنتظار ناکەن الا مثل وقایع و شدائدی اهوالی ﴿الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ﴾ کە بەسەریاندا

هاتووە. ئەوانیش چاوەنۆری ئەو نوعە عذابەن! ﴿قُلْ فَانتَظِرُواْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ﴾ هەر دوو لا چاوە نۆر ئەبین، محقق بزانن، دێت! چۆن قەومەکانی پێشو إنتظاریان کرد، عذاب هات! ئەوان فەوتان ﴿ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا﴾ لە پاش هلاکیان، پێغەمبەرەکان و ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ﴾ نجات ئەدەین! نجاتمان دان! ﴿كَذَلِكَ حَقًّا﴾ لازمە. ﴿عَلَيْنَا﴾ واجب الأدایە، ﴿نُنجِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بنا لەو سنتی سنیەی الاهیە، ئێوەش (کذا)، بەهیلاک ئەچن، رسول و مؤمنەکان، نجات ئەدەین! ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ عام، یا (عرب)! ﴿إِن كُنتُمْ فِي شَكٍّ مِّن دِينِي﴾ کە جێی شک نیە. ئەمانە لە شرک و تقالید بێشبهەن! لە اتباعی حەق و دینی بەرحەق لە شکدان، زۆر سەیرە! ﴿فَلاَ أَعْبُدُ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ﴾ غیری خواێ عبادەتی کەس ناکەم، جامد و نامی، عالی و سافل، عالم و جاهل! لە پاش عاجز بونیان لە معارضە، مقابلی ئەوانە ■ بڵێین؟! تبرا لە دینیان و بەس!! ﴿وَلَكِنْ أَعْبُدُ اللّهَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ﴾ تەواوتان ئەکا، حسابتان ئەبینێ بەتەواوی. ئەم وصفە، بۆلاي جزا، مناسبە، بۆیە باسي خلق ناکا! ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوانەی کە حەقە لەسەر خوا نجاتیانبدا، لە دارین! ﴿وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ﴾ موقعی ئەم جملە جوانە، نظربە (امرت)! انە پێشدان فەرمویەتی: (ان کن مؤمناً). بۆیە بەامر ئەفەرموێ: (اقم)! وە الاّ نظر بەظاهری عبارەت، ئەبا بفەرموێ (وان اقیم وجهی)! لهذا (ان)ی مصدری هێناوە تاولیی بکا بەمصدر، وەک (اکون)ی سابق. لەو عطفە چەند و چوونیان هەیە. ئەگەر (اوحی)یەی بۆ مقدر بکرێ عطف لەسەر (امرت) ڕاحەتە! لام وایە چ خللی تیانیە!! امرم کرایتێ ڕووکەمە دین، بۆ تاسیس و تثبیتی، بۆ خاطری انتشاری، ڕوو نەکەمە هیچیتر، تا دینی اسلام سەر ئەگرێ سەر ئەکەوێ! ﴿حَنِيفًا﴾ مائل لە هەمو دین و میول و طمع، ماڵ و رئاسەت_ خالصاً لوجهە الکریم و امرە_! ائمەی شیعان بعضێ قسەیان فەرمووە دائر بەڕوو کردنە دین، لای حقیر هەر

چه‌ند باشن، اما بیٚجیٚن، موافقی مقامنیم! زیٚرا زه‌مانی اولي دەعووەته! ﴿وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ با له‌وانیش‌بیٚ! اما مه‌یلت دووره! له‌و جهه‌ته قرابه‌تت له‌گه‌ڵیان نیه! ﴿وَلاَ تَدْعُ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَنفَعُكَ وَلاَ يَضُرُّكَ﴾ به‌قسه‌یان اهمیه‌ت مه‌ده! که ئه‌ڵیٚن (إن نقول إلاّ إعتراك بعض آلهتنا بسوءٍ) ئه‌مه زوٚر دائره له‌سه‌ر زوبانی بوت په‌رست و قبر و شیٚخ په‌رست! شتیٚ ئه‌بیٚ ئه‌ڵیٚن: (ئه‌مه هه‌مه‌تی فلان شیٚخ بوو!). ضار و نافع لایان، ئه‌وانه‌ن_ نعوذبالله_ له کفری دینی! ﴿فَإِن فَعَلْتَ﴾ فرضاً_ العیاذ بالله_! ﴿فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّالِمِينَ﴾ ظلمیٚ زوٚر گه‌وره. خوا ئه‌زانیٚ ئه مرۆ سوادی أعظمی مسڵمانان، له‌و ظالمانه حسابن! (انا لله)! ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ﴾ کشف و ازاله‌ی ضرریٚ که له ئه‌وه وه‌بیٚ، که‌سی پیٚی ناکریٚ، خوٚی نه‌بیٚ! اطبا و مطیبا، شیٚخ و میٚخ! هیچ! خاصةً بوت و موت، جماداتی (لاتشعر)! ﴿وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ﴾ پیٚت ئه‌گا! ﴿فَلاَ رَآدَّ لِفَضْلِهِ﴾ که‌س ناتوانیٚ ردی بکا و نه‌یه‌ڵیٚ پیٚت بکات! ﴿يُصَيبُ بِهِ﴾ به‌خیٚر! ﴿مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ مؤمن و کافر. اما (ابن جریر) ئه‌ڵیٚ: (برخاءٍ وبلاءٍ وسرّاءٍ وضرّاء)! ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ مسامحه ئه‌کا وه‌ک (سعدی) ئه لیٚ:

ادیمی زمین سفره‌ی عامی اوست
برین خواین یغما چ دوشمن چ دوست

وه ئه‌فه‌رمویٚ:

ای کریمیٚ کی ازخزانه غیب
گبر وترسا وظیفه خورداری دوستارا
کجا کنی محروم
توکی با دوشمنان نظرداری!

﴿قُلْ﴾ خاتمة الكلام قولیٚ فصیح و صریح ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ گویٚتان لیٚبیٚ! ﴿قَدْ جَاءَكُمُ الْحَقُّ﴾ کتابیٚ به حه‌ق هاتووه! به‌حه‌ق هه‌ناردراوه! ئه‌گه‌ر بڕوا ناکه‌ن (فاتوا بمثله) وه‌ک ڕابورد! ﴿مِن رَّبِّكُمْ﴾ له طرف جه‌نابی حه‌ق،

بەئەمری ئەو! ﴿فَمَنِ اهْتَدَى﴾ ڕێی ڕاستیگرت، شوێنی ئەو حەقە کەوت ﴿فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ﴾ نفعی بۆ خۆیەتی، لە ظلمات و عذاب نجاتی ئەبیٚ! اسارەتی وجدانی نامێنیٚ! قازانجی خۆیەتی، بۆ خۆیەتی،! ﴿وَمَن ضَلَّ﴾ گومراەبیٚ، دوای ئەو حەقە نەکەویٚ، ترکی شرک و سیئات نەکا، ﴿فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ ضەرەری بۆ خۆیەتی، نفسی پیس و متردی ئەبیٚ، خۆی ئەخاتە ژێر حیوانات و جمادات! ﴿وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ﴾ وانەندراوم، لە طرف خوای بۆ سەر ئێوە، بەقووەتی معنوی مجبورتانکەم بۆ ایمان هێنان! منعتانکەم لە شرک و کفر و عصیان. تحویلاتی معنوی، عائدی خوایە! کەوابیٚ، ئەو آیتە منسوخ نیە بە (سیف)! بەڵیٚ گەلیٚ مفسر بەسیف کەوتونە ناو قرآن، گەلیٚ آیاتیان بەفهمی خۆیان کوشتیە! بەڵام شیرە کولەیوان، آیاتی خوا نابریٚ!! ﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ﴾ لە طرف خوا چیتپیٚ ئە فەرمویٚ، وابکە! ﴿وَاصْبِرْ﴾ لەسەر مشاق واعتاب، ماندی بونی تبلیغ و ، ئەزیەتی قەوم! ﴿حَتَّىَ يَحْكُمَ اللّهُ﴾ لە بەینی تۆو قەومت! حکمیٚ فاصل و عادلانە! ﴿وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾ بۆ حکمی بەحەق، فەرقی دۆست و دوشمن و مؤمن و کافر، برو فاجر ناکا! (یا خیر الحاکمین! بۆ ضعفای ئەو عصرەش، حکمیٚ بکەی، دەفعی ظالمان بفەرمویٚ! آمین!!).[1]

[1] ـ تفسیری سورەی (یونس) تەواوبوو لە رۆژیٚ جمعە ٢٣ ربیع الثانی، ١٩ حزیرانی رۆمی، ٢ی تموزی افرەنجی، ١٣٥٦ هجری قمری، ١٩٢٧ میلادی.

## سوردتی (هــود)

﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾

سورەتی (هود) مکیه هەموی، یا الاّ سێ آیت نەبێ! عددی آیـاتی (١٢٣) آیته. (سید رشید) ئه لّێ: (دوای سورەتی یونس نازل بـووه). زاتـاً مقـصد له سورتین، یەکه! بۆیه، بەعینی ایقاظ و تنبیه ئەفەرموێ:

﴿الر﴾ گوێدێرین، تا بەتەواوی، اثبـاتی مـدعی بکـەین، عـذرتان نـەمێنـێ! زێڕا اثباتی رسالەتی نبـوی، اثبـاتی حقیقـەتـی (قرآنـه)! هـەر وەکـو اثبـاتی حقیقەتـی (قـرآن)، اثبـاتی رسـالەتـی نبویـه! لـه آخـری سـورەتـی (بـراءة) فەرموی: (لقد جاءکم رسـول مـن انفسکم... الـی آخـره)! بـەآیـاتی سـورەی (یونس) اثباتی کرد، له نهایەتی سورەی (یونس) ئەفەرموێ: (یاایها الناس قدجاءکم الحق من ربکم). لەم سـورەتـه تحقیقـی ئـەفـەرمـوێ، کـه فـەرمـوێ ﴿کتَـابٌ﴾ ئـەو حقـەی کـه هـاتوو لـه طـرف خـوایی کتێبێکـه ﴿أُحْکِمَـتْ آیاتُهُ﴾محکم، به قووەت، ڕێک هۆنرایەتەوه، دامەزراوه بەکمالی متانت، قبـولی شک و ریب و فسخ و نسخ و تحریف ناکا! کلمەێ اجنبی لـه میـانی کلمـاتی آیاتی ئەو کتێبـه عظـیم الـشانه، جێـی نابێتـەوه! ﴿ثـم فـصِّلَتْ﴾ لـه ترتیبـی نزولـی بـراوه وەک پارچـه (دیبـاێ) لـه طـرف وەسـتاێ مـاهر ببـرێ، دواێ بدوورێ، لباسێ نایابێ لێدروست ببێ، حقاً ئەمه جێی حیرەته، اوائلی بویته اواخر، اواخری بویته اوائلی، بەو دەرەجەشـی منتظمـه! حتـا انـسان بـەدقـت تەماشای (سُوَر)بکا، جێی (بسم الله الرحمن الرحیم) نا دۆزێتەوه! بەس بـۆ

فصلی (سُوَر)، له موقعیٚ ذکر کراوه، بۆ اعتناء بـه منـدرجاتي سـورەتـەکـه ئەو قوەت و نظم و تەفصیلي پیٚ دراوه ﴿مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ تـەماشـای حکیم و خبیرکە! لێرە چ رصانت و رزانتێکی هەیە! چۆن معارضه ئەکریٚ؟! چ جایٚ اشتباه؟! انکاری بەس له عنادە! مقصد لـه نـاردنی کتێبـیٚ هکذای اولاً وبالذات ﴿أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ اللّهَ﴾ نهی ئەکا له ذلـەتـی عبـودیـەتـی ئێـوه، بـۆ غیری خوا، که له هەمو جهەت فوق الکله، عبادەتی وی، نەبیٚ عینی ذلەتـه! وجهی چیه؟ روو له خـوا وەرئـەگێـرن؟ بـوتیٚ، چێـریٚ، بـەردیٚ، ئـەپـەرسـتن سجدەی بۆ ئەبەن؟ ئەگەر لەبەر تمثیله، ئێوه نێزیکترن له تمثیل! تـەماشـا سەرامدانی بوت پەرستی، تمثیلی الاهی سەروه رو سلم ئەکەن، بەصـورەتـی ئافرەتیٚ جوان! لازم بوو ئێوه لەسه ر ئەو شهامەت و نجابەتەی عەرەبیتـان، بـیٚتوقـف، ایجابـەی ئـەم دەعـوەتـه بکـەن! اتبـاعی ئـەو رسـوله بکـەن کـه ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّنِي لَكُم﴾ بۆ نفعی ئێوه! ﴿مِّنْهُ﴾ لـه طـرف خـوا! رسـولیٚ لـه خۆتان، بۆ خێری خۆتـان، لـه جهـەت خـوای خۆتـان ﴿نَذِيرٌ﴾ بـۆ مخالفـان! ﴿بَشِيرٌ﴾ بۆ موافقان! سببی چیه گـویٚ نـادەنـه دەعـوەتـی؟ ﴿وَأَنِ اسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ﴾ له شرک و ظلم و جرائم! ﴿ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ﴾ توجه بکەن بۆ طـرف ئـەو! ئەوەی رسولی وی ئەفەرمویٚ، بەقسەی بکەن! ئەگەر وابکەن ﴿يُمَتِّعْكُم مَّتَاعًا حَسَنًا﴾ حیات و گوزەرانـیٚ خۆشـتان پـیٚکـرم ئـەکا! وه لـه منـافعی دونیـا، منتفع ئەبن، بەکمالی حورمەت و حریەت و سەربەرزی، لەسەر ارزی، ئـەتـان ژێنیٚ! ﴿إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ تا خۆتان تێکی ئەدەن. ئەگـەر تێکـی نـەدەن، تـا قیامت، ملتی ئێوه ئاوا ئەژێن! بەئافـاتی سـماوی، ناتـان فـەوتێنـیٚ! دوشـمن بەسەرتان غالب نابیٚ! بۆ ئه فەوتێن؟! ﴿وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ﴾ ئـەوی رایسه، گۆییا ئەترسیٚ رئاسەتی له قیس بچیٚ، نابێته تابع! ئـەگـەر صـاحبی فضل و هونـەره و حـەقـی سیادەتیـی هـەیـه، بـەگـوێرەی فـضلی خـۆتی و گەورەی پیٚئەدات!! (بنـی امیـه) لـه ترسـی فـەوتـانی سیادەت و رئاسـەت،

ايمانيان نەئەهێنا! دواێ ديمان، لە سايەى دينى اسلام، بوونە ملكى شرق و غرب!! (ابوجهل) مسلمان بووبا، نێزيک بوو ببێ بەخليفە! طمعى استيلاء لاى ئێمە و رسولى ئێمە، نيە، ئەگەر ئەمەيان قبول كرد (فبها ونعمت)!

﴿وَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ اعراض بنێن، رو وەرگێرن ﴿فَإِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ﴾ وەک اممەكانيى تر ئەترسم مستاصل ببن. وەرن ئێوە وەک قەومى (يونس) پێش وقوعى واقعە، ايمان بێنن! تا قورتار بن لە عذابى رۆژێ گەورە و گران! ئەگەر مستاصليش نەبن، ئەترسم ببنە ژێر دەستى خەلقى، ئەو وەقتە نەتمتع لە حيات ئەبينن، نەبەگوێرەى فضل نائلى فضل ئەبن.

﴿إِلَى اللّهِ مَرْجِعُكُمْ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ زيندوتان ئەكاتەوە، بەگوێرەى سيئاتى خۆتان، معذب ئەبن! ئەو رۆژە رۆژێ اكبرە، عذابى اشدە، ادومە!

لاى حقير وايە ئەگەر حشرى اجسام نەبێ، حاجت بەرسالەت نيە. انسان بەو هيكەلە انسانە، لەزەت و الم، روحى و جسدى، هەيە! لەزەتى معارفى الاهى، ام المى جهل، بۆ هەمو كەس نيە! مع انە دەوامى لەزەت بەشتێ مالوف و بسيط، معقول نيە! وە هەروها (الم)! بەوجدان ديارە، المى جهل، لە حينى طلبى علمە، تا نيلت ئەبێ بە المى. كە علمت بوو، لەزەت ئەبێ، زۆر دەوام ناكا زائل ئەبێ دەوامى ارواح پاشى دەرچونى، يا قطعى علاقەى لەگەڵ بدن، وە لەزەت و المى روحانى، حكما غيرى (ملى) بەڵكو مشركيش قوليان پێكرديە! ئەڵێن: (ارواحى صالحيان التحاق بەزومرەى آلهە، ئەكا! لەگەڵ ارواحى قدسيان، وەقت بەسەر ئەبا!). وە هەزار ساڵ زياترە ئەو مشاجرە لە علمى (كلام) ذكر ئەكرێ! لام وايە پێى ناوێ تازە خوا پێغەمبەرێ بنێرێ بۆ حكم بەبطلانى حشرى ارواح! لە عجايباتى بشرە (پاپى شرقى) انكارى حشرى اجساد ئەكا وە ئەڵێ: (من پێغەمبەرم!) وە تصديقى رسالەتى حضرەتى (محمد)يش ئەكا!

﴿أَلا إِنَّهُمْ﴾ ئەو مشرکانە! ﴿يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ﴾ سینگیان لایێ بەسەر لایێدا ئەدەن، بالتمام روو لە رسول وەرئەگێڕن. ﴿لِيَسْتَخْفُواْ مِنْهُ﴾ خۆیان لە پێغەمبەر بزربکەن. لە وەقتی نزولی ئەو سورەتە، (منافق) نەبوون! نظر بەدوایێ ممکنە تفسیری (ثنی، صدر) بەنوعیێتر بکریێ!!

﴿أَلا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ﴾ بۆ نوستن خۆیاندا دەپۆشن، بەکیف و شتیێ هکذای! ﴿يَعْلَمُ﴾ جەنابی حەق ئەزانیێ لەو (حین)ەدا ﴿مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ بەئەو بنج و بادانە و پێچەوانەوە، خۆیان لە رسولی خوابزر ئەکرد. چۆن خۆیان لە خوا بزر ئەکەن؟! لە وەقتی اختفایان، سر و علنیان ئەزانیێ! ﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ ئەوەی لە دڵیاندایە. لاشک ئەوەی اهلی ایمانبیێ، ایمانی هەیە کە خوا جزئیات قبل الوقوع حینی الوقوع بعد الوقوع، ئەزانیێ، ئەبیێ، نابیێ، چۆن ئەبیێ، چۆن نابیێ! لە بعضیێ معتزلە نقل ئەکەن تا حوادث وقوعی نەبیێ، خوا نایزانیێ! انشاءالله لە تفسیری سورەی (کهف) تفصیلاتی عرضی ئەکرێن. لێرە (سیدی آلوسی) هەندێ تحقیقاتی کلامی هێناوە، لکن بیێلزومە و دوورە لە افهامی عام![1]

---

[1] - تەواوبوو تفسیری جزای یازدەمین لە ١٣٥٦ هجری قمری، ١٩٢٧ میلادی وە دەست کرا بەتفسیری جزەی (١٢).

﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ﴾ لە (روح المعانی)دا ئە لێ: هەرچی حیوانی ذی روح‌بێ، پێی ئە لێن (دابة)! ﴿فِي الأَرْضِ﴾ لە عالەمی شغلی دا کە حیاتی پەکیی لەسەر قووت بکەوێ. ﴿إِلاَّ عَلَى اللّهِ رِزْقُهَا﴾ رزقێ پێی بژین و ملائمی مزاج‌بێ. رزقی کلی حیوانات، لەسەر خوایە، _ من حیث الخلق و الأیجاد_ نەک لوقمەێ حاضر سووری کاتەوە، بیکا بەگەرووت! وە زۆر ئەبێ (دابە)ی لە دوای رزقی خۆی ئەگەرێ، ئاگای لە خۆی نیە، ئەبێ بەرزقی حیوانێ، لە خۆی زۆردارتر! مە لایانی (علمی کلام) لە تعریفی رزق _ ساقە اللە_ ذکر ئەکەن، نازانم ئەو سوقە چۆنە؟ بە لێ لە تاریخێ خزمەتی مەلایان ئەکرا، بێ‌سعی و کۆشش، سفرەیان ئەهاتە بەردەم، لەو وەقتەدا، وایان تعریف کرد! ئەگەر ئێستا مابان، ا لبتە تعریفیان ئەگۆڕی، زێرا دەور گۆڕا! نانیش بۆ مەلایان، وەک گوزەی لێ‌هاتووە، ئەبێ ئاگاداری بکرێ! (معتزلي) ئە لێن: (حەرام، رزق نیە!)، بە لێ، رزقی شری نیە! ناتوانن بلێن: (ساقە الشارع). بەلام مقصد خلق و ایجادە، دەخلی حەلال و حەرامی تیا نیە! لە خلقی حقایق و اعتباراتی شرعیە، گەلێ تووشی اضطراب ئەبن! وە ئەگەر گوێ بگریە نغماتی (صوفیە)، ئەبێ دانیشی هیچ نەکەی، ئەلێن: (حرەکە و سکون فەرقی نیە، ئەوەی لە ناو زگی داک دا، رزقی جنین ئەدا، لە دونیاش رزقی ئەدا!_ سبحان اللە لەو جهالتە! ئەگەر تەماشای مریشکیان کردبا، ئەو قسانەیان نەئەکرد! تا فەر خۆلەی بێ‌دەسەلاتە، چۆنی بەخێو ئەکا، کە پەرەوازە بوو، توانی رزقێ پەیا کا، لە خۆی ئەکاتەوە! حتا ئەبێ بەدوشمنیان لێیان ئەدا! کۆتر دەندوکی فەرخەکەی ئەهاوێتە ناو دەندوکی خۆی، ئەوەی بۆی هێنایەتەوە لە دەرونیا بەامانت داینا‌وە، وردە وردە قووەت ئەکا، ئەیخاتە ناو دەندوکی فەرخەی، کە گەورە بوو وازی لێ‌دێنێ، خۆی ادارەی خۆی ئەکا!! بەو فقرەی اخیرە، معنای جوان دەر ئەکەوێ بۆ ﴿وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا﴾ بە لام لەبەر ضمیری (ها)ی مفسران راجعیان کردیە

بۆ (دابة). بۆ (مستقر) و (مستودع) گەلێ معنایان ذكر كردووە، یعنی جێگایان لە حیات و ممات، اصلاب و ارحام، _مع الخلاف_ كامیان مستقره؟ كامیان مستودعه؟ مسكنیان بعد الوجوده؟ مستودعیان لە موادە؟. بەڵام تفسیریان بەوجهێ كه ملائم بێلەگەڵ رزق، اشبه به مقام بێ، ممكنه (مستقر) قەرارگاهیان لە زستانبێ، (مستودع) جێگای رحلەت و بڵاو بونەوەیان لە هاوینبێ! لە هەر دوو حاڵ چۆن ئەژین؟ بەچی ئەژین؟ لە خوا بزر نیە!! ئەوانەی سرِ ئە بن، بەو قەدەرەی زائد لە بەدەنیان لە موادی دهنیە، ئەژێن! (لا اله الاّ الله)! ﴿كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ كتێبی كائنات. كەسێ بەعقل خوێندەواربێ، ئەیخوێنێتەوە تێی ئەگا، مدبری ئەو كائناتە ئەبێ چۆنبێ؟! ئێمە (لوح المحفوظ) نابینین! خواش هەر وەك (لوح) ئەبینێ، (الواح)ی كانات ئەبینێ چی تیایە ؛ بەحەق ئەیزانێ ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ ایام لە بدءي خلق، نەبووە! پاش وضعیەت و كیفیەتي ارض و شمس، شەو و رۆژ تقرری كردوە! بۆیە ناتوانن مەلایانی ئێمە حدوثی زەمانی اثبات بكەن، بۆ ماعدای متطوراتان! زەمان تابعي حركەیە، هەرچی پەكی حركەی لەسەر كەوتبێ، مقدمە لە زەمان! ممكن نیە حادثی زەمانیی بێ! وەك (محدد) و حركەی! خصوص لە اولی ایجاد، شەموو یەك شەموو ئەوانیتر نەبوون! سبحان الله علماي (ملیون) نزاعیانە، بدا لە رۆژی شەمو بووە یا احد! بەڵێ جوو ئەڵێن: (بدا لە یەك شەمو بووە، لە جمعه تەواو بووە، رۆژی شەمو خوا استراحەتی كردوە!). تەماشای اولي (تورات) كەن، لەوێ ئەڵێ: (و روح الله یرف علی المیاه). لە (قرآن) ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ﴾ و من العجایب بعضه علماي دیانان ئەلێن: (روح الله)، عیبارەتە لە عیسی!). مراد لە ئاو چیە كە مقدمە لە خلقی سماوات و ارض؟ ئەوەی لە (اوكسجیني) و (ایدرۆجین) پەیدا ئەبێ، لە مركباتە! ئەو نابێ بەمقدم لە كائنات!! بەڵام سلف ئەمەیان نەزانیبو!

سوادی أعظم لە مفسرین بەمل ئاوی خۆمانی دادەبرن. ئاو لە محلی خۆی، (عرش) لە مقری فوق الکل، بێحائل بووە! لەو طرف (عرش)، لەم طرف ئاو، ما بەینییان خالی بووە. وەکی (بیضاوی) ئەفەرموێ وە ئەلێ: (استدلال بەآیة کراوە، «خلا» یعنی فراغی ما بەینی دووشت، خالیبێ لە موجودێ، ممکنە!)، چونکی بووە، وە بوون، دەلالەت لە امکان ئەکات! وە ئاو پاشی (عرشي)، لە اول حادثی اجرامی ئەو عالەمەیە. بەلام وەکی (مفتي دار السلام) ئەفەرموێ: (مفتي دیاري رۆم «ابو السعود» بەو استدلالە راضي نیە!). علمای کرام گەلێکیان تایدي اعتراضی (ابو السعود)یان کردووە، کەمێ طرفداري (قاضي)ن! (سیدي آلوسي) تفصیلاتێ دوور و درێژی تحریر کردووە، لە مەیاندا دەرئەکەوێ بعضێ اهلي کمال تفسیری (ماء) بەئاوی معروف ناکەن! لای حقیریش، حەق وایە!! سبحان الله بۆ ئێمە عیان بووە ئەوەی (عرشي) لەسەر ئاوبێ سیادەتی بحری هەبێ، سیادەتی دووەلی ئەکەوێتەوە دەست ئەو، ستارەی زەمین ئەکەوێتە ژێر سیطرتی ئەو! هەر چەند قووەتی هوائیش گەمە نازانێ، اما سیادەتی بحری هەر لە جێی خۆیەتی! خوایێ سلطنت و کبریائی وی لەسەر ئاوبێ، اهلی ایمان ئەبا تێکۆشن سلطنتی ئاو بخەنە دەست خۆیان وە لە قیسی نەدەن! اما، رۆیی! بەلێ منازعاتی قلمی، مشاجرەی مەلایان لە خلا و ملا، وە استمراریان لەسەر اموری کۆنە، عالەمی اسلامیەتی محروم کرد، و بالآخرە زەبوون بوون!! ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ اعمال، دونیوی، اخروی. حقیقةً مناسب لەگەڵ خلق و ایجاد، صنع و اختراعە زراعتە، وە مناسب لەگەڵ ﴿وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِن بَعْدِ الْمَوْتِ﴾ عباداتی اخرویە! لاهوایە گەلێ اختراع هەیە ئەگەر لە طرف حکیمی مسلمانان با، قط خێری تەواو نەدەبوو. مثلاحەبی (اسپرین دەفعی سەر ئێشە ئەکا، (سلفاتو) تا ئەبا! تسکینی المێ لە کەسێ، لەگەلێ عبادەت خێرترە! اختراعێ حفظی دین و

دەولەتی پێکرابا، حسابی جزای خێری نەدەکرا! بەلام لەو جھەتە (ملیون) غایت مقصر بوون، ئەو محسناتە بەنصیبی (طبیعیون)ان بوو! ﴿لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ عریقی في الكفر، غریقی لذائذی بھیمیە! ﴿إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ یعنی قولێ باطلە، بۆفە، بێاصل و اساسە! یا ئەو قرآنە ھەر سحرێ ئاشکرایە، بەبلاغت و تبشیرو انذار، استلای اوھام و قلوب ئەکا! خلاصە جەنابی حەق علویات و سفلیاتی ایجاد کردووە، ئەوەی توازمی حیاتی بشریە، مھیای کردیە، تا ئێوە امتحان بکا لە چاکە و خراپە چیی ئەکەن؟! لە سورەی (فاتحە) عرض کران ئەم داری دونیایە، مکتبی امتحانە، لە حوادثی ایام. کلی رۆژێ انسان دەرسێ اعتبار وەرئەگرێ. ئەوەی دووربین و زەررە بینیبێ، چاکی تێئەگا وە حفظی ئەکا. (سید رشید) لێرە علاوەێیکی تحریر فەرمووە، حقا شایانی مطالعەیە! خبر بە (بعث) انذارە بەعذاب و عقابی الاھی! وە لە چەند ئایاتی تریش بەعذابی الاھی ئەیا نترسێنێ، ئەوانیش لە مقامی استھزاء، استعجال ئەکەن. ﴿وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ الْعَذَابَ﴾ عذابێ إستئصالی. ﴿إِلَى أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ﴾ ایامێ، شھورێ، اعوامێ! معدودە و محدودە لە علمی خوای دا! ﴿لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُ﴾ چیە حەپسی ئەو عذابە ئەکا؟ مانعە لە بوونی؟ بەقسەی تۆ، خوا پەکی ناکەوێ! وە ئێمەش مستحقین بەتەواوتی! (مقتضی)بێ مانع کەبوو، (مقتضی) ئەبێ ببێ حتماً! ﴿أَلاَ يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفاً عَنْهُمْ﴾ ئەو رۆژە، دێ! وە کە عذابی الاھی ھات، لێیان وەرناگیردرێ! ﴿وَحَاقَ بِهِم﴾ احاطەیان ئەدا دەوریان ئەگرێ. ﴿مَّا كَانُواْ بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ﴾ نجاتیان نابێ لەو عذابەی کە گەمەیان پێئەکرد! ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الإِنْسَانَ مِنَّا رَحْمَةً﴾ ئەو آیتە، علامتی راسب و ناجحي امتحانە! ئەگەر لە طرف خۆمان رەحمەتێ لە زرەتێ نعمەتێ بەانسان بچێژین ﴿ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ﴾ با گەلێ انعامی تریشی مابێ! ﴿إِنَّهُ لَيَئُوسٌ﴾ مایوس و نائومید

ئەبێ، لەبەر فواتی ئەو نعمەتە. ﴿كَفُورٌ﴾ كفرانی نعمەی سابقە و باقیە ئەكات، ئەو نوعە بێ صبر و شكرن! ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاء بَعْدَ ضَرَّاء﴾ وەک رفاهی پاش فقر و گرانی. ﴿لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي﴾ مصائب، بەلا و فقر و فاقە، رۆی! دەها، نایبینمەوە! ﴿إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾ ایامی شدائد لە فكر ئەكا، انە قط لە بۆ پارچە نانێ، لەبەر دەركان، نەخولایتەوە! هەر دەوڵەمەندی ئەوڕۆ بووە! قط پاسەوانی بازار نەبووە! ئەڵێن ئەم ایتە دەرحەق (ولیدي بن مغیرە مخزومي) نازل بووە، (قیل) ئەڵێ: دەربارەی (عبداللەی بن امیەی مخزومی) بووە! بەڵێ، باوابێ! اما ئێمە گەلێكی وەكی وانمان دیت، ئەمڕۆ واحساب ئەكا، قط تاڵی فقیری نەچێشتوە! حاصلی ئەوانە مغرور ئەبن، بەدوای شهواتی نفسانیە ئەكەون، دەر ئەچن لە فضائلی انسانیە! ﴿إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُواْ﴾ (عند الشدائد)! للە، صبریان گرتووە. ﴿وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوەی بگونجێ لە ایامی رفاە. نەمایوس ئەبن، نەمغرور. ﴿أُوْلَـئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ﴾ غفرانی حەق، حالی وانە. ﴿وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ لەو رۆژە كە ئەوانی پێشەووە، عذابێ كبیر ئەبینن. كە احوالی ئەوانت زانی، وابێ مسلكن، بەمستەئاوێ ئەكەونە مەلە، اهمیەت مەدە قسەیان! چ جدی چ هزلی! ﴿فَلَعَلَّكَ تَارِكٌ بَعْضَ مَا يُوحَى إِلَيْكَ﴾ ترساندنیان سلفاً بەعذابی آخرەت. ﴿وَضَآئِقٌ بِهِ صَدْرُكَ﴾ چونكی گەمەیان پێدێ، ئەتكەنە قەشمەرجاری خۆیان. ﴿أَن يَقُولُواْ﴾ بەهەر وجهێ بێ. ﴿لَوْلاَ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ﴾ لە طرف ئەو كەسە كە ناردویتی، خزنەیێكی بەسەرا برێژێ، دفعی حوائجی خۆی پێ بكا، امتیازی ببێ لەسەر ئێمە، بەدەوڵەتێ بێئەندازە. ﴿أَوْ جَاء مَعَهُ مَلَكٌ﴾ شاهدی بدا، كە ئەوە پێغەمبەرە. طبعاً جەنابی رسالەت پەناە ئارەزوی ئەكرد بعضێ مقترحاتیان پێک بێ، تا بەتەواوی ظاهر ببێ، ایمان دێنن یان نا؟! ﴿إِنَّمَا أَنتَ نَذِيرٌ﴾ وظیفەی تۆ، تعلیم و تربیەیە! ترساندنیانە لە عاقبەتی

جهل و کفر و شرک. زەمانی خوارق چوو، دەوری استفادەیە، لە عقل و علمی عملی لە اموری معتادە، بەجادە رۆیشتن خۆیەتی، کوێرە رێ سەرە دەری نادا! ﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ ئاگادراە! ئەزانێ چ چاکە ئەمرۆ بۆ بشر چ خراپە! اعتماد لەسەر خوارق، مایەی مایە پووچیە! قواعدي فطری، استفادە لە اموری معتادە بەعلم و عمل، بۆ انسان، لە هەزار خوارق چاکترە! خوارق دێ و دەڕوا، ئەبێ بەحکایت، پاشان هەزار درۆ هەڵئەگرێ ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ حضرەتی رسول بەو قسە زۆر عاجز و دڵگیر و سینە تەنگ بوو. خۆی (مفتری)! قرآن (مفتری)! ادعای افترا، حقیقةً زۆر ناخۆشە، ئەو نوعە اسنادە! انە ئەیان ووت: (ئەگەر مقتر حاتمان نەیێتەجێ، دعوای ئەو شخصە افترایە!) ﴿قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ﴾ طبعاً لە مەیدانی افترادا، سبق و جولان بۆ ئێوەیە! ﴿وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ﴾ غیری خوا، هاواری ببەنە بەر، امدادتان بدا. چۆن ئەڵێن من افترام کردیە بەخوا؟ ئەو قرآنە من دون اللەیە؟ بەدرۆ دە ڵێم لە طرف خوایە؟ ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ لەو اسنادە! یا لە هەنجەتی ایمان پێ نەهێنان! مشهورە لە بەینی مفسران اولاً تحدی بەهەمو قرآن، نەیانتوانی! ثانیاً بەدەسورەت، نەیانتوانی! ثالثاً بەیەک سورەت، ئەویشیان پێنەکرا! وەک لە سورەتی (بقرە) ئەفەرموێ: (فان لم تفعلوا ولن تفعلوا.. الآية). بەڵام (سید رشید) بەو قسە راضیی نیە. حقیقةً تحدي بەهەمو قرآن تا تەواو نەبێ تصور ناکرێ! (سید رشید) ئەفەرموێ: (آیتي بقرە، آخري آیاتی تحدیە، وە سورەی «هود» پاش سورەی «یونس» نازل بووە.) تفصیلاتێ دوور و درێژی هەیە، شایانی مطالعەیە! بانقل و ترجمەی بۆ محشیبێ انشاءالله. لە پێش (سید رشید)، (سیدي آلوسي) لەم قسە نقلي خلاف ئەکا. کەوابێ ئەو انکارە، لە مبتکراتي (سید رشید)نیە! ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ﴾ (ولن یستجیبوا ابداً). ئەوانەی الاهتانن، ئەوانەی رێتان لێئەگرن، ئەو

ترەهاتانەتان فێر ئەکەن، مظاهرە و معاونتی ئێوەیان نەکرد! یاخود ئەگەر ئەو قائلانە نەتوانن جوابی ئێوە بدەنەوە، مقداری (١٠) دە سورەت بێنن! و علی الحالین ﴿فَاعْلَمُواْ﴾ بێ شک و شبهە. ﴿أَنَّمَا أُنزِلِ بِعِلْمِ اللّهِ﴾ ئەو علمەش محیطە، ازەلی و ابدیە، کەس مداخلەی تیانیە! ﴿وَأَن لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ﴾ شرکایانی ئێوە، دیارە چ نین! وە الاّ معاوەنەتیان ئەکردن! ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ لە پاش قیامی ئەو دەلیلە باهرە، برهانێ قاطع بۆ عزر و بەهانە! اما توجیهی ئەو خطابە بۆ مسلمانان لەو مقامە، لای (حقیر) زۆر بێمعنایە!! حتی ناتوانم بڵێم صحیحە! گەرچی (سید رشید) ئەفەرموێ: (صحیحە، اما خلافی ظاهر و متبادرە!). ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ وەک، ئەوانە! ﴿وَزِينَتَهَا﴾ لە خدم و حشم، ماڵ و منداڵ! ﴿نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا﴾ لە دونیا اجری عملیان پێ دەگەیەنین بەتەواوی. وایان زانیوە لە ارادە، مراد، قصدە! انە ئەو کەسە ی ارادە و ئارەزووی حیاتی دونیا و زینەتی بکا، خوا بەتەواوی ئارەزوی پێک دێنێ، خۆ ئەمەش دیارە وانییە! بعضێ بەنسخ، بعضێ بەتعلیق بەمشیەتی الاهي، لە سؤال دەرئەچێ. بەڵام ئەوەی ارادەی حیاتی دونیا بکا بەشوق و ذوق، بۆ تحصیلی، تێئەکۆشێ، تبذیر ناکا، بەڵکو بێهودە پوولێ صرف ناکا، وەک دونیا پەرستانی غربی! لاشک ئەوانە فوق الأمل دەوڵەتی دونیایان بۆ کۆ ئەبێتە وە! تەماشای سعیان بکە نفطی (بابا گوڕ گوڕ) بەبۆریە بردیان بۆ (حیفا) ساحلی بحری سپی ناوەڕاست چیایان ئەکۆلن، معادن دەردەخەن، بۆ ملت و وطنی خۆیان قصور ناکەن! ﴿وَهُمْ فِيهَا﴾ لە دونیا. ﴿لاَ يُبْخَسُونَ﴾ نقص ناهێنن، زیان ناکەن، رۆژ بە رۆژ تەرەقی ئەکەن، خۆیان! قەومیان و دەوڵەتیان، لە سایەی ئەو دەوڵەمەندانە! ﴿أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ﴾ ئەوانە، ئەوانەن! ﴿لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ﴾ لە قیامت. ﴿إِلاَّ النَّارُ﴾ ئاگری ئەندۆە و حسرەت و

ندامت، یا روحانی و جسمانی! ﴿وَحبط ما صَنعُواْ﴾ له ئالات و ادوات و ماکینەجاتی مصانع، که اختراعیان کردبوو بۆ مالی دونیا پەیدا کردن! ذاتاً ﴿وَباطلٌ مَّا كانُواْ يَعْمَلُون﴾ صرف بۆ دونیا بوو، بۆ نجاتی بشر نەبوو! حتا ئەبینی بەانواعی بێناموسی بێشەرەفی بێ عهدی، مقاصدی خۆیان ئەهێننەجێ! مەلایان خلافیانه له تاکید و تاسیس له مەیانی ئەم دوو جملە، زێرا صنع و عملیان کردۆتەیەک! نظر به اتحاد، تاکیدە! نظریە اختلافی اعتباری، تاسیسه! ئەوانە، دەخلیان بەایمانە وە نىیە! ایمان بەرسول، ناێنن، نییانه، وەنابێ، گوێ نادەنە آیات و بیناتی عقلی و حسی! ئەوانە لەکێ؟ ﴿أفمن كان على بيّنة مّن رّبّه﴾ لەکێ؟ ئەمانە، بەنوری عقل، ئەزانن، دونیا هیچە! خۆ پێخەریک کردنی، بێهودەیە! ﴿ويتْلُوهُ﴾ دوای ئەو برهانە، بۆی دێ! یا ئەخوێنێ! برهان و دەلیلی کەونی، وحی بۆی ایضاح ئەکا! ﴿شاهد﴾ گەورە خبردار. ﴿مّنْهُ﴾ له طرف خوای، دەبێ! رسولی گوزین تبعیەتی ئەکا! برهانی عقلی و وحی، توافق ئەکەن، لای جمع ئەبنەوە! ﴿من قبله﴾ ئەو شاهیدە! ﴿كتاب موسى﴾ هاتووە، ئەویش شاهدی بۆ ئەدا! ﴿إماما ورحمة﴾ پێشەوایە، بۆ کەسێ اقتدای پێ بکا! رحمتە له طرف (باری) نە یکاتە موجبی کفرو انکاری رسولی غائب و شاهد! ﴿أُولَـئك يؤمنون به﴾ بەقرآن! ایمانی عملی! طریقێ وسط ئەگرن، بۆ صلاحی دونیا و قیامت سعی ئەکەن، تەرەقی بەبشر ئەدەن، بەاخلاقی فاضله متخلقیان ئەکەن، له رزائل ئەیانپارێزن. ﴿ومن يكْفر به﴾ بەقرآن! ﴿من الأحزاب﴾ لەبەر تحزب! مالی احزاب وێرانبێ! دین و دونیا تێک ئەدەن! هەریەک مقصدی تحکیمی حزبی خۆیەتی! هەرچی باداباد!!﴿فالنّارُ موْعدُهُ﴾ چی پێناکرێ! گەرچی تعویقاتێ ئەدا! اما عاقبەت، خائب ئەبێ! ﴿فلا تكُ﴾ ایها الشاهد! ﴿في مرية منه﴾ لەو حکمە، یا قرآن! بەقسەیوان، دەغدەغە بەخاطر

مەگەێنە! ﴿إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ تەواوە! لە طرف خوای خۆت، بۆت هاتووە! نظر بەاوائلی رسالەت و صولت و سطوتی دوشمن، ئەو نوعە نهیە، زۆر بەجێیە! زێدە صبر و ثبات و قووەت و امل، ئەداتە حضرەتی رسول! ﴿وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ﴾ ئەوەی تابعی هەواو هەوەسە، ئەوانەش خودا دەزانێ چەند زۆرن، خاصةً لە زەمانی ئێمە لە صەدي (٩٩) نەوەدونۆی تابعی کیفی خۆیەتی! ئەوانە ﴿لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ بەقرآن! گوێشی لێناکەن! ممکنیان بێ، مەحوی ئەکەنەوە! (امام فخرالدین الرازي) ئەفەرموێ: (اولي ئەو آیتە مشتملە لەسەر چوار لفظی مجمل. ئەوەی «علی بینة»ە، کێیە؟ «بینە» کە چییە؟ «یتلوە» لە «تلاوت»ە، یا «تلو»وە. ئەو «شاهد منە» وە کێیە؟ بۆیە اختلافي مفسرینان لەو آیتە، زۆرە! الخ...).

لە اختیاری مفتی الأنام (عمادي) و مفتي العراق (بغدادي) مراد بە (بینە)، قرآنە! (یتلوە) بەمعنا (یتبعە)وە! (شاهد منە) اعجازی قرآنە! وکذا مەلای دیش گەلێ قسەیان کردووە، لای (حقیر) پەسندنین! تفسیری (شاهد) بەشاهدی بنیی اسرائیلی وەک (عبدالله بن سلام) ئەگەر تاریخ لێی گەرێ، جوانە!! ئەفەرمون: (ئەو سورەتە هەموی مکیە! ئەوسا باسی ابن سلام و غیر، نەبووە. ئەگەر بڵێین مستثنییە، مناسبی مقام نیە، نقلی بۆ ئێرە نالایقە!). بعضێ ئە ڵێن: (شاهد) ابوبکرە! قسمێ ئەڵێن علییە! اما شاهدی تخصیص، نیە! بنا لە مختاری ئێمە، ئەو نوعە ذواتە، بەبەر (من کان علی بینة من ربە)ی ئەکەون!! ئیتر مراجعەی تفاسیر بکە! (واختر لنفسک مایحلو)!! ئەوەی ئێمە نوسیومانە، لە هەمویان باشترە!! ئەمڕۆ لە هەمو ڕۆژێ، انسانی مؤمن و کافر، لە ایمان بەقرآن دوورترن! لە هەزاری یەک کیفی بەهدایەتی قرآن نایێ!! خاصةً شیوعی خمر و میسر و رقص و دانسی ئافرەتان، سوادی أعظمی لە قرآن وەرگێڕایە! ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللّهِ كَذِبًا﴾ بلێ، رسولم! خوا وا ئەفەرموێ!، (حدثني قلبي عن ربي)،

ئێوە لە مردیان نقل ئەکەن، ئێمە لە حی قیوم! خوا بمانپارێزێ لەو درۆزنانە، ئێستا زۆرن! ﴿أُولَـٰئِكَ يُعْرَضُونَ﴾ لە رۆژی عرض ئەنوێندرێن ﴿عَلَى رَبِّهِمْ﴾ ئەو خوایەی کە اعراضیان لێنابوو درۆیان پێهەڵئەبەستا. ﴿وَيَقُولُ الأَشْهَادُ﴾ ئەوانەی مطلعن لەسەر احواڵیان. ﴿هَـٰؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى رَبِّهِمْ﴾ اعلانی ئەکەن لەگەڵ تعیین و تشخیصیان. ئەوان یا لە طرف خوا ئەگوترێ ﴿أَلاَ لَعْنَةُ اللّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ (ایا کان)! دیارە دوورن لە رەحمەتی خوا! ﴿الَّذِينَ يَصُدُّونَ﴾ وەرئەگێڕن! ﴿عَن سَبِيلِ اللّهِ﴾ رێی ڕاست و رەوان. ﴿وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ ئەوەی موافقی قولی کەچی ئەوان بێ، وەک (باب و بهائي)، ئەوەی ئەزانن فکری عامەی عصری لە سەرە، ئەوەی تصدیق ئەکەن! حتا مذهبی (داروین)! بەڵێ بەس بۆ خاطری دەعوای رسالت! ﴿وَهُم بِالآخِرَةِ﴾ حشری اجساد. (باب) انکاری ئەکا، (بها)ش ئەڵبەتە انحراف ناکا لە طریقي (باب)! ﴿هُمْ كَافِرُونَ﴾ و من العجایب تصدیقی رسالتی خاتم الرسلش ئەکەن، مع انە تصدیقی حشری اجساد، سێیەم رکنی دینیەتی! لای (حقیر) وایە حشری اجساد نەبێ، نبووەت هیچ لزومی نیە! معادی روحانی ئەوەی بڵێ روح جوهرە بعد مفارقة البدن نافەوتێ، قولی پێئەکا! حتا مشرکنیش! ﴿أُولَـٰئِكَ﴾ ئەوانە. ﴿لَمْ يَكُونُواْ مُعْجِزِينَ﴾ خوایان پێ بێهێز نەکراوە. ﴿فِي الأَرْضِ﴾ گەرچی بەسایەی ئەو درۆیانە بوون بەصاحبی قوەت و مکنەت. ﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ اللّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ ناصر و معینێ وایان نە بووە، مع هذا جەنابی حەق امهالی دان بۆ رۆژی جزاء. ﴿يُضَاعَفُ لَهُمُ الْعَذَابُ﴾ بەگوێرەی کفر و منعیان. ﴿مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ﴾ گوێ لە قرآن گرن، خاصةً پاش تفرقەی قومیەتی خزمانی رسالت پەناه، لەبەر تحزب گوێیان نەئەدا قرآن، فکیف ئەمرۆ حاڵی اقوامی بعیدە؟ ﴿وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ﴾ انە دلائلیان نەدەدیت، بێچاوو روو وحیاء، دوای دعوای باطلی

خۆیان ئەکەوتن. ﴿أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ خَسِرُواْ أَنفُسَهُمْ﴾ بەڕاستی بەبێ هودەیاندا! بەضایع چون خۆیان لێگۆڕا! ڕێیان گۆڕی! ﴿وَضَلَّ عَنْهُم﴾ لێیان گوم بوو. ﴿مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ لە هذیانیان. ﴿لاَ جَرَمَ﴾ بەتحقیق بێشک و شبهە ﴿أَنَّهُمْ فِي الآخِرَةِ هُمُ الأَخْسَرُونَ﴾ نفسیان خبیث و بێقوم و قیلەیە. ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ایمانێ کامل و بەقووەت. ﴿وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ زاتاً عملی صالح، ثمرەی ایمانە. ﴿وَأَخْبَتُواْ إِلَى رَبِّهِمْ﴾ نەوی بوون بۆ لای خوا. ئەم نەوی بون و گە ردە ن دادانە چ بڵندیە کی تێدایە؟! وە ک ئە وانی دی، کبرو انانیە ت و حبي استلا و رئاسەتیان نیە! ﴿أُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ الجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانەی مقابلیان حەقیان لەسەر جنة نیە، فضل لە خلودی! ﴿مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ﴾ کە لە تفصیلی سابق زاناندران. ﴿كَالأَعْمَى وَالأَصَمِّ﴾ کە (ما کانوا یستطیعون السمع... الآیة) ﴿وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ﴾ ئەبینن، ئەبێن، دەرکی حقایق ئەکەن، خۆیان ئەناسن، خەڵکیش ئەناسن! ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ﴾ ئەو دوو فریقە وەک یەک ئەبن؟ ﴿مَثَلاً﴾ لە صفات و احوال، حاشا وە ک یەک نابن! ﴿أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ﴾ پاش ئەو بیان و تحریر و تقریرە، یادێ، تفکرێ، لە حاڵی خۆتان ناکەن؟ چاوی اعتبار لێک ناکەنەوە؟ ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا﴾ (علیە السلام). ﴿إِلَى قَوْمِهِ﴾ عشرەتی خۆی. هەرچی ئەڵێن لە (و)، حالي حضرەتی رسالت، لەگە ڵ قوم و خوێشی، زۆر مناسبە لەگەڵ حاڵی حضرەتی (نوح) و قومی! ئەو حضرەتە بەقومی خۆی ئەفەرموێ: ﴿إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ بۆتان ئاشکرا ئەکەم ئەوەی ئێوە لە سەرن عاقبەتی وخیمە. ﴿أَن لاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ اللّهَ﴾ غیري واجب الوجود بێ نظیر و مثال مەپەرستن! هیچ کەسی لەوان بەفریادتان ناگا! ﴿إِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەمن ئەترسم، لەسەر ئێوە، بۆ ئێوە، ترسم بۆ خۆم نی یە! ﴿عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾ زۆر بەئێش و ژان. عظم و گەورەی عذاب، بەاعتباری المە، تا بەشدەتتربێ، گەورەترە!

﴿فَقَالَ الْمَلأُ﴾ اشرافی قومی. ﴿الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِ﴾ زاتاً ضعفای قوم علی الأكثر تابعی شرفان! بۆیە جەنابی رسالت، بەڵکو سائری رسل، ئارەزویان ئەکرد گەورە گەورەکان زوو مسڵمان ببن، نەبن بە عائق. ﴿مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَرًا مِّثْلَنَا﴾ هیچ فرقت نیە لەگەڵ ئێمە. معنای چیە خوا تۆ ئەکاتە رسول، بۆ سەر ئێمەت ئەنێرێ؟ وەک (ابوجهل) و وان ئەیان ووت: (ئێمە لەگەڵ بنی عبد مناف، لە مجد و شرف، مساوین! ئارەزویان وایە بەرسالت تقدم لە ئێمە بکەن! ئەمە، نابێ!). ﴿وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا﴾ ئەوانەی هیچ و پوچ، اردا و احقرن! ﴿بَادِيَ الرَّأْيِ﴾ بێ تامل، هەروا سەرسەری بەدوات کەوتووون، وە ایمانیان پێت هێناوە! ئەگەر تاملیان کردبا، ئەیانزانی، تۆش وەکی وانی! ﴿وَمَا نَرَى لَكُمْ﴾ تابع و متبوع. ﴿عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ﴾ بەو اتباعە چ قووەتتان نابێ، زێدەی بەسەر ئێمە دابکەن، بەسەرماندا باغریبن! ﴿بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ﴾ لە دعوا و تصدیق و اتباع. تەماتانە خۆتان بکەنە گەورە لەسەر ئێمە؟ ئەو اراذلانە ببنە شرفای قوم؟ بۆ ایمان نەهێنان، ظنیان بەکافی دیتوە! فيالحقیقة بۆ تکذیبی رسالت، ظنی کذب، کافیە! ئەگەر ظنە کە بەجێبێ، لە هەواو کبرەوە نەبێ! ﴿قَالَ﴾ (نوح) لە جوابیاندا ﴿يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ﴾ خبرم دەنێ -استعمالي وایە!- ﴿إِن كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ﴾ دەلیلێ، حجتێ واضح و ئاشکرا ﴿مِّن رَّبِّي﴾ لە طرف خوای خۆم. ﴿وَآتَانِي﴾ پێیکرم کردم. ﴿رَحْمَةً﴾ نبوەت، امتیازی فطری، زکای وهبی ﴿مِّنْ عِندِهِ﴾ لە طرف خۆی. با انسانێ بم لە اصلی انسانێ مثلی ئێوە، اما فرق لە بەینی انسانان زۆرە! وە الاّ فرق لە بەینی ئێوە و اراذلەکانیش نیە! ﴿فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ﴾ بزربوە، یا برزکرا و لەسەر ئێوە، لێتان بویتە کەرری کوێری. ئەوسا رایتان چیی یە؟ چی ئەڵێن؟ ئەڵێن: (آیاتی الجائیمان ئەوێ؟) ﴿أَنُلْزِمُكُمُوهَا﴾ ئایا اجبارتان ئەکەین؟ هدایت بینتان لەمل شتەک ئەدەین؟ ﴿وَأَنتُمْ لَهَا كَارِهُونَ﴾ حەزی

پێناکەن! کیفتان لەگەڵ بینە و هدایت نایێ! تابعی هەوان! ئەمە، نابێ!! ئەبێ ذهنی ناظر لەو نوعە شتە، پاکبێ! وە الاّ بورهان فائدەی پێنادا! حتا گوێش لە تقریری ڕاناگرێ! مراد لە الزام، الزامی تکوینیە! اما الزام و ایجابی شرعی، هەیە! بەڵام، مؤثر نیە! الاّ بۆ ئەوانەی داعی ایجابەیان لە دڵدا، ڕاسخبێ! ﴿وَيَا قَوْمِ﴾ لەو ندایە چەند خۆش دێتە گوێی انسان! ئەو زاتە چەند بەلطف بووە لە حەق عشرەتی قومی! چەندی مقصود بووە دووچاری عقابی الاهی نەبن! ﴿لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً﴾ بۆچی متهمم ئەکەن؟ مقصدم مال نیە! فضل لە رئاسەت و ذلیل گەورە کردن! گەورە، ذلیل کردن! تبلیغم بۆ خوایە! بۆ قازانجی ئێوەیە! ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللّهِ﴾ لەسەر کەسی دی، نیە! بەهانە بەاراذلەکان ئەگرن؟ ئە ڵێن: (دەریان کە ئەوجا دێینەلات گوێت لێڕائەگرین وە ایمانت پێدێنین، وە الاّ ئێمە خۆمان ناکەینە رفیقی ئەو اراذلانە!!) حضرەتی (نوح) ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنَاْ بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ هەر چەندە ضعیف و بێدەسەڵات بن، من دەریان ناکەم! دەعوەتی من بۆ هەموانە! ئەوەی ایجابە بکا، چۆن طردی ئەکەم؟! حقیقةً وەک (هرقل) لە جوابی (ابوسفیان) ئەڵێ: (ئەو نوعە ضعفایانە، اتباعی رسلن، بێ علاقة و کبر وانانیەتن، ایمان زوو ئەچێتە ناو دڵیان، مانعی تیانیە!) ﴿إِنَّهُم مُّلاَقُو رَبِّهِمْ﴾ ایمانیان هێناوە، نزیک بووون لە خوا، لە حجابی کفر و شرکیان، لاداوە! ئەو بەهانەتان، بێ معنایە! چ وجهی تێدا نابینم! ﴿وَلَـكِنِّيَ أَرَاكُمْ﴾ راي مصيب! ﴿قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ قومێ نەزانن! فرقی رئاسەت و رسالت ناکەن! خوا، خوای هەمو عالەمە! بێفرقی عزیز و اراذل! ئەبێ رسولیشی وابێ! مقصدی اهتدای بشربێ! ﴿وَيَا قَوْمِ﴾ لەسەر ئەم جهالەتەشیان، دیسان ئەو خطابەشیان لەگەڵ ئەکا. ﴿مَن يَنصُرُنِي مِنَ اللّهِ﴾ کێ نجاتم ئەدا لە عقابی خوا؟ ﴿إِن طَرَدتُّهُمْ﴾ بڵێم: (من رسولي خوام)، ضعفای مؤمن دەرکەم؟

مستحقی عقاب ئه‌بم! منافی رساله‌ته!! ﴿أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ﴾ تذکری، تفکری، تاملی، تصوری ناکه‌ن؟ هه‌روا له‌و جهالته‌دا ئه‌مێنن؟ لا ابالی احمقانه هه‌نجه‌تان ئه‌گرن، ته‌ماشای حجتان ناکه‌ن! ﴿وَلاَ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ﴾ ئه‌وجا بلێن: (کوا قصر و قصور و علمان و حورت؟ کوا خدم و حشم و ماڵ و مناڵت؟ بۆ ئه‌و فقیرانه ده‌وڵه‌مه‌ند ناکه‌ی؟) ﴿وَلاَ أَعْلَمُ الْغَيْبَ﴾ چتان به‌سه‌ردی؟! که‌ی به‌سه‌رتان دێ؟! به‌س انذار وظیفه‌ی منه! تعین و تحقیقی عائدی خوایه! ﴿وَلاَ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ﴾ بشرم، وه‌کی ئێوه! لكن له الحمد، به‌ره‌حمه‌تی خوا، امتیازم هه‌یه! دعوای رسالت مستلزمی دعوای ملکی نیه! ﴿وَلاَ أَقُولُ﴾ اصلاً! ﴿لِلَّذِينَ تَزْدَرِي أَعْيُنُكُمْ﴾ چاوی ئێوه ئه‌وان به‌که‌م و حقیر ئه‌بینێ، اما حقیقةً گه‌وره‌ن! وه‌ک ئه‌ستێره، چاو به‌گچکه‌ی ده‌بینێ، اما زۆر گه‌وره‌ن!! گوناه، تاثیری بۆ چاوه، گه‌وره به‌گچکه ئه‌بینێ! ﴿لَن يُؤْتِيَهُمُ اللّهُ خَيْراً﴾ له دونیا، له عقبا، ئه‌وانه‌ن که له سوره‌تی (اعراف) ذکر کران اصحابی اعراف اشاره‌یان ئه‌که‌نێ (اهؤلاء الذين اقسمتم لا ينالهم الله برحمةٍ). ﴿اللّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِي أَنفُسِهِمْ﴾ گه‌رچی به‌علائمی قوی، منیش اخلاصیان ئه‌زانم، به‌ڵام خوا اعلمه! به‌ڵکو له مه‌ش زیاترن، که من ئه یزانم! نفسیان پاکتره، ایمانیان ارسخ‌تره! ﴿إِنِّي إِذاً﴾ ئه‌گه‌ر وایان پێ‌بڵێم، یعنی له حه‌ق بلێم، ﴿لَّمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ له متجاوزانی حدی رساله‌تم. ملائی (قریش)یش ئه‌و نوعه اقتراحانه‌یان ئه‌کرد. والجواب الجواب! ﴿قَالُواْ يَا نُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا﴾ مخاصمه، ده‌لیل هێنان و ردی اعتراض و تسفیهی اقتراح ﴿فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا﴾ به‌بێ هووده درێژیت دایێ! یا به‌انواعی جدال له مسائلی مختلفه تاثیری تێ‌نه‌کردین، ایمانمان پێت نه‌هێنا. ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا﴾ ئه‌تو ئه‌ڵێی منذرم، له عذابێ الیم ئه‌مانترسێنی! ده‌بیهێنه! ﴿إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ له رسالت و وه‌عدت. ﴿قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ اللّهُ إِن شَاء﴾ هێنانی به‌من ناکرێ! کاری

خوایه! به‌س ئاره‌زو بكات، ئه‌یهێنێته سه‌رتان! ﴿وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ له قبضه‌ی قدره‌تی خوا نجاتتان نابێ! ﴿وَلاَ يَنفَعُكُمْ نُصْحِي﴾ (نصح) چاكه نیشان‌دانه بۆ كردن! خراپه نیشان‌دانه بۆ ترك! ﴿إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ﴾ بۆ نفعتان! زاتاً اراده‌ی ناصح، اراده‌ی تكوینی نیه! قولی‌یه! تاثیری متوقفه له‌سه‌ر قبولی قابل! ﴿إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ﴾ به‌تكوینی! مشاجره زۆر هه‌یه لێره. ئه‌وانه‌ی ئه‌ڵێن: (خوا اراده‌ی اغوای عبد ئه‌كا، تێی‌دا ئه‌خوڵقێنێ)، لایان ظاهره له مرادیان! منیش لاموایه ظاهره، به‌ڵام (علی الأطلاق)نا! جه‌نابی حه‌ق هادی‌یه، رسول ئه نێرێ بۆ هدایت، پێ‌ئه‌دا، نصره‌تی ئه‌دا بۆ اهتدای بشر! ئه‌وانه‌ی ایمان نائێنن ده‌ره‌جاتن، تا عنادیان ده‌گاته مقامی دڵیان، وایان لێدێ اصلاً قبوڵی ایمان ناكه‌ن، به‌هانه ئه‌گرن، دعوای رؤیة الله ئه‌كه‌ن، ملكیان بۆ بێ، عجاییبات و غراییباتیان بۆ اظهاربكرێ! ئه‌و وه‌قته خوا دڵیان مۆر ئه‌كا! بۆ طرقی ضلال و فساد، سوقیان ئه‌كا! به‌گوێره‌ی میل و مشربی خۆیان! حتا بعضێ تسلط ئه‌كه‌ن، رسوله‌كه‌ی ئه‌كوژن! به لام اول و آخر، له طرف خوای، اجبار نی‌یه! نه‌بۆ ایمان، نه‌بۆ كفر! نه اجباری تكلیفی، نه اجباری تكوینی! به‌ڵكو له‌سه‌ریان واجب ئه‌كا به‌اختیاری خۆیان ایمان بێنن! وه ئه‌و قسه‌ی له حاڵێ‌دا فه‌رمووه كه لای نێزیك بووه كه عیان‌بێ، ئه‌وانه راسخی فی الكفر بووین، ایمان له‌وان بویته مستبعدێ نێزیك له محاڵ! حاصڵی ئه فه‌رموێ: (ئه‌گه‌ر خوا اراده‌ی اغواتان بكا، ئه‌گه‌ر نصیحه‌تتان بكه‌م نفعتان پێ‌نادا!) كانه شرطیه‌ی اولي، به‌خۆ و جوابی، جوابه بۆ شرطیه‌ی ثانی! ئه‌وه موافقی رای (امامي شافعی)یه! (سیدی آلوسی) كۆنه شافعی تازه حنفی ئه‌م تقریره‌ی په‌سند فه‌رمووه! ﴿هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ تصرف له عباد به‌هه‌ر نوعێ بێ، له دونیا له عقبا، كاری ئه‌وه كه‌س مداخله‌ی نی یه! ئایا قومي (نوح) قسه‌ی (نوح)یان به‌نصحیه‌ت ئه‌زانی؟وه قبوڵیان نه‌ده‌كرد ﴿أَمْ يَقُولُونَ

افْتَرَاهُ﴾ بەدرۆ و بوهتانیان ئەزانیٚ، بۆیە ایمانیان پیٚنەدەهیٚنا! قابلە هەردوو نوعیان بووبیٚ، ئەمە فەرمایشی (ابن عباس)ە مختاری جمهور و (سیدی آلوسی)یە! (مقابل) و بعضیٚتر ئەفەرمون: (جملەیٚ معترضەیە، مراد رسول و قومیتي!) ئەمەش مختاری (سید رشید)ە! ﴿قُلْ﴾ یا (نوح)، یاخود یا (محمد)! ﴿إِنِ افْتَرَيْتُهُ﴾ والعیاذ بالله! ﴿فَعَلَيَّ إِجْرَامِي﴾ گوناهیٚ گەورەیە! ئەو گوناهە لەسەر منە، عائدی خۆمە، ئیٚوە برین لە گوناهی من! ﴿وَأَنَاْ بَرِيءٌ مِّمَّا تُجْرَمُونَ﴾ (لکم دینکم ولي دین)، (ولاتزر وازرة وزر اخری)، (لي عملي ولکم عملکم! و بالی خۆتان بە ملی خۆتان!) ﴿وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ﴾ دیارە ئەم وحیٚیە لە طرف خوایە، بەصورەتیٚ قطعی! بۆیە معلومکرا! ﴿أَنَّهُ﴾ شان. ﴿لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلاَّ مَن قَدْ آمَنَ﴾ من بعد غیری ئەوانەی ایمانیان هیٚناوە، یەکیٚ لە قومی تۆ ایمان نائینیٚ. یا هەر ئەوانەی ایمانیان هیٚناوە، ایمان دیٚنن، کەسیٚتر ایمان نائینیٚ! ئەو استثنایە، بۆ افادەی استحالەیە! ﴿فَلاَ تَبْتَئِسْ﴾ ئەندۆە گیرمەبە! ﴿بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾ نیٚزیک بووە زەمانی تۆ لە ﴿وَاصْنَعِ الْفُلْكَ﴾ کەشتی دروست بکە! ﴿بِأَعْيُنِنَا﴾ بەچاوەدیٚری ئیٚمە، تۆش و سفینە شت حفظ ئەکەین لە تجاوزاتی قومت. (فلک) و غیرە فلک، بەچاوان دروست ناکریٚن، ولو صانع صاحبی چاوبیٚ! فکیف ذاتیٚ مقدس لە آلاتی حیوانی؟ لەبەر اعتبار مقدمی کردیە لەسەر ﴿وَوَحْيِنَا﴾ لەوحی ئەزاندریٚ کە (نوح) (علیە السلام) مخترع بووە، لە وەستایٚ تری وەرنەگرتوە! اما اول کەس لە بشر، حضرەتی (نوح)ە، کە کەشتی دروست کردیە، معلوم نیە! بعضیٚ اولیاتیان بیان کردیە لە زەمانی غابریە گەلیٚکی قبل التاریخ، اما هیچی معلوم نیە! بەلاّم اولیاتی ئەم عصرە معلومە، بشر بەحالّی یەک خبردارن، بەزۆری! بەزۆری ﴿وَلاَ تُخَاطِبْنِي﴾ گوفتوگۆم لەگەلّ مەکە ﴿فِي الَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ دەربارەی وان، بۆ نجاتیان تکام لیٚمەکە!! سبحان

الله لە رەحمی حضرەتی (نوح)! حنوی ایجابی كردوە لەو حالە مراجعە بكا، بەڵكو بەحری رەحمەتی الاهی دێتە جونبوش ئەمجارەش عضویان ئەكات! ﴿إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ﴾ قراری قطعیە، قابلی تێكدان و گۆڕین نیە! حسب الأمر ﴿وَيَصْنَعُ الْفُلْكَ﴾ دروستی ئەكرد. بۆ تەواو كردنی زەمانێكی ئەوێ ﴿وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ﴾ لە وەقتی صنعی فلك ﴿مَلأٌ مِّن قَوْمِهِ﴾ عمداً یا بە اتفاق ﴿سَخِرُواْ مِنْهُ﴾ گەمەیان پێئەكرد، ئەمە، چیئەكا؟ئەو طوفانەی ئەو ئە لێ، چۆن بەو كەشتیە لێی قوتار ئەبن؟ رەنگە ئەوەی ئەفەرموێ امری (واصنع الفلك)ە امری اباحەیە، بۆ وجوب نیيە، لەبەر ئەو وجهەی فەرمووبێ! بەڵێ دیارە لەو طوفانە عظیمە، بەو كەشتیە نجات محاڵە! تەماشا پاپۆڕی گەورە گەورە لە بعضە بحراندا حركەی پێ ناكرێ، زێرا نسبەت بەئاوەكە زۆر گچكەیە، بەقەد لانكێ خۆی نانوێنێ! وە سفینەی حضرەتی (نوح) هەر چەند گەورە بووبێ لەگەڵ ئاوی طوفان نسبەتی نەبووە، خاصةً ئاو لە عەرد هەڵقوڵیبێ وە لە ئاسماندا ڕژاندرابێ، فيالحقیقة حفظی الاهی عنایتی صمدانی نگاهداری سبحانی پێ ئەوێ! اما ئەوان كافران، ایمانیان نەبوووە! ﴿قَالَ﴾ حضرەتی (نوح). یەک دفعە یا گە لێ جار، ظاهری (كلما مر) ئەمە ئەگەیێنێ! ﴿إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا﴾ خۆ و عملی! ﴿فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ﴾ ئەو وەقتەی كە ئاو دێ، دەتانبا، ئەكەونە پەلەكوتێ بێهوودە! (جامي)م ئەخوێند بەهار بوو رۆژێ خۆش بوو چومە دەم رووبار بۆ دەور كردنەوە، لە پشت (كانیلە) خەریكی بووم. (جوولەكە)كانی خم خانەچی، گەلێ بەڕە سیپاریان هینا بووە ڕووبار، ئەیا نشوشت. لەو هەنگامە لە لای چیای غربی شمالی بارانێ زۆر باری، ئاگایان لە خۆیان نەبوو، لافاوهات، شرت و پرتەكانی بردن. ها لێرە ها لەوێ (جوولەكە)كان كەوتنە دوایان، لەوێ ئەكەوتن، لەوێ رادەقەنان، خۆیان بەداران ئەگرتەوە، لام زۆر سەیر بوو! گەلێ پێكەنیم، ئاگام لە دەور و مەور نەما.

لەو وەقتەدا حضرەتی (نوح) گەمەیان پێ بکا بەحقیقي، چ باسێکي هەیە؟ محقق بزانن، ئەمە بالفعل ئەبی! ﴿كَمَا تَسْخَرُونَ﴾ واقعە بالفعل! بێشک و شبهە، ئەیبینن! ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ عين اليقين. ﴿مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ﴾ رذيلی ئەکا، ئابرووی ئەبا. ئەوان با هەر بلێن (وما نراک اتبعک الا الذين هم اراذلنا) ئەو وەقتە اراذل، بەراستی دەر ئەکەون! ﴿وَيَحِلُّ عَلَيْهِ﴾ دێ بەسەریا ئە چێتە ناوی، لە سەري قرار ئەبەستێ! ﴿عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ ئەو سابلێن: (دیارە ئەو مؤمنە بێ دەسەلاتانە «لن يؤتيهم الله خيراً»؟) لاشک ئەوانە لە نعمی مقیمدا، دەوام ئەکەن! حضرەتی (نوح) خەریکی دروست کردنی (فلک) و مماشاة و مجاراتی قوم بوو.

﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا﴾ امری (تکوینی)، بەنزولی عذاب! یاامری (تکلیفي)، بەچوونە ناو کەشتی! ﴿وَفَارَ التَّنُّورُ﴾ غضبی الاهی اشتعالی کرد شدەتی ستاند، جێی ترحم نەما! یاخود طلوعی فجر، وەک لە (امامي علي) منقولە! یا وەکی مشهورە مراد علامتە لەسەر هاتنی عذاب، ئاو لە تەندور هەڵقولێ! اما ئەو تەندورە لە کوێ بووە، هەر قسەێکي ئەیکەن، گوێي مەدەني! چتاقیان بە ڕاستي پێي نازانن! ﴿قُلْنَا﴾ وحیاً، یا بەعلامەت! ﴿احْمِلْ فِيهَا﴾ بیهاوێ ناو سفینە ﴿مِن كُلٍّ﴾ لە هەر نوعە حیوانێ، کە لەبەر دەستت دایە! ﴿زَوْجَيْنِ﴾ جووتێ، نێرومێ! ﴿اثْنَيْنِ﴾ نەدوو جووت! ﴿وَأَهْلَكَ﴾ عائلەت لە اولاد و ازواج. ﴿إِلاَّ مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ﴾ (کنعان) اما (سام و حام و یافث) و داکیان، (لە ناجیان بوون! ﴿وَمَنْ آمَنَ﴾ بیان خەرە ناو (فلک) ﴿وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ لە عددیان گەلێ قسەکراوە. ﴿وَقَالَ﴾ (نوح) فەرموي: ﴿ارْكَبُواْ فِيهَا﴾ لە ناویا سواریبن! ئەمە، زۆر لطیفە! هەم رکوبە، هەم استقرارە، لە ناویدا! بۆیە نافەرموێ (ارکبوها)! سواري کەشتي و اشباهي، وەک سواري حیوانات نیە! سبحان الله ئەمە زۆر ظاهرە، وە گەلێ

مفسر بۆي نەچووون! لە قرآن بەو جۆرە واردە، ركوب بۆ فلک و سفينە بە (في) تعديەی پێكراوە! دوايێ ديم، بعضێ محقق بەو نوعەيان توجيە فەرمو بوو! ﴿بِسْمِ اللّهِ﴾ بەناوي خوايە! بەقووەت و عنايەتي ئەوە! ﴿مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ جريان و راوەستاني، بەسلامەتي خۆ و سكاني. ﴿إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەر قصورێكيان هەبێ، مسامحەی ئەفەرموێ، چاومان لێئەپۆشێ. ئەو جاوەرە سەر باس و حكاياتي نقالان دائر بەحيواناتي محمولە وهيئەت و وضعي سفينە! ئەو حيواناتەی لەگەڵ يەک دوشمنن چۆن پێكەوەياني هەڵگرتووە؟ وە خبري ارتفاع و درێژي و پاني و دەرەجات و طبقاتي (فلک)، لەكێ پێبكەوين؟ بنا لە قول و رواياتێ واهي كە (ارشادي عقلي سليم) بە (قيل) ايرادي ئەكا لە (كعبي بن حام) يا نفسي (حامي بن نوح)، كە حضرەتي (عيسی) خۆڵي ئەوي دۆزيوەتەوە، زيندوي كردوتەوە، طول و تفصيلي سفينەی بيان كردوە. ئەوانە وەک (سيد رشيد) ئەڵێ هەموي بێ اصل و اساسن، حتا لە فوقي افترا آتن! وە ئەوەی لە حەق رۆژی (عاشورا) نقل كراوە، غيری اقل الأقل نەبێ، باقی گشتی بێاصلە، وەک (شێخی ابن الحجر) لە (صواعق)دا ئەيفەرموێ! ئەوجا سەيری وعظ و خطبايانكەن! والسلام!! ﴿وَهِيَ﴾ سفينە. ﴿تَجْرِي بِهِمْ﴾ ئەوان لە ناويا ساكن بوون، ئەو حركەی ئەكرد، ئەوانيش بالتبع نقل ئەكران لە محلێ بۆ محلێ. ﴿فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ﴾ بڵند بڵند. لە قاموسی ئەڵێ: (موج اضطرابي امواجي بحره)، موج بەكوردی شەپۆلی ئەڵێنێ. لە ناو شەپۆلی گەورە گەورە وەک چيايان، هەر شەپۆلێ وەک چيایێ! ﴿وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ﴾ وەقتی سوار بوون، ياشتێ دوايێ، كە سوار بونی لە دەست نەچو بوو. ﴿وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ﴾ لە لایێ بەتەنێ بوو، لە ناو عائلەدا نەبوو! ﴿يَا بُنَيَّ﴾ ئەی رۆڵە! ﴿ارْكَب مَّعَنَا﴾ لەگەڵ ئێمە! ﴿وَلاَ تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ﴾ وە الا لەگەڵ وان غرق ئەبی! ﴿قَالَ

سآوي إلى جبل﴾ پەنا ئە بەم بەلای چیای ﴿يَعْصِمُنِي﴾ چیایەکە. ﴿من المَاء﴾ ئاو بەسەری ناکەوێ، نامبا! ﴿قَالَ﴾ (نوح). ﴿لاَ عَاصِمَ اليَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللّه﴾ لە حکم و قضای خوا. ﴿إِلاَّ من رَّحِمَ﴾ ئەو پشت و پەناهی هەیە، نجاتي بەایمان، لەگەڵ مؤمنان، لە ناو سفینە بوونە! ﴿وحَالَ بَيْنَهُمَا﴾ باب و کوڕ ﴿الْمَوْجُ﴾ یا لە بەینی کوڕی نوح و چیا!، حقيقةً ئەمە زۆر جوانە، گەرچی صاحبی (ارشادي عقلي سليم) پێی راضی نیە! ﴿فكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ﴾ لە کفاری قوم! ﴿وقيلَ﴾ لە جهەتی حضرەتی کبریائی. ﴿يَا أَرْضُ ابْلَعِي﴾ قووتی دەوە لێ لوشەوە ﴿مَاءكِ﴾ ئەوەی لێت دەر قوڵیوە! ﴿ويَا سَمَاء أَقْلِعِي﴾ بیبڕەوە، بەسکە! ﴿وَغِيضَ الْمَاء﴾ ڕوو چوو. ﴿وقُضِيَ الأَمْرُ﴾ حکمی خوای بەجێهات. ﴿وَاسْتَوَتْ﴾ سفینە. ﴿عَلَى الْجُودِيِّ﴾ کێوی (جودی). معلومە چیای (جودی) لە ناو کوردانە! حتا ئە لێن: (بقایای لوح و بزماری سفینە، لەسەر کێو کە، ماوە!). ﴿وقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ هلاک و دووری لە ڕەحمەتی خوا، بۆوانبێ! آمین. خوایە لەو زەمانەش بەهلاکیان بەی، لە خباستیان ارض پاککەیەوە! لەو آیتە علمای (بلاغة) لە (سکاکي)، تا (علاٴلديني موصلي) استاذي (سيد محمودي آلوسي) نکاتێ عدیدیان بیان کردوە. ئەو آیتە لە منتهي منتهیی حد الأعجازە!، علي الأعلایە! حەزئەکەی شتێکی لێبزانی، مراجعەی (روح المعاني) و تفسیری (سيد رشيد) بکە! فيالحقيقة لە تفصیلاتی مفید مفید قصوریان نەکردوە! ئایا ئەم طوفانە عام بووە؟ هەمو ارضی داگرتوە؟ وە هەمو کافری سەر عەرد، حتا غیری قومی (نوح)یشی بردووە؟ ئەگەر بووبێ! خلافی تیایە!! هەرچی بووە، هەر چۆنێ بووە، طوفانێ بووە، قومی (نوح) و وولاتی قومی (نوح)ی داگرتووە! (نوح) و مؤمنەکان بەسفینە نجاتیان بووە! باقیتریش غرق بووین! وە دوو فائدەی تیایە بۆ ئێمە، خۆ لە موجبی غضبی خوا

پاراستن تمسک بەاسباب ولو زۆر مستبعدبێ وە صنعی سفینە بۆ اخلافی (نوح) فائدەیٚ گەورەیدا، آخری کار و ئەنجامی، پاپۆڕ و غوا صات دروستکرا! من ئەو بلاغتەم لا خۆشترە لە بلاغتی عیبارەتی! وردە وردە صنعت تەرەقی بکات لە (قەیاغ) هەتا ئەگاتە (پاپۆڕ) لە ئەو پەڕی خۆشی و بلاغەت و تەرەقیە!! ﴿وَنَادَى نُوحٌ رَّبَّهُ﴾ پاش نیشتنەوەی ئاو، بەزاری هاواری کردە خزمت (باري) ﴿فَقَالَ رَبِّ﴾ ئەی خوای من! ﴿إِنَّ ابُنِي مِنْ أَهْلِي﴾ جگەر گۆشەمە. ﴿وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ﴾ خلف محالە. وە تۆ وعدەتدا، خۆت و اهلت نجات ئەدەم. ﴿وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ﴾ حکمت لە حکمی هەمو حاکمان متین و محکم و بەقووەتترە، هەڵناوەشێ، تبدیل ناکرێ، تحریف نادرێ. ﴿قَالَ﴾ (ربه). ﴿يَا نُوحُ إِنَّهُ﴾ ئەوە ﴿لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ﴾ لە اهلی تۆنیە! ﴿إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ﴾ انە بویتە عینی عملی نالایەق و ناڕێک و ناخونجایی، نسبەتی لەگەڵ تۆ نەماوە!

رەحمەتی لێبێ امامی (شافعي)، ولد الزنا ناکاتە ولدی صاحبی نطفە، چونکی لە عملێ غیرە صالح پەیا بووە. اما ناتوانێ قطعی بکا لە دایکی، زێرا فطرەت زۆر بەقووەتە! حکمی شرعی مقابلەی حکمی فطری پێناکرێ! بعضێ نەیا نتوانیوە (ابن نوح) بکەنە عینی عمل، ضمیری (انە)یان بردوتەوە بۆ سوار نەبوونی، یا بۆ ندای باوکی. حقیقةً ئەمەش لە عملێ غیرە صالح حسابە! (کسائي) و (یعقوب) (عمل) بەصیغەی فعلي ماضیان خوێندوتەوە ئەڵێن: «ئەمە قراءتي حضرەتی (علي) و حضرەتی (عائشە) و (ابن عباس) و (انس)ە!» یعنی کاری ناپەسندی کردووە! ئەڵێن شخصێ وای ئەخوێنێتەوە، (حجاج) گوێی لێ ئەبێ ئە لێ: ئەو قراءتت لە کێ بیستووە؟ ئە لێ: لە فلان مەلای، لە وولاتێ دوور! (حجاج) ئە لێ: بچن ئەوزاتە بێنن!! مەلای بێچارە دێنن، بێپرس ئەیهاوێنە حەپسخانە. چەند مانگ حەپس ئەبێ، دوایێ (حجاج) دێتەوە یادی ئەڵێ: فلانتان هێنا؟

ئەڵێن: بەڵێ لە مێژە! چیتان لێکرد؟ ئەڵێن: حەپسە! بۆچی؟ چۆن ئەبێ؟ مەلای دێنن ئەڵێ: بۆمنتان هێناوە؟ ئەڵێ بۆ مسالەێ هکذای! ئەڵێ: خوا کوڕی (نوح) بگرێ، ئەو ئیشی غیره صالح ئەکا، من لە سەری حەپس ئەبم!، دوایی تثبیتی قراءت معززاً رەوانی ولاتی خۆی ئەکاتەوە!!

دیارە عملی خراپە، زەرەری هەیە بۆ غیریش، حتا بعد أعصار ودهور!! ﴿فَلاَ تَسْأَلْنِ﴾ لێم مەخوازە! ﴿مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ بەیقین، بێتردد و احتمال و شک و شبهە. ﴿إِنِّي أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾ وعظ لە قضا ئەخوازێ نهی لە شتی خراپ! زاتاً جهلیش، سەروچاوەیە! فسق و فجور و کفر، نسبەت لەگەڵ اهلی ایمان و صلاح و تقوی، نایڵێ! نسبەتی نسبە، بۆ پێغەمبەرێ، لە قضا ئەخوازێ، لە علاقەی ایمان و صلاح و تقوی، تحکیم بکرێ! نسبەت بۆ رسول بۆێ نی یە هەرچی بیکەی لێت قبوڵ بکرێ! ئەوە لە پێغەمبەرەکە، قبوڵ ناکرێ!! گۆییا ئەمە لە شرافەتی پێغەمبەری خۆمانە، ئەوەی بەاولاد و احفادی وی حساب بکرێ، هەرچی بیکا بیکا؟ حاشا! شرافە تی رسول الله، بەاطاعەی خوایە! رابطە لەگەڵ پێغەمبەردا، دیارە! بە لام محبەکانی منافق غدریان کرد لە دین لە آلی رسول، تاکو هەر چەند فاجر و سواڵکەری دونیا هەیە، بوون بەآلی رسول! (شێخ علي افندي) رۆژێ زۆر مدحی آلی نبوی کرد: (گە ورەی ئێمەن درة التاجێ افتخارمانن!)، ڕووی لە من کرد فەرموی وانییە؟! ووتم: (چت عرضکەم؟!)، فەرمی: (چۆن؟). ووتم: (قوربان ئێستا سیدێ لە نقبای بغدا یا گەورەێ لە احفادی «کاکە احمد» بێن استقبالیان ئەکەین و دەستیان ماچ ئەکەین. اما سیدێ فقیر بۆ سؤاڵبێ، بەناعلاجی رائەوەستێ بەکمالی ذلت، مرحباشی لێناکەین. مع انە ئەویش وەکی وان، سیدە! ذرة التاج افتخارە! لاحوایە ئەم قسانە، غدرن لە اهل و بیت! بەو قسانە هەڵخەڵەتان! نهایت لە سیادەتی دارین محروم بوون! من دۆستیانم! بەلام حق و

حقیقەتیان پێ ئە ڵێم، ولو بەدۆستم نەزانن! رەحمەت لە شێخی «ابن حجر» بێگەلێ لە منتسبنی آل و بیت، فاسق و بێدین و بێماڵی دونیا و رەزیل و سفیل بوون، بە (صواعق)ی وی، سوتان!!) بەسیە! جەنابی حەق لەسە ر سؤالێ هكذای بەحضرەتی (نوح) ئاوا مكدرانە ئەفەرموێ: (انی أعظك...الخ). برادەران بۆ خاطری خوا خۆتان لە مسائلی جاهلانە، بپارێزن! ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْأَلَكَ﴾ (من بعد). ﴿مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَإِلاَّ تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُن مِّنَ الْخَاسِرِينَ﴾ حقا ئەوە وعظێ عظیمە بۆ مەلایان، بۆ اولیایان، بۆ سادات و مشایخان! بە ڵام غروری جهل گوێی استماع و چاوی اعتباریانی، کەرر و کۆر کردووە!! لە مامۆستا مەلا (احمد)م بیست: («مەولەوی مەلا عبدالرحیمی مەریوانی» دێتە «سلیمانی». شەوێ جمعێ لە سادات لە خدمەتی ئەڵێن: (ئەوەی سید بیکا، معفووە!) مەلا ئەفەرموێ: (ئەمە، هەر بۆ نێرانە؟ یا بۆ نێرومێ، هەر وایە؟) زۆر منفعل ئەبن. دوایێ حضرەتی (کاکە احمد) زۆر خۆیان لێتوورە ئەکا و نە هیان لێئەکا لەو نوعە گوفتوگۆیە!) ﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ﴾ بڕۆوە خوارێ، لە (فلک)، یا لە (جودي)! ﴿بِسَلاَمٍ﴾ سلامێ زۆر عظیم! ﴿مِّنَّا﴾ لە طرف ذاتی (کبریائي)! یعنی سلامەتی لە شەڕی دوشمن و عداوەتی اهلی شرک! ﴿وَبَرَكَاتٍ﴾ لە گوزەران و زۆری رزق. ئێوە لە اماندا ئەبن، محصولاتی أرضی زۆر ئەبێ، کەم بچێنن زۆری ئەکا! ئەو امن و امانە لە طرف باری ﴿عَلَيْكَ﴾ لە سەرخۆت! (ومن معک)ش داخلی (علیک)یە! ﴿وَعَلَى أُمَمٍ﴾ ئەم امت و شعوب و قبائلە ﴿مِّمَّن مَّعَكَ﴾ لە ذورریەتی ئەوانەی کە لەگەڵ تۆن! ئەوانەی مؤمن و عامل بەعملی صالحن! یاخود کە سلامی خوای لەسەر ذورریە تیانبێ، لە سەروان بەطریق الأولایە! (بعضێ وجوهی تریان فەرمووە، «من» کە یفم لەگە ڵ نایێ!!) ئەمە ضمناً تیایەتی بشارەت بەبقای نسل و زۆری و دەوامی لطفی خوای، لە سەروان! یروانە لەبەر خاطری وان ئە

فەرموێ: ﴿وَأُمَمٌ﴾ نافەرموێ لە اولادی وان! مع انه لەوانیشن! ﴿سَنُمَتِّعُهُمْ﴾ بەمتاعی دونیا، لێی مستفید ئەبن. ﴿ثُمَّ﴾ بلآخرة، لە آخرەت ﴿يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ موقت، دائم! ﴿تِلْكَ﴾ قصه و باسی (نوح) و ماجرای! ﴿مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ﴾ ماضی، غیبە! سیما بۆ قەومێ بێ تاریخ! ﴿نُوحِيهَا إِلَيْكَ﴾ ئەگەر صرف لە وحی نەبا، ئەڵبەتە بعضه خرافاتی تیا ئەبوو! (وک توراتە محرفەکە) کە ئەڵێ: (خوا لە خلقي اسنان پەشیمان بۆوە، لە کردەوە یان محزون بوو) نازانم چی؟! والله انسان تعجب لە بێحیاي ئەو قومە ئەکا، ئەورۆ ئەم نوعە کتێبە، ترجمە ئەکەن، بەناوی «کتابي مقدس»، بەناو امەدا بڵاوی ئەکەنەوە، ئەگەر وجدانیان هەبا، زۆر متاثر و متالم ئەبوون! ﴿مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا﴾ خاصةً بەو تەرزە صحیحیە! ﴿أَنتَ وَلاَ قَوْمُكَ﴾ زاتاً اهلی (مکە) مخابرەیان نەبوو لەگەڵ (بني اسرائيلي) وەک اهلی (مدینە)! ﴿مِن قَبْلِ هَـذَا﴾ پێش نزولی وحی و رسالەتی توو! ﴿فَاصْبِرْ﴾ نتیجەی قصه بۆ حضرەتی رسالەت، امرە بەصبر و موژدەدانە بەعاقبەتی خێرێ وەک (نوح) و (من آمن به)! ﴿إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ تقوا بەبێ صبر، نابێ! خوایە! بۆ ئێمەش دەورێ بنوێنی! عاقبەتی، خێر عن قریب بۆ ئێمە ببێ! دوشمنانان دفعکەی! آمین!!

﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا﴾ لەوان بوو، خزم بوون! ﴿قَالَ﴾ هود، بەخوێشی خۆی! ﴿يَا قَوْمِ﴾ خوایە! ندای جگەر سۆزانەیان، چۆن ادا فەرمووە؟ لە دڵێ بە ڕەحم، دەربارەی قومیان، هاتوتە سەر زبانیان؟! ﴿اعْبُدُواْ اللّهَ﴾ وحده، بێشریکە! ﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ﴾ کەس! ﴿غَيْرُهُ﴾ هەر ئەوە، الاهی ئێوە و انام! ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلاَّ مُفْتَرُونَ﴾ دووچاری کذب و افترا، کراون! بەفسادیان بردووون! ئێوەیان بەدرۆ و دەلەسە کردۆتە بوت پەرست و مشرک! یا افترا ئەکەن بەخوا___ العیاذ بالله___ ئەڵێن: (شەریکي هەیە) غیری نجاتیان چیدي نیە ﴿يَا قَوْمِ﴾ مەترسن! دەغدەغە بەدڵ مەدەن! ﴿لا أَسْأَلُكُمْ﴾

سؤالتان لێناکەم! ﴿علیه﴾ لەسەر تبلیغ و ارشاد. ﴿أجرا﴾ کرێ! پاداشتێ! ﴿إنْ أجْري إلاّ على الذي﴾ ئەو خودایەی ﴿فطرني﴾ ایجادی کردومە، هەر ئەویش منی ناردووە، فطرةً لە ئێوەی ممتاز کردومە، پاکی فطریم تێک نەچووە! ﴿أفلا تعْقلون﴾ تێناگەن چتان پێئەڵێم؟ بۆ چیتان دەعوەت ئەکەم؟ ﴿ویا قوْم استغْفروا ربّكمْ﴾ لە شرک و سیئاتی رابردوو. ﴿ثمّ﴾ (بعد الأستغفار) ﴿توبوا إلیه﴾ رجوع بکەن! بگەرێنەوە! رووەکەنە خراپە! توجە بکەنە جەنابی حەق! ﴿یرسل السّماء﴾ لە میعاد! ﴿علیْكم مدْرارًا﴾ بارانتان بەسەردا دە رێژێنێ لە دوای یەک، بەگوێرەی پێویستی، بەنفع بێزەرەر! خوا خێرانکا ئەمساڵ ئەوا سەری (تشرینی اولی) رۆمیە، هەور و هەرایە، بارانە، بایە، بروسکەیە، گرمە گرمی سمایە، تەزرەیە، نەبەزەریفی پەڵەکە ئەدا، خۆشی ئەکا! زیانی زۆری بەبرنج و توتن و غیرە گەیاندوە! (ربنا ارسل السماء علینا مدراراً)! ﴿ویزدْكمْ قوّةً إلى قوّتكمْ﴾ ماڵتان، اولادتان، زۆرتر ئەکا! کە خێر و بەرەکەت زۆربوو، هەوا موافق بوو، نسلیش، زێدە ئەکا! ﴿ولا تتولّوا﴾ اعراض مەنێن! روو گەردانی مەکەن! ﴿مجْرمین﴾ مصرین لەسەر گوناهان. ﴿قالوا﴾ لە رووی عنادەوە. ﴿یا هود ما جئْتنا ببیّنةٍ﴾ دەلیلێ، حجەتێ واضح بەواضحی دەلالەت بکات لەسەر راستیت، نەهێناوە! في الحقیقة بیانی معجزەی نەکراوە، بەڵام رسول بێمعجزە نەبوە و نابێ! ﴿وما نحْنُ بتاركي آلهتنا عنْ قوْلك﴾ ولو هەزار آیة بێنی! متکبرینی قەوم، ایمان بەخزمی خۆیان نائێنن! تەماشای رەوشتی اقوامکەن! (حاجی قادر) ئەڵێ:

بۆ امیراني غیرە دەبنە گزیر نەک لە خۆیان یەکێک ببێتە امیر

﴿وما نحْنُ لك بمؤْمنین﴾ کورت و کرمانجی بەصریحی، بروات پێناکەین! ممکن بوو کەسێ لە لارا هاتبا بەدرۆ، لە رقی (هود) هەمو ایمانیان پێهێنابا! ﴿إن نقولُ إلاّ اعْتراك بعْضُ آلهتنا بسوءٍ﴾ هەر ئەوە ئەڵێین: (تۆی

داگرتوه، بعضێ لە بوتەکانی ئێمە بەخراپە، جنت، معرفەتت تێکچووە! لە حەق ئەوانە قسەی خراپ ئەکەی! ئەوانیش تۆیان دووچاری شێتی کردوە! (سبحان الله) ئەو فکریە ماوە بۆ (پاپ)یان، هات بۆ شێخەکانی ئێمەش! کە سێ عبودیەتیان نەکا، گەر بەلایەکی هاتەسەرێ، ئەڵێن ( ئەمە هەمەتی حضرەتی شێخە!)، ئەگەر ئەوان بەلایان بێتە سەرێ وەک (هەیکە لانی پیر) ئەڵێن: ئەوە تقدیری خۆمانە! جهلا لە هەرە شەو گورەشەیان ئەترسێن، ایمانیان پێدێنن! ﴿قَالَ﴾ (هود) فەرموی: بەندەش یا ربی وائهلێم! ﴿إِنِّي أُشْهِدُ اللّهِ﴾ ئەمن خوای بەشاهد ئەگرم. ﴿وَاشْهَدُواْ﴾ ئاگاداربن! ﴿أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ مِن دُونِهِ﴾ هەرچیبێ، بەهەر ناوێبێ! زاتاً کەس لە طرف خوا حەقی شرکی نەدراوەتێ! کەس شانێ لە شئونی خوای نادرێتێ! ﴿فَكِيدُونِي جَمِيعًا﴾ خۆتان و خوایەکانتان بێ منتبن،، چیی ئەکەن بیکەن، بەهەر فروفێلێبێ! ﴿ثُمَّ لاَ تُنظِرُونِ﴾ مهلەتم مەدەن! ﴿إِنِّي تَوَكَّلْتُ﴾ بۆ حفظم لە هەمو ئافات! ﴿عَلَى اللّهِ﴾ جل جلاله. ﴿رَبِّي وَرَبِّكُم﴾ في الحقيقة ﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا﴾ ولو انسانێ وەحشی، وەکی ئێوەبێ! ناو چەوانی بەدەست خوایە! یعنی ذەلیلە لەبەر دەستی قدرەتي خوا! فضل لە جمادات، ئەوان هیچ نین! ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ راستە! راستی ئەوێ! راستانی، خۆشی ئەوێن، ئاگاداریان ئەکا، رێی راستیان نیشانئەدا! ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ رووتان لەو رێیە راستە نەکرد، کە خوا نیشانتان ئەدا، من چم لەسەر نی یە، خطای منی تیا نی یە! ﴿فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم﴾ پێم گەیاندن! ﴿مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ﴾ لە طرف خوای! ﴿وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ ئێوە ئەفەوتێنێ، قومێکی دی لە جێی ئێوە، دائەنێ! ﴿وَلاَ تَضُرُّونَهُ شَيْئًا﴾ بەکفر و عناد، یا بەنەمانی ئێوە، چ نقصان بەملکی خوا ناگات! ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ﴾ ئاگادارە، احاطەی بەهەموشت داوە، هیچی لێبزر نابێ! ﴿وَلَمَّا

جَاء أَمْرُنَا﴾ عذاب! ﴿نَجَّيْنَا هُودًا﴾ ع.س! ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ﴾ هەر چەندێ بووبن! وەکی مؤمنی (نوح)ی، نافەرموێ کەم بووین! ﴿بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾ رەحمەتێ گەورە لە طرف ئێمە. (سیدی آلوسي) ئەفەرموێ: تفسیری (رحمة) بەایمان لە (ابن عباس) و (حسن) روایەت کراوە، وە (زمحشري)ش ذکری کردووە. بعضێ بۆنی (معتزله)تیان لەو قسە کردوە، بۆیە ڕوویان تێنەکردوە. ئایا کەسێ بڵێ خوای تعالان (هود) و مؤمنانی نجاتدا لە عذاب، بەسبب ایمان، چ قەیدی هەیەئەدی خوا کافرەکانی لەبەرچی گرتونە، هلاکی کردوونە؟ ﴿وَنَجَّيْنَاهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ خەست، توند. ﴿وَتِلْكَ عَادٌ جَحَدُواْ بِآيَاتِ رَبِّهِمْ﴾ بە (هود)یان ئەگوت: (ما جئتنا ببينةٍ)! ﴿وَعَصَوْاْ رُسُلَهُ﴾ هەموویان! انه ئەوانە اصلی رسالت، انکار ئەکەن، ئە لێن: (بشر حاجەتی بە ارسالی رسل نی‌یە!) ﴿وَاتَّبَعُواْ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ رواسایەکانیان! في الحقيقة سوادی أعظم لە امم، دین و ئاینیان نیە، تابعی رواسان! ﴿وَأُتْبِعُواْ فِي هَذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً﴾ پاداشێ چەندجوانە! ئەوان تابعی طاغی و باغی‌یان بوون، وە لعنەتیان دواخرا، لە دونیا! ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لە هەردوو سەرا، محروم بوون، لە رەحمەتی خوا! ﴿أَلا﴾ ئاگاداربن ئەی قومی رسالت پەناە! ﴿إِنَّ عَادًا كَفَرُواْ رَبَّهُمْ﴾ بەسایەی رواسایان، ئێوە، وامەبن! بەبێ‌هوودە انکاری وحدانیەتی خوای خۆیان کرد ﴿أَلاَ بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ﴾ دووربێ لە قومی حضرەتی محمد (ﷺ)! ﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا﴾ ئەویش، لە وان بوو! ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ﴾ وە (هود) و سائری رسل فەرمویانە و ئەفەرمون: (اول و آخری دەعوەتی ئێمە، (الي التوحيد)ە)! ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ﴾ بەاعتباری اصلی خلقت. ﴿وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾ ئێوەی‌گێڕا، بەئاوەدان کەری عەردی، لە عەردی! یاطلبی لێ‌کردونە، بەطلبێ تکوینی! یا ئێوەی تیا ژیاندووون! ﴿فَاسْتَغْفِرُوهُ﴾ لە

گوناهان، ئیتر بەسیه! ﴿ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ﴾ هەر وەک طبعاً رجوعتان، بۆلای ئەوه! ﴿ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ﴾ نێزیکه، ئاگاداره! حقیقەتی نێزیکی، بەئاگاداریه! دوو کەس له جنبی یەکبن، ئاگایان له احوالی یەک نەبێ، زۆر لێک دوورن! وه توبتان قبول ئەکا! ﴿ قَالُواْ﴾ له جوابدا. ﴿ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَذَا﴾ پێش ئەو دەعوەته، له ناو ئێمه، تۆ جێی اومید و امل بووی، تقویەی (ما علیه آباؤنا)بکەی! زاتێ تەواو بووي، له هەمو جهت! کەچی، عکسی امل دەرچووی! ﴿ أَتَنْهَانَا﴾ ئەمه زۆر دوور بوو، له تۆ! ﴿ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا﴾ یەکو! ئەوه، نەدەبا له تۆ صادربێ! ﴿ وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ﴾ ترکی عبادەتی آلهەی آبای خۆمان بکه ین! ﴿ مُرِيبٍ﴾ لامان وایه، بەدڵت نی یه! لایەق وابوو تۆ زێده تشویق و ترغیبمانێ بکەی، لەسەر عبادەتی آلهه! خلاصه دڵمان له قلق و اضطراب دایه، بڕوا ناکەین ئەو دەعوەتت بەڕاستی و بەدڵ بێ! داخۆ چیتئەوێ؟! ﴿ قَالَ﴾ صالح! ﴿ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ﴾ خەبەرم دەنێ! ﴿ إِن كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي﴾ تنبەم بۆي بووه! ﴿ وَآتَانِي﴾ پێیی کرم کردوومه بۆم هاتوه! ﴿ مِنْهُ﴾ له طرف ربی خۆم. ﴿ رَحْمَةً﴾ نبوەت و رسالەت، بێشک و اشتباه و بێتردد. انه بالضرورة ئەزانم، یقینم ﷲ یه، خوای تعالی ئەمنی ناردوته سەر ئێوه! بۆ دەعوەتی (الی الله الواحد)! ﴿ فَمَن يَنصُرُنِي﴾ له ئێوه و غیری ئێوه! ﴿ مِنَ اللّهِ﴾ نجاتم ئەدا له عقابی خوای. ﴿ إِنْ عَصَيْتُهُ﴾ بەترک دەعوەت بۆ خاطری حفظی مکان و مکانتی خۆم، له ناو ئێوه! ﴿ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيْرَ تَخْسِيرٍ﴾ گەورەیی من لای ئێوه بەو حاڵه، زەره ره بۆ من، لای خوا! اطاعەی من بۆ ئێوه له شرک دا موجبی زێده خسرانه، خوایێ که منی ناردوه بۆ نهی له شرک یاخود اطاعەی له پاش عصیانی خوا، موقعی خۆم ناگرمەوه! ﴿ وَيَا قَوْمِ هَذِهِ نَاقَةُ اللّهِ﴾ ئەگەر فطرةً فەرقی لەگەڵ افرادی جنسی خۆی، نەبا، ﴿ لَكُمْ آيَةً﴾

نەدەبووە اعجوبەێ بەو نوعە کەپێی بڵێن: (ناقەی خوا وایة)، بۆ قوم و معجزەێ دەلالەت بکا لەسەر صدقی حضرەتی «صالح»! ﴿فَذَرُوهَا﴾ لێیگەڕێن! دەخلی مەکەن! ﴿تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ﴾ لە پوشوپاوانی خوای ئەلەوەڕێ، چ کلفەتی لەسەر ئێوە نی یە! ﴿وَلاَ تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ﴾ تخونی مەکەون! دەستی مەدەنێ! بەادنی عذابی، خراپەیێکی پێ مەگەیێنن! ﴿فَيَأْخُذَكُمْ﴾ (علی تقدیر المخالفة). ﴿عَذَابٌ قَرِيبٌ﴾ دوای (مس)، پێتان ئەگات! ﴿فَعَقَرُوهَا﴾ چ جاێ (مس بادنی السوء)، بریندارییان کرد بەبرینێ کە پێی بچێ عضوێ وایانبڕی کە تاثیر لە حیاتی بکات، یا پەلەیان کرد سەریان بڕی! ﴿فَقَالَ﴾ (صالح) (علیه السلام). ﴿تَمَتَّعُوا﴾ گوزەرانکەن! تعیش بکەن! ﴿فِي دَارِكُمْ﴾ بلدی خۆتان! جێی خۆتان! ﴿ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ﴾ سێ شەو و رۆژ خۆتان بگرن! پاش ئەوسێ رۆژە بلا تاخیر عذابتان دێتە سەر! ﴿ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾ درۆی تیا نییە. ﴿فَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا﴾ امرماندا، هاتە سەریان! ﴿نَجَّيْنَا صَالِحًا وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ﴾ لە عذاب. ﴿بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾ ظاهریی چ سببی نجاتیان نە بوو، غیری رەحمەتی الاهي نەبێ! ﴿وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍ﴾ لە بعضێ ذکری و رەزالەتی ئەو رۆژە، سعادەت مەندی داریـن بوون! ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ یا محمد (ﷺ)! ﴿هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ﴾ اما الاهي وان، ذەرەێ قووەتیان نییە، ناتوانن هیچ بکەن، حتا نجاتی عبدە ی خۆیان لە چەنگ نایێ! یا قومی رسالەت پەناه، بترسن! ﴿وَأَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئەوانەی اصراریان لەسەر کفر کردووە. ﴿الصَّيْحَةُ﴾ دەنگی گەورە بەشدەت هائل وەک دەنگی تەقەی نەڕەی بۆمبای طیارە! کە بۆ مبایانی فڕێ ئەدا وە بەجێگای رەق ئەکەوتن، حقیقةً نێزیک بوو انسان روح بدا! لە هەژمەتان گەلێ شێخ لەوانەی کە امة بەتەمابوون لە تەقوهۆڕی رۆژی قیامت نجاتیان بدا، هەڵ ئەهاتن ئەچوونە کونان خۆیان ئەشاردەوە! وە گەلێ جار لە هەور شەقەێ

وادێت لە رزەی پێ ئەخات زۆر مدهشە! ﴿فَأَصْبَحُواْ﴾ پاش (صیحة). ﴿فِي دِيَارِهِمْ﴾ منازلیان. ﴿جَاثِمِينَ﴾ بەارضەوە نووسابوون، وەک مریشکە کورک، بێحرکە! ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَا﴾ تیای نەبوو بوون. ﴿أَلاَ إِنَّ ثَمُودَ كَفَرُواْ رَبَّهُمْ﴾ خوای خۆیان وونکردبوو. ﴿أَلاَ بُعْدًا لِّثَمُودَ﴾ وەک (عاد) و سائری اهلی عناد. ﴿وَلَقَدْ جَاءتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى﴾ شێوەی عبارەتی گۆڕی. لە کتابی الاهی ذکر نەکراوە حضرەتی (ابراهیم) بۆ سەر چ قومێ ناردراوە، وە چۆنی تبلیغ فەرمووە، وە قومەکەی چیان لێ بەسەر هاتووە! جەنابی حەق چەند ملائکەتێکی ناردووە. چەندن؟ کێن؟ چ لزومی نی یە! ناردنێ بەبشارەت و موژدە بەوجودی ولدی نێر لە هەرەمی محترمی کە مشهورە بە (سار)ە وە بەسەلامەتی لوط. ﴿قَالُواْ سَلاَمًا﴾ سلامیان کرد ﴿قَالَ﴾ ابراهیم ﴿سَلاَمٌ﴾ جوابی سلامی بەتەواوی دانەوە. ﴿فَمَا لَبِثَ﴾ رانەوەستا خۆی نەگرت. ﴿أَن جَاء بِعِجْلٍ﴾ گۆلکێ ﴿حَنِيذٍ﴾ پوختە و خاوێن. گۆلکێ قەڵەو، چەورایی لێئەتکایەوە، لەبەر دەمی دانان (بسم الله) فەرموون!! ﴿فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ﴾ دەستیان ﴿لاَ تَصِلُ إِلَيْهِ﴾ ناگاتە طعامەکە، یعنی دەستیان بۆی درێژ نەکرد! ﴿نَكِرَهُمْ﴾ نفرەتی لێکردن، پێی ناخۆش بوو! ﴿وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾ درکی ترسیکرد لە طرف وان! هەر وەکو ئەمە عادەتە ئێستاش ئەگەر میوان چووە جێگایێک نانی نەخوارد، قصدی سۆی لە حەق صاحب ماڵ هەیە!! ﴿قَالُواْ لاَ تَخَفْ﴾ مەترسە! بۆ تو بەبشارەت هاتووین! ﴿إِنَّا أُرْسِلْنَا﴾ بەشرو سوء ﴿إِلَى قَوْمِ لُوطٍ﴾ لە کتابێ مقدسی عهدی قدیم و جدیدی (عیسویان) و (مسیحیونان) ئە لێ: (ابراهیم لەبەر دەرکەی خیوەتی خۆی بوو، تەماشای کرد سێ پیاوی بۆ ئاشکرا بوون. یەکێ لەوان حضرەتی «کبریائي» بوو، بعد الأستقبال و السجده، عرضی کردن: بەڕێدا تێنەپە ڕن لاقی خۆتان بشۆن! لە ژێر ئەو دارە پاڵ دەنەوە نان بخۆن!

ئه‌وجا تێ‌په‌ڕن! ئه‌وانیش ووتیان وا ئه‌که‌ین!) بنا له کتابی مقدس صراحةً خوا و ملائکه‌ته‌کانی خواردیان!!

ئه‌وجاوه‌ره ایمانت به‌و خرافاته هه‌بێ!! وای وای له‌و حیایه!! ئه‌مڕۆ ئه‌و کۆنه افسانانه خرافاتانه، به‌السنه‌ی مختلفه حتا به‌کوردی ترجمه‌ی ئه‌که‌ن، وه به‌ناوی (کتابی مقدس) بڵاوی ئه‌که‌نه‌وه!!! ﴿وَامْرَأَتُهُ﴾ حه‌ره‌می (ابراهیم). ﴿قَآئِمَةٌ﴾ راوه‌ستابوو. ﴿فَضَحِكَتْ﴾ پێکه‌نی، که یفی پێ‌هات، که ئه‌و قومه خبیثه له کۆڵ ئه‌بنه‌وه. بناءً علیه ﴿فَبَشَّرْنَاهَا﴾ به‌واسطه‌ی رسل! ﴿بِإِسْحَقَ وَمِن وَرَاء إِسْحَقَ﴾ دوای ئه‌و ﴿يَعْقُوبَ﴾ کوڕه‌زای. ﴿قَالَتْ يَا وَيْلَتَى﴾ ئه‌یڕۆ! قه‌د که‌سێ! ﴿أَأَلِدُ﴾ وه‌لدم ئه‌بێ؟ ئه‌زێم؟ ﴿وَأَنَاْ عَجُوزٌ﴾ پیرێژنم! ﴿وَهَـذَا﴾ ئه‌وه‌ی ئه‌یبینن ﴿بَعْلِي﴾ مێردمه! ﴿شَيْخًا﴾ پیره مێرده! ﴿إِنَّ هَـذَا﴾ منداڵ بوون بۆ ئێمه له‌و حاڵه ﴿لَشَيْءٌ عَجِيبٌ﴾ فیی الحقیقة، دووره له عاده‌ت! بنا له (توراة): (سار) له ده‌رکه‌ی خێمه‌وه ئه‌و بشاره‌ته‌ی بیست، له ده‌روونه‌وه پێ‌که‌نی ووتی: «ئه‌مه، چۆن ئه‌بێ؟». خوا سؤالی له ابراهیم کرد «سار»ه بۆ پێکه‌نی و ئه‌و قسه‌ی کرد؟ ووتی: «پێ‌نه‌کنیم!» خوا ووتی: «به لێ پێکه‌نی!» به‌ڵێ ئه‌وها ئه‌بێ! طبیعی که خوا گوشتی گولکی بخوا، ئه‌ڵبه‌ته زۆر هیبه‌تی نامێنێ!! ﴿قَالُواْ﴾ رسل! له (توراة) ئه لێ: خوا ووتی: (ئایا محاڵه له‌سه‌ر خوا اعاده‌ی جحێریتان بکاته‌وه؟) حاصلی (ملیون) علی الأكثر، له حه‌ق خوا، بێ‌شه‌رم و مبالاتن!! ﴿أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ﴾ ئه‌و، واضعی قاعده‌یه! ئه‌توانێ خلافی قاعده بکا! اما غیری ئه‌و، پێی ناکرێ سنتی خوا تێکدا! بناءً علیه جێی عاجباتی نیی یه! مع انه اولاد بوون له‌و حاڵه بۆ مذکر دوورنیه له عاده‌ت! اما بۆ ژنان دووره! ئه‌وان زووتر له تۆو ئه‌که‌ون! به‌ره‌حمه‌تبێ (حماغا) ئه‌یفه‌رموو: (تا انسان بولی که‌ف بکا، له تۆو ناکه‌وێ، ولدی لێ‌ئه‌بێ!). ﴿رَحْمَتُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ﴾ له‌سه‌ر ئێوه‌بێ! له‌سه‌ر ئێوه‌یه! ﴿أَهْلَ الْبَيْتِ﴾ قسه له حرم نیی‌یه،

کە اھلی بیتە! ﴿إِنَّهُ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ﴾ کاری چاکە! زۆر بەخێر و احسانە! بەرەکەتتان ئەخاتە ناو! نسلتان زۆر ئەکا! ﴿فَلَمَّا ذَهَبَ﴾ ڕۆیی. ﴿عَنْ إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ﴾ ترس، ترسی لێ‌تێ‌پەڕیو، نەما! ﴿وَجَاءَتْهُ الْبُشْرَى﴾ بەسلامەتی (لوط). ﴿يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ﴾ دەربارەی وان (یجادلنا)، دائر بەنفسی قومی (لوط)، ئەفەرموێ: (خوایە ھلاکیان مەکە! بەڵکو لە نسڵیان پیاوی باش پەیا ئەبێ!) ظاهراً باسی (کفر)یان نی‌یە! باسی سیئاتی اعمالیان ھەیە! ئەگەر (ابراهیم) کە خوا لە حەقی ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ﴾ بەتالوکە نیی یە! بەکاوە خۆیە! لەسەرە خۆیە! ناشێوێ!! ﴿أَوَّاهٌ﴾ زۆر بە ئۆھو حسرەتە، ھەناسە ھەڵ ئەکێشی بۆ خەڵکی، بزەیی پێدا دێن، حەزئەکا خوا لەگەڵیان زیدە بەحلم و تانی بێ! ﴿مُّنِيبٌ﴾ راجعی الی اللەیە. لەبەر زێدە شفقتی حەز ئەکا مھلت بدرێن، بەڵکو تۆبە ئەکەن، ئەگەرێنەوە، بەو عذابە ناڕۆن، نافەوتێن!! ئەگەر مجادە لەو مراجعە بکا (ابراهیم) لە خزمەت (جەنابی حەق)، دوور نیی یە!! ﴿يَا إِبْرَاهِيمُ﴾ لە طرف خوا، ندای بۆھات. ﴿أَعْرِضْ عَنْ هَذَا﴾ لەو جدالە، بگەڕێ! ﴿إِنَّهُ﴾ شان. ﴿قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ امرێ جازمی لایرد! ﴿وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ﴾ بەھیچ وجە، ناگەڕێتەوە! حتا حاجەت بەشھادەتی (لوط) ناکا، لەسەر خراپەیان! قضاێ مبرمە! زێڕا مانەوەیان بۆ بشر، زۆر زەرەرە! ئەوانە ڕێگری طبیعین، بۆ قافلە آیندەکانی بشر! ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا﴾ رسلی تکوینی قھری! ﴿لُوطًا﴾ لە خزمەت (ابراهیم) بەڕێ کەوتن ھاتنە لای (لوط). کەھاتن و دیتنی ﴿سِيءَ بِهِمْ﴾ بنا لە (تورات) استقبالێ ئاقایانەی کردن، بەخێری ھینان! زۆری الحاح لێ‌کردن تابردینەوە ماڵێ، اما قسەێ بێ‌معنا بێ‌جێ! (انە)پێ یان کەوتە ناخۆشی نارەحەتی دڵتەنگی! ﴿وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا﴾ دەستی پێ‌گرتبوون، خۆی بەبێ دەسەڵات دیت، لە مدافعەی قوم ﴿وَقَالَ هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ ئەوە، ڕۆژێ توندە دژە! ﴿وَجَاءَهُ قَوْمُهُ﴾ خەبەریان بیست کە (لوط) میوانی جوان جوانی

هاتوون. ﴿يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ﴾ بەپەلە پەل و تالۆكە چوون بۆلای. ﴿وَمِن قَبْلُ﴾ پێش ئەوە بەچەندی. ﴿كَانُواْ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ﴾ انواعی اسوای، لێیان‌بوو بوو بەخۆ و عادەت، عەیب و عاریان لانەمابوو! ﴿قَالَ يَا قَوْمِ﴾ لەو وەقتە ناخۆشە، دڵ تەنگیە، لە ترسی بەدنامی و نەنگی، لەگەڵ علمی، كە ئەو قومە مەیلی مێیانی‌یان نیە، چ قەیدیە ئەگەر بفەرموێ ﴿هَـؤُلاء بَنَاتِي﴾ كچانی خۆمن ﴿هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ﴾ طبیعی ئەوی دی، گەند و گووە! ﴿فَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ شەرمێ لەو تاثر و خجاڵەتی من بكەن بۆ حفظی شەرەفی میوان، ناموسی خۆم ئەنوێنم! ئێوەش خۆتان لە خوا بپارێزن! انسانیە تێبنوێنن! ﴿وَلاَ تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي﴾ ئابڕۆم مەبەن! شە رەفم مەشكێنن! ﴿أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ﴾ صلاح و فساد لێك بكاتەوە، كاری چاك بكا! ﴿قَالُواْ﴾ لە جوابدا. ﴿لَقَدْ عَلِمْتَ﴾ بەڕاستی و دروستی زانیوتە، ئەیزانی ﴿مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ﴾ دەخلمان نی‌یە! ﴿وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ﴾ بۆ چ خۆت منفعل ئەكەی؟ ﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً﴾ خۆزیا دەسە ڵاتم بەسەر ئێوەدا شكابا، تار و مارم كردبان! ﴿أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ یا كەسێ هەبا، زاتێ گەورە بەشەرەف و ناموس و قوەت، پەنام بۆ بردبایێ. صلواتی خوای لە پێغەمبەران بێ باوجودی دەعوەتی ئێمەیان كردوە بۆ طرفی واحدیی احد، اما انكاری حقایقیان نەكردوە! نابینی رەسولی كبریائی تمنای كردوە؛ بچێتە ژێر حمایەی بعضێ؟! بە لێ! بەلێ! بەلێ! قووەت و مكنەت أولاً مادی، ثم معنوی!!! وای چەند خۆشە خوا قووەتی مادیت پێكرم بكا، بۆ حفظی قووەتی معنوی!!! وە قابلە خطابی (بكم) لەگەڵ میوانەكانی بێ! ﴿قَالُواْ﴾ رسل. ﴿يَا لُوطُ﴾ سەخلەت مەبە! ئێمە بشر نین! ﴿إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ﴾ ملائكەتین! ﴿لَن يَصِلُواْ إِلَيْكَ﴾ هیچ زەرەر و ئێشت پێناگەێنن! ناگەنە توو، فضل لە ئێمە! خوا ئێمەی ناردووە بۆ تعذیبیان، یا خەبەر دەینەتۆ، كە ئەو قومە بەدار و دیارەوە، بەهیلاك ئەچن! ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ﴾ بەشەو بڕۆ لەگەڵ عائلت!

شەو ڕۆیی بەاهلکە ت بکە ﴿بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ﴾ لە پارچە شەوێ، ئەوەندەی بمێنێ تا ئێوە لە ورودی هلاک ئەچنەدەر! ﴿وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ﴾ کەس لە ئێوە نەگەڕێتەوە! یا ئاوڕی مەرحمەتیان لێنەداتەوە! وە الا بەهیلاک ئەچێ!! ﴿إِلاَّ امْرَأَتَكَ﴾ ئەو بمێنێ! پێی مەڵێ! دێی، یا نایێ، کەیفی خۆیەتی! یاخود ئێوە هەموتان قورتار ئەبن، الا ژنەکەت! ئەمەیان لەگەڵ ایتی (حجر) ملائمترە! ﴿إِنَّهُ﴾ شان. ﴿مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ﴾ پێی ئەگا، ئەوەی بەقومی ئەگات، لە عذاب! طبعاً مصیبەتی وان بەمصیبەتی خۆی ئەزانێ، خۆی تووش ئەکات! لە (تورات) ئەڵێ: (ئاوڕی داوە لە دار و دیاری قوم لە وەقتی هەنگامی فاجعە، بوو بەعمودێ خۆی!) پەک! وەک پەنیری ئەمساڵ ئەبێ چەند سوێر بووبێ؟!! ﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾ بەڵێ نێزیکە! اما لە شدەتی إنتظار، سعاتێ بەساڵێیە! کەوابێ ئێوە پێشی طلوعی فجر، بەپارچە شەوێ، لە شار بڕۆنەدەر! ﴿فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا﴾ میعادی عذاب هات ﴿جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا﴾ ژوور بەرەژێرمان کردن. زاتاً قومێ وابن، سە ر شۆڕ شەرمەزار و چاو بە رەژێر، ئەبن! مەردی ئازایان نامێنێ! غیرەت، هیچ! ئەو ژوور بەرە و ژێری و، ژێر بەرە و ژووریە، بە ؟ وجهێ بووە؟ رای جمهور مشهورە (جبریل) بەدەستی خۆي ارکانی مدائنانیانی هەڵقەندیە، یاخود باڵی هاویشتۆتە ژێریان بڵندی کردوونەتاکو ئاسمانیان گوێیان لە قوقەی کە ڵە باب و وەڕەی صەیان بووە، ئەو شارانە هیچ تێک نەچوون، ئەوجا سەرە و ژێر بەری داونەوە! (سیدي آلوسي) ئەفەرموێ: (عجایب حکمەتێکی گەورە، لەو وەرگێڕانە دایە! کارێ طبیعیان وەرگێرا، وا وەرگەران!). لە شیوەی عبارەتی بەدەرئەکەوێ ئەو قلبە کرابێ بەکنایت لە نزولی امرێ عظیم، بە لاێ هائل (وەک ئەڵێن: دونیاي بەسەردا وەرئە گێڕم) یعنی (سیدي آلوسي) پێی راضی نییە! اما (سید رشید) لە أساساً بەو روایتە راضی نییە، ئەو کیفیەتە بەمحاڵ ئەزانێ، بنا لە خەبەری

طیاره چیان حیوان له ارتفاعی هکذای، ناژێ! حتا ئه‌وان که له معتادیان ارتفاع بکه‌ن، بێ (اوکسجین) ممکنیان نی یه! له‌به‌ر ئه‌وه ئه‌یکاته (خسف)ێ له‌سه‌ر قاعده‌ی طبیعی بحاثانی اندرونی ارض، که خوا ئه‌فه‌رموێ (في الأرض آيات للموقنين)، گه‌رچی مسڵمانان له‌به‌ر بێ ظرفی، به سطحی ته‌ماشامان کرد، به لام ئه‌و بحاثانه گه‌لێ اسراریان بۆ ئێمه ده‌رخستووه ئه‌وا ئه‌فه‌رموون: له ناو ارض الغامی گه‌وره گه‌وره‌ی تیایه، ئاویان له ناو دایه، ورده ورده ئاو اطرافی ئه‌ندروونی مغاره‌کان ئه‌خۆن، جدرانی کهفه‌کان سست ئه‌بن، سقفی مغاره‌کان ئه‌ڕمێن، ئاو ده‌ر ئه‌که‌وێ! ئه‌و شار و دێیانه‌ی له‌سه‌ر ئه‌و کهفانه بن، خسف و منقلب ئه‌بن، موقعه‌کانیان ئه‌بن به‌گوڵ و بحیره و گۆلاو. جه‌نابی (سید رشید) به‌وگوێره‌یه انقلابی ئه‌و شارانه‌ی قومي (لوط)ی تفسیر و قبول فه‌رمووه، وه بارانی ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا﴾ قری. ﴿حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ﴾

﴿مَّنضُودٍ﴾ له‌سه‌نگ وگڵ (با) له (جهنّم) بێ، یا به‌واسطه‌ی (با) له جهه‌تی مستنقعات وأنهار به‌سه‌ری داهێناون، وه‌ئه‌ڵێ: بۆ خاطری بیکا به أمری إلاهی، نه صِرف طبیعی، ئه‌وه ممنوع نیه به تدبیری ملائکه‌تێ مُوَكّلي بالأرض بێ! وَنَقلی ئه‌وانه، له (تورات) ئه‌کا!

((في الحقيقة)) له کتابی (کتابی مقدّسی) مسیحیان ئه‌ڵێ، (خلاصة) عرض ئه‌کرێ: واده‌ر ئه‌که‌وێ خوا ئه‌گه‌ڕێته‌وه، دوو پیاوه‌که‌ی دی ئه‌چن بۆ دیهاتی (لوط)، ڕووله (سَدّوم) ئه‌که‌ن که (لوط) تشریفي له‌وێ ساکن بووه. (لوط) له ده‌رگای (سَدّوم)) دانیشتبوو، که چاوی پێیان که‌وت، إستقبالی کردن وسجده‌ی برده به‌ریان. فه‌رموی: ئه‌ی سیّدانی من میل بکه‌ن بۆ ماڵی عبدی خۆتان! شه‌و لای ئێمه بن! لاقتان بشۆن! سبه‌ی زوو به‌ڕێی خۆتان بڕۆن! ووتیان: نا! له چۆڵی ئه‌بین! زۆر إلحاحی لێ کردن له‌گه‌ڵی چوونه ماڵێ ضیافه‌تی بۆ کردن، خواردیان. پاشان له‌سه‌ر جێی خۆیان درێژبوون. رجالی

(سَدّوم) لە جمیل تا پیر دەورەی ماڵی (لوط)یان گرت. بانگیان کرد: کوا ئەو دوو پیاوەی هاتنە ماڵی توو؟ بۆمان بێنە دەر، تابیان ناسین! . (لوط) بۆلایان چوو دەرکەی کلیل دا لە دیوی ژووریٚ نصیحەتی کردن ها ئەوە دوو کچی من باکرە بۆتان بێنمەدەر بە ئارەزووی خۆتان چی ئەکەن بیکەن! أمّا دەخلی ئەو دوو پیاوە مەکەن! هاتونە ژێر سێبەری ماڵی من. خلاصە چەندی کردی فائدەی نەدا. ڕوویان کردە دەرکە بیشکێنن. دووپیاوەکە دەستیان درێژ کرد (لوط)یان بردەوە ژووریٚ. ئەوانەی لە دەرەوە بوون یعنی (قومی لوط) لە گچکە تا گەورە هەمویان کوێرکردن، نەیانتوانی دەرکەکە ببیننەوە. ئەو دوو پیاوە بە (لوط)یان ووت: ئەوەی هەتە لە زاواو کچ وکوڕ لە شاری، بڕۆنە دەر لەو مکانە! ئێمە خوا ناردوینی ئەو قومە هیلاك بکەین. زاوایانی قسەی (لوط)یان بەگەمە زانی، گویٚ یان نەدانیٚ! کە فجر بوو ملائکەتەکان تالوکەیان ئەکرد ئەیان ووت: لەگەڵ ژنەکەت ودوو کچەکەی کەلاتن خێرا بچنە دەر! بڕۆن بۆ چیا! ووتی ناتوانم! ئەچین بۆ ئەو دیٚ یە گچکەڵەیە! ووتیان: قەیدی ناکا، بۆ خاطری توو، بائەو دیٚ یە مَحفوظ بێ! —بۆیە ناویان لەو شارەنا (صوغَر)— بڕۆن کەستان ئاوڕ نەدەنەوە وە إلاّ بە هیلاك ئەچن! کە ڕۆژ هەڵات (لوط) داخلی (صوغَر) بوو. خوا کبریت وئاگری بەسەر (سدّوم) و (معمورة) دا باراند. ئەو شارانەو أطرافی وسُکّانی مُدُنْ، نبیَتی أرضی، وەرگێڕا! ژنەکەی ئاوڕی داوە، بووە عمودیٚ ملح!

ئەوجا عرض ئەکرێن: ئەگەر ئەو ئاگرە وابێ، وا دەرئەکەویٚ إنفلاقیٚ بڕکانی بووە! ئاگری موادی ناریّە بلّند بووە، مملەکەتەکە ژێر سەرەو ژوور بووە! زێڕا لە ناو أرض وەك عرض کران کهفی عظیم لە ژێر ئەو بلادە بووە، ئەوجا داروبارو وشکانی، کەوتە ژێر، ئاو سەرکەوتووە، کە بحیرەی (لوط)ی تشکیل کردووە، لە إنفلاقی برکانی، بەردو قوڕ و ئەمانەیان بەسەردا باریوە! بەڵام ئەو هەرا هەرایە، لای علمای طبیعەت کە کاشفی ئەو أمورانەن، دەخلی خوای

تیانیه! عبرەت و تنکیل ناخوێننەوە! تعبیری ئەدەن به (غَضَبُ الطبیعة)، طبیعەتیش شعوری نیه، إنتقام وإیقاظ و ئەمانه نازانێ! مەلایانی وەك (سید رشید) و (طنطاوی) ئارەزوویانه إعتبار لەو قسانه بکەن وە بیکەنە عظه و عِبَرْ له طرف حَضْرَەتی کبریائی، أما دوورە یەك ناگرێ! ئەلێن علمای طبیعەت تا قطعی نِسبەتی کائناتی جوی بەیان له جەنابی حەق نەکرد، نەبوونە ئەو کَشّاف و مُخْتَرِعانه! أمّا ئەمن ایاتی إلاهی پێش بَعْثَەتی (خاتم الرسل)، صرفیان قبولْ ئەکەم! دوای زەمانی سعادەت بَعضه شت هەیە، مجبورا إسنادی بۆ خوا ئەدرێ! گەلێکیش أموری طبیعە، أسبابی مَحْلوله! ناپرسن چاك چی یه؟ خراپ کێ یه؟ دەیدەنه بەر، تەڕو وشك وێکڕا ئەسوتێنن.

سەیری (تَوْرات) ئەو فصله به قسەیێ خۆش خاتمه ئەدا: حاصلی (لوط) له (صوغَر) ئەچێتە چیا، کچەکانی له خدمەتی ئەبن تدبیر ئەکەن، شەوی أول کچه گەورەکە، شەوی دوەم کچه گچکەکە خۆیان لەگەڵ باوکیان دروست ئەکەن. خۆیان دروست کرد، ئاوس بوون و زان! کوڕی کچی گەورە ناو (صواب) ئی گچکە (بن عمیّ)، ئەو دوو زاتە نا مُبارەکە بوون به أصلی دوو شعب!!

تنبیه:- (تَوراتْ) لەسەر ئەو هەمو خرافاتی خۆی، باسی عددی قومی (لوط) ناکا! لای مفسرەکانی ئێمه علی الاقل چوار ملیۆن بو بوون. بَعضیْ ئەڵێن: ئەوە، عددی سُکّانی شاری (سَدّوم) بووە. (سید رشید) راضي نییه ئەڵێ: هەمو مملەکەتی (فلسطین) ئەوەندە سکانەی نەبووە! نازانم چاوی به (إرشادی عەقلَی سَلیم) نەکەوتووە، یاخود ئەبێ، تحریفی مطبعه بێ، (أبو السعود) ئەفەرموێ: چوار صەد ملیۆن بووین!

مُفَسِری شَهیر (قاضی) عەسکەری کردوە له زەمانی (یاوز سلطان سلیم) بووە به (شێخ الأسلام)، ئەبایە بزانێ چوار صەد ملیون نفوس چەند جێگەی پێ ئەوێ؟ سِعەتی بلاد هەڵ ئەگرێ یان نا؟!

ئەگەر ئەو جۆرە عذابە بە اسبابي فطْرِيە، مَعْناي (مُسَوَّمَةٍ) لە آيتي ﴿مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنْ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾ چی یە؟ (مَنْضُودْ) لەسەر یەك دانراو، یا قَطار قَطار یەك لە دوای یەك.

(مُسَوَّمَةٍ) علامەت دار، علامەتێ مە پێی بزاندرێ کە ئەو حجارە لە حجاری أرضیە، (إبن جَرير) وا ئەفەرموێ! بەرەك، سپی و سوور، لە (إبن عباس) و (حَسَنْ) نقل کراوە. یاخود ڕەش، سپی، سپی و ڕەش (بازوو)، ئەمە لە (حِبْر) مَنقولە!. حَقًّا ئەو نوعە علامتە لەو مقامە قیمەتی ئەوەندەی نی یە بلّێین: (عِنْدَ رَبِّكَ). لە (رَبیع) نقل کراوە کە ناوی ئەو شخصەی بۆی دانراوە پێی بکەوێ و بیکوژێ، لێی نوسراوە! ئەو فەرمایشە نظر بە (عِنْدَ رَبِّكَ) زۆر جوانە!!. مختاری (سید رشید) ئەمەیە: أوَلاً: علامەتی غیرە معلومە، زاناندنی خاصّە بە علمی خوا! کەوابێ (عِنْدِيَّتْ) (عِنْدِیەتی) عِلْمیە!. ثانیاً: (من حَيْثُ اللغة) مَعْنای موافِق ئەفەرموێ (مُسَلَّط) کراو و مَطْلَقْ اليَدْ) چی ئەیکا دەستی ناگێڕدرێتەوە، والمعنی خوا ئەو حجارەی کردووە بە حاکمی مطلق بۆ هیلاکیان، هیچ شت نییە منعی بکا بیگێڕێتەوە، ئەمەش زۆر چاکە! لەگەڵ طبعی طبیعیونانیش ڕێك ئەکەوێ!. جەنابی حەق بە قهری خۆی ئەوانەی لە حد متجاوزن حیاتی بەشەریان تاڵ کردووە ئافاتی علمن، عن قریب هیلاکیان بکا بەو نوعەی کەخۆی ئەزانێ صلاحی (ضُعَفاي أُمَّةْ) بێ، آمین!!

﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ بۆ أهلی (مدین) برای خۆیان (شعیب)مان نارد. دیارە ئەویش لە خۆیان بووە! ﴿قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ﴾ لا غَيرَهُ!. ئەتوانم سوێند بخۆم "ئەگەر إنسان عبادەتی غیری خوای نەکردبایە، خوا تکلیفی عبادەتی لێ نەدەکرد"!

ئێستاش ئەو نوعە عبادەتەی کە بۆ شێخ و مراقد و هیاکل و گاو و کەر ئەکرێ، خوا بەو جۆرە عبادەت ناکرێ!. أول و أخری کلمەی رُسُلْ ئەمەیە: ئەی قوم عِبادەتی خوا بکەن! ﴿مَا لَكُمْ مِنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ﴾ کەوا بێ غیری ئەو

کەس هیچ شایانی عبادەتی نییە! ﴿وَلاَ تَنقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ﴾ لە شەریعەتی إسلام خیانەت لە کیل و وزن و سائری معاملە، لەگەڵ کافری حربی، کە (مُهْدَرُ الدَّمه واجِبُ القَتله)، دروست نییە! کیل و وزن لە حضرەتی (شعیب) تا ئێستا، إصلاح نەکرا! وە لە هیچ ملتێ بێ نقص و خیانت نی یە!! ﴿إِنِّي أَرَاكُمْ بِخَيْرٍ﴾ دەوڵەمەندن! صاحبی تجارەت و معاملەن! عیبە، نقصە، ئەو دَنائَتە!. لازمە لەگەڵ کڕیاران ئێوە بە مُسامَحەبن!. ﴿وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ﴾ لەسەر ئێوە. ﴿عَذَابَ يَوْمٍ مُحِيطٍ﴾ بێتە سەر ئێوە ڕۆژێ، کە عذابێ لەودادەبێ، دەورەتان ئەگرێ! فەردێ آفەریدەتان قورتار نابێ!. ظاهر لەو مقامە، عذابی دونیایە، عذابێ (إسْتِئْصالي) مەحوکردنەوەیە! ﴿وَيَاقَوْمِ أَوْفُوا﴾ پاش نهی لە نقص، أمریان ئەکاتێ بە تەواوی ﴿الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ﴾ بە حەق و عدل. ئەمەش تحقیقی ئەبێ، بە زیادە لە دوودان!. ﴿وَلاَ تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾ هەرچی بێ! ﴿وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ﴾ (عثي) فَسادە و ﴿مُفْسِدِينَ﴾ حالە! تا هەندێ إصلاحی خارج بێ! ﴿بَقِيَّةُ اللَّهِ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ قازانجێ کە بۆتان ئەمێنێتەوە، ئەو خێرە!. (سبحان الله) چەند جوانە تفسیری (بَقِيَّتُ الله)ی بە (ربح)! ﴿إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ کەوا إیمان دڵی إنسان لە رذائل پاك ئەکاتەوە! بەخوا ئەبێ وابێ! ﴿وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾ دائما ئاگادار بم؟ نەیڵم ئەو نوعە گوناهانە بکەن؟ دەسەڵاتم بەسەرتاندا ناشکێ! وەهەم وظیفەی رسالەت تبلیغەن ئەوا (بِأَبلَغْ وَجه) تبلیغم کردن!. یاخود لە عذابی خوا ﷻ دونیای چ عُقبایی، ئێوەم پێ حفظ ناکرێ! إیمان بێنن، نجاتتان ئەبێ، وإلاّ فلا!! ﴿قَالُوا﴾ لە جوابدا! ﴿يَاشُعَيْبُ﴾ تۆ چی ئەڵێی؟ ﴿أَصَلاَتُكَ﴾ بەقەشمەری ئەڵێن: ئایا نوێژت ﴿تَأْمُرُكَ﴾ تحریکت ئەکا بە نوعە أمرێ تکوینی؟ ﴿أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا﴾ أمرمان کەیتێ بە ترکی عبادەتی ئەوەی آبای ئێمە عبادەتیان ئەکرد، ئێمەش لەسەر أمری تۆ تەرکی کەین؟ لە قراءتی غیری (حمزە) و (کِسائي) (صلواتك) بە جمع خوێندراوەتەوە.

﴿ أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ﴾ بەهەر صورەتیٚ بیٚ، ئیٚمە (نُما) بە مالّی خوٚمان ئەدەین! قازانج ئەکەین! مالّ زیاد ئەکەین! بە ڕیبا! بە نقص! بە سرقت! بەڕیٚ گریٚ! بە خیانەت لە أمانت! توٚ چ حەقت هەیە؟ مەنعمان ئەکەی؟ پف شتیٚ چاك وإصلاحیٚ باش!! بەلّیٚ بەلّیٚ ﴿ إِنَّكَ لأَنْتَ﴾ بەس توٚ بە تأكید وحصر ﴿ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ﴾ متأنّي. لەبەر شدائد وبیٚ قازانجی وفقر، خوٚت ئەگری! هادی ڕیٚ، ئەبیٚ بە صلاحی أولی وأخری! ئەمڕوٚش ئەو نوعە ناصحە، بەو جوٚرە ڕیشە خەندە جواب ئەدرێتەوە! ﴿ قَالَ يَاقَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي﴾ وامەزانن ئەو نصحەم بە خیانەتە! وەنیەتم ئاشکرایە ئەیزانن! ﴿ وَرَزَقَنِي مِنْهُ﴾ بەکسابەتیٚ خاویٚن، بیٚ سوود وسەلەم! ﴿ رِزْقًا حَسَنًا﴾ چاك وپاك. تفسیری ڕزقی حسنم بە حیکمەت و نبّوەت، لازوٚر خوٚش نیە! گەرچی ممکنە توجیهیٚ دقیقی بوٚ بکریٚ! ﴿ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ﴾ مائل بم ﴿ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ﴾ گوٚییا ئیٚوە منع کەم لەم سیّئاتە، وەخوٚم بیکەم؟ إنحصاری خیانەت لەکیل و وزنی خوٚم کەم؟ حاشا! ثمَّ حاشا! مَیْل وقصدی من ئەوەنی یە! ئەوەی نهیتان لیٚ کەم، خوٚشم نایکەم! ﴿ إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ﴾ دینی ودنیوی. ﴿ مَا اسْتَطَعْتُ﴾ ئەوەندەی لە طاقەت وتەوانام دابیٚ. ﴿ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللَّهِ﴾ نیلی مرامم نیە إلاّ بالله! ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ وەك أهلی سولەیمانی ئەلّیٚن: (پەنا بەخوا!). هەرچی ئەیکەن بیکەن! خوا مخذولم ناکا!

﴿ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ مرجعیٚ تر نیە! أوّل وآخرە! مبدأ ومنتهی یە! ﴿ وَيَاقَوْمِ لاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِي﴾ عداوەت وبغضیٚ کە دەبارەی منتان هەیە، ﴿ أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ﴾ عەزابیٚ سماوی، إلاهی، مُهلکن مُبیدْ! ﴿ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَالِحٍ﴾ یعنی لە ڕقی من وەها إصرار لەسەر خراپەی بکەن، زیٚتر بەدبین، أنّە ئەبنە کاسب وجالب بوٚ عذابی خوا! عذابیٚ وەك عذابی ئەو أقوامی ڕابردوو! ﴿ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِنْكُمْ بِبَعِيدٍ﴾ خَبَرْیان ئەزانن! مخالفەی رسولی خوٚیان کرد، ژیٚر بەرەو ژوور بوون، بەردە بارانی غضبی إلاهی کران!

﴿ وَاسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ﴾ خۆتان لە خوا طلب کار بن، إعتماد مەدەنە وسطاو موسطا ! ﴿ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ﴾ ڕوو لە کەسی دی مەکەن! گەڕانەوەتان هەر بۆلای ئەو بێ! ﴿ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ﴾ تفسیری (ودود) بە (مُحِب) (سیِّد رَشید) پێی راضی نیە! نەوەکو حاجەتی بە تأویل ببێن ئەڵێ: (والمَوَدَّةُ في اللُّغة عَطْف الصِّلَة والإكرام بالفِعْل، كَما يُعْلَمُ من إستِعمالِها وَتَساهَلَ أو غَلِطَ مَنْ فَسَّرَها بالمَحَبَّة)!. بەڵام لە قاموس معنای (وَدَّ)ە بە (حَبَّ)ە، (ودود) بە (كثير الحب) لێ ئەداتەوە ! لام وایە ئەوەی (سیِّد) فەرموێ، خۆ کردیە ! ﴿ قَالُوا يَاشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ﴾ تێ ناگەین! ﴿ كَثِيرًا مِمَّا تَقُولُ﴾ نازانین ئەڵێی چی؟ ﴿ وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفًا﴾ بێ هێزی بە قوم وبە بەدەن! ﴿ وَلَوْلاَ رَهْطُكَ﴾ خزمی نێزیکت، ئەوانیش زۆر نین! لە سێ نهایەت تا (دە)! دیارە لەسەر دینیان مانەوە، حورمەتیان ئەگرن! ئەوان نەبن، لەبەر ئەوان نەبێ ﴿ لَرَجَمْنَاكَ﴾ بەردە بارانمان ئەکردی! ﴿ وَمَا أَنْتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ﴾ خۆشەویست، قیمەت دار، نایاب بە قووەت وقدرەت ومتانت ومناعة، نیت لەسەر ئێمە! ﴿ قَالَ يَاقَوْمِ أَرَهْطِي﴾ خوێشی من ﴿ أَعَزُّ عَلَيْكُمْ مِنْ اللَّهِ﴾ محترم ترە لاتان، لە خوا؟ ﴿ وَاتَّخَذْتُمُوهُ وَرَاءَكُمْ ظِهْرِيًّا﴾ یعنی خواتان هاویشتیتە پشتەوە، مبالاتی پێ ناکەن، ڕووی تێ ناکەن. ﴿ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ دەورەی داوە ئاگای لێیە بە تەواوی. ﴿ وَيَاقَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ﴾ لەسەر هەمو قووەت وعزّەت وقدرەت وکان، بۆ بوونتان، چی ئەکەن بیکەن! بێ مِنَّةْ بن! ﴿ إِنِّي عَامِلٌ﴾ لەسەر دینی خۆم یاخود دەوام ئەکەم لەسەر تبلیغ دەستی لێ هەڵناگرم لە ئێوە ناترسم! ﴿ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ﴾ ڕەزیلی ئەکا. ﴿ وَمَنْ هُوَ كَاذِبٌ﴾ ئەوەش ئەزانن! ﴿ وَارْتَقِبُوا إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ﴾ چاوەنۆڕبن! منیش لەگەڵ ئێوە منتظرو مراقبم! ﴿ وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا﴾ كە هات أمرمان بە عذابیان تعلقی بەست ﴿ نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا﴾ صرف بە ڕەحمەتی خوا نجاتیان بوو! ظاهرا چ أسبابی دی دیار نیە ! ﴿ وَأَخَذَتْ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ﴾ نعرەیێ

هائل، مهلك. ﴿فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ لەسەر چۆك، لەپ و ڕوو کەوتبوون. ﴿كَأَنْ لَمْ يَغْنَوْا فِيهَا﴾ كَأنّه قط لەو دیارەدا نەبوون! ﴿أَلاَ بُعْدًا لِمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ﴾ دوور بن! دووری لە ڕەحمەت، بۆ أهلی (مَدْيَنْ) بێ! وەکی بۆ (ثمود) بوو، دووربونەوە، بە هیلاك چوون لە دارین! ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى﴾ إبن عمران. (هارون) لەسەر طلبی ئەو بوو بە رسول، ئەوەی أساساً ناردرا، حضرەتی (موسی) بوو! ﴿بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ ئاشکرا، دەلیلێ واضح، عیانی وبیانی ﴿إِلَى فِرْعَوْنَ﴾ (توت عنغ آمون)! ﴿وَمَلَئِهِ﴾ أشرافی قومی، قبولّیان نەکرد، تابعی نەبوون ﴿فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ﴾ گەنجێ مُستَبِدّ، مغرور بویی! ﴿وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ﴾ بۆیە قومێ لە دارین، هیلاك بوون! لە دونیا پێشیان کەوت بۆ ناو بحرو خنکان، لە آخرەت دا ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ڕۆژی جزا! ﴿فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ﴾ مُحَقّقه بێ شکە أنّه تێپەڕیوە، لە (نیل) بردنی بۆ جهنم، لە ئاو بۆ ئاگر! ﴿وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ﴾ (وِرد) چوونە سەر ئاوە، کانی یاغیرە کانی! (مَوْرود) ئاوەکەیە! لە (طينة الخبال) ئاویان ئەدەن! ﴿وَأُتْبِعُوا﴾ دوایان خراوە ﴿فِي هَذِهِ﴾ دونیا! ﴿لَعْنَةً﴾ لەبەر بێ ڕەحمەتی دوور خران لە ڕەحمەتی خوا. ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ڕۆژی قیامەتیش لەعنیان دوا ئەخرێ. ﴿بِئْسَ الرِّفْدُ الْمَرْفُودُ﴾ (رِفد) عطاو عونە. ئەو (لعنە)، عطایە بۆ وان (بئس العطية)! بەدی (عطا)ن لەبەدی (مُعْطا)یە! ﴿ذَلِكَ﴾ ئەوی ذکر کرا ﴿مِنْ أَنْبَاءِ الْقُرَى نَقُصُّهُ عَلَيْكَ﴾ بعضیکە لە أخباریان ئەوی مقصدە بۆ هدایت ووعظ وعِبْرَتْ! باقی أحوالات، عائدی کتبی تأریخە، بۆ وقعەی بوونیانە! ﴿مِنْهَا﴾ بعضێ لەو (قری) یە ﴿قَائِمٌ﴾ ڕاوەستاوە، أثری ماوە لەسەر عەردی. ﴿وَحَصِيدٌ﴾ بعضیکی دورواوەتەوە لەسەر أرضی أثریان نەماوە وەك (قری)ی (لوط)! بحّاثەکان خەریکن لە (قصری شیرن) ئەو آثارانەیان بدۆزنەوە، (أنّه) ڕەگیان ماوە! ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ﴾ بەو عذابی إمحایی! ﴿وَلَكِنْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ﴾ إیمانیان نەهێنا عبرەتیان نەگرت، لە حد تجاوزیان

کرد. ﴿فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمْ﴾ کە إصراریان ئەکرد لەسەر عبادەتیان، بە ئومێدی نجات! ﴿الَّتِي يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ یاألله! هاوار! ئێمە غەیری توو، ناپەرستین! ئومێدمان بە لطف وکرمی تۆیە! لە حەق بێ دەسەلاتان، بە قهرو غضبی خۆت، ئەو ظالمانەی أیّامی ئێمەش لەکۆڵ کەیەوە!!

﴿مِنْ شَيْءٍ﴾ هیچ کەڵکیان بۆیان نەبوو! لە شیئێك (من الاشيا)، إحتیاجیان نەبڕین! ﴿لَمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَمَا زَادُوهُمْ﴾ إلهەکان! ﴿غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾ خسران وهیلاك. مەیلیان وا جێگیر بوو بوو، زێدە تَوَغُّلیان لە عبودەتیان ئەکرد، بۆیان بوونە باعث سببی زێدە ماڵ وێرانی عبادەکانیان! ﴿وَكَذَلِكَ﴾ بەو گوێرەیە ﴿أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ﴾ مەحو ئەبن، حتّا ئەوانەی نجاتیشیان بووە، بێ تدوینی دین وئاین ئەڕۆن، بڕوا بکە ئەگەر (قرآن) نەبوایە، ناوی أمثالی (صالح) و (هود) لە دونیا نەدەما!!

ئەی قومی رسالت پەناە! ئێوە ئاگادار بن خۆتان بە هیلاك مەدەن! ﴿إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ کەس، هیچ قوم، خۆی لەبەر ناگرێ! ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ لە عذابدانی أقوامی ظالمە بە (صَیحة وخَسف وبا)، یعنی (مُكَوَناتی جویة) ﴿لَآيَةً لِمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ﴾ عِظة وعِبرة بۆ کەسێ إیمانی بە عذابی قیامەت ببی. إیمانی هەبێ کە خوا، داری جزای هەیە، چ پاداشی چاکە چ خراپە، جزای چاکەی بە جۆری خۆش وعیشی خۆش، جزای خراپەی بە جۆرێ ناخۆش وعێشی ناخۆش وعذابی أليم. ئەمەش متوقفە لەسەر إیمان بە قدرەت وإختیاری جەنابی حەق. ئەوانەی ئەڵێن ئیشی خوا إختیاری نیە إیجابی یە، طبیعیّونن! إعتبار ناگرن ئەڵێن: (ئەمانە أموری طبیعین، ئەبن! خودا مداخلەی نیە! لە ڕووی چاکی وخراپی نیە! أسبابیان وا بۆ ڕێك کەوتوە، ئەبن!) ئەم نکتەی تخصیصی (آية) بە (مَنْ خافَ عذابَ الآخرة) لە (بیضاوی) بەڕەحمەت بێ وەرگیراوە. من لام وایە ئەگەر نشأتی آخرەت نەبێ، نبّوەت، و رسالەت، ولایت ومەلایەتی، هیچی پێ ناوێ! —العياذ بالله— زۆر حاجەت بە صانعیش

نامێنێ!

﴿ذَلِكَ﴾ ئه‌و ڕۆژه‌ی که ئه‌و عذابه‌ی تیا واقع ئه‌بێ. ﴿يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ﴾ گشتی جه‌هه‌نّمی وبه‌هه‌شتی ﴿وَذَلِكَ يَوْمٌ مَشْهُودٌ﴾ عاله‌م ئه‌یبینێ، جزا له‌و ڕۆژه ظاهر ئه‌بێ! ﴿وَمَا نُؤَخِّرُهُ﴾ ئه‌و ڕۆژه ﴿إِلاَّ لأَجَلٍ مَعْدُودٍ﴾ دێ، ممکنه! محالّ نیه! بۆ قدره‌ت وعملی إلاهی، سهله! زه‌حمه‌ت نیه، نێزیکه، دوور نیه، ئاسانه، گران نیه، میعادی ماوه!!

ئه‌مڕۆ له عصری ئێمه حیات له بروز دایه گۆنگه‌لّیه‌تی له ناو أقوامی متمدنه! خوا ئه‌یزانی به ڕاستی إیمانم هه‌یه ئه‌و ڕۆژه ئه‌بێ، أمّا که‌ی ئه‌بێ؟ خوا نه‌بێ که‌س نایزانێ! هه‌ر که‌س مدّه‌ی بۆ داناوه به غلط چووه! ﴿يَوْمَ يَأْتِ﴾ ئه‌و وه‌قته که ئه‌و ڕۆژه دێ ﴿لاَ تَكَلَّمُ نَفْسٌ﴾ ولو أقرب الخلق بێ! ﴿إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ به‌روخصتی وی. که‌وابێ بێ إذنی وی (شَفاعَتْ) چۆن ئه‌کرێ؟ ممکنه ئه‌و إذنه، نوعه ئیزنێ تکوینی بێ!. بناءً علیه ئه‌وی قدره‌تی بوو له‌سه‌ر قسه‌کردن، مأذونه! ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾ له‌و ڕۆژه نوماَیان ئه‌بێ. ممکنه حصر له‌م دوو قسمه، عائدی أممه‌کانی موحوکراوه‌بێ! دینه‌که‌یان هێنده ده‌وامی نه‌بووه، فاسق ومخالفیان لێ په‌یا ببێ! توسیعی تقسیم بۆ أمتی (موسی) و(خاتم الرسل) ئه‌کرێ. ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا﴾ به کفرو ضلال وأعمالی سیّئة. ﴿فَفِي النَّارِ﴾ جه‌نّم ﴿لَهُمْ فِيهَا﴾ له ئاگردا ﴿زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ﴾ له‌به‌ر شدّتی ألم سینگیان، ته‌نگ ئه‌بێ، هه‌ناسه‌یان سوار ئه‌بێ، هه‌ناسه‌یان له هه‌لّکێشان وداکێشانی، ده‌نگی لێوه دێ. (زفیر) و (شهیق) له‌زه‌ڕه‌ی که‌رێ به‌ده‌ر ئه‌که‌وێ، له وه‌قتی زه‌ڕه‌که هه‌ناسه ده‌خواته‌وه ده‌نگی لێ دێ، أمّا له هه‌ناسه هاتنه‌ده‌ر ده‌نگه‌که‌ی گه‌وره تره! ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ له ئاگر، جَهَنَّمْ، با زه‌مهه‌ریر بێ! ﴿مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ﴾ علوی وسفلی. کائنات به هه‌ر نظمێ بێ، بێ لای عُلوی ولای سُفلی، نابێ! ﴿إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ﴾ وه‌قتێ إراده بکا بیانهێنێته‌ده‌ر، أمّا نایکات! ﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ بۆیه ئه‌توانێ إنسان

لەناو ئاگردا بژێنێن إلى الأبَدْ! کەوابێ دەوامی حیاتی آخرەت، چ لە خۆشی چ لە ناخۆشی، وەك حیاتی دونیای مُوَقّتْ، بە إرادەو مشیّەتی خوایە! دەوامی زاتی نی یە! وەدەوامی قوای جسمانی بە دەوامی مبدأیَ مجرد، متفق علیەیە لە بینی حکماو ئێمە! بۆیە ئەوان قائلن بە دەوامی حرکاتی أفلاك. ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ سُعِدُوا﴾ بە إیمان وعملی صالح ﴿فَفِي الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ لە بەهەشت. ﴿مَا دَامَتْ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ﴾ وەك سابق. ﴿إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ﴾ أمّا مشیەت ناکا. وەك عرض کرا، دەوامی آخرەت، بە دەوامی (مشیّة الله) یە، بەلاّم دەوامی حیات لە جێی خۆش وخۆشی دا لە نظر عەقلێ، زۆر دوور نی یە، بەلْکو هەر دوور نی یە، فەرمووی: ﴿عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾ نابرِێ. کەوابێ فەرقی ئەم دوو (ذیلە) دەرکەوت، بناءً علیە إستدلال بەو فرقە لەسەر دوامی أهلی جنّة، فنای أهلی نار، خۆی نی یە! هەرچەند (أبْنُ القَیّمْ) خۆی ماندوو کردووە، بەلاّم دلائلەکانی بێ هێزن، ئەوەندە قووەتیان نی یە لە دەماغاندا بڕوێن! ئەگەر نصّێ قاطع ببێ، علی الرأس، وە إلاّ بە نوکتەی عبارەتی ئەو نوعە مُطالبەی مُقابلی جمهور، إثبیَت ناکرێ! ئەگەر لەبەر بێ تحمُّلی بشریانە إنسان لەناو ئاگری دونیا چارەکە ساعەتێ ناژی! فضل لە دەوام وخلود! فضل لە ئاگری (جَهَنَّمْ)! أهلی (جهَنّم) شُفَعایان بە فریا نایێ! بەلْکو لەگەلێ وان ئەخرێنە ئاگر! ﴿فَلاَ تَكُ﴾ یا محمد! ئەی گوێ دێرینە! گوێتان لێ بێ! ﴿فِي مِرْيَةٍ﴾ شك وشبهە. ﴿مِمَّا يَعْبُدُ هَؤُلاَءِ﴾ قومي تو أصنامیان هیچ وپوچن، وەکی متمدنەکانیش نێن هیکل ومعابدی مُذَوّق ومُرَوّق ومُزَیَّنْ ومَصْنَعیان بۆ بکەن!! ﴿مَا يَعْبُدُونَ﴾ قومی حاضری تۆ ﴿إِلاَّ كَمَا يَعْبُدُ آبَاؤُهُمْ﴾ أقوامی أنبیای کرامْ ﴿مِنْ قَبْلُ﴾ یعنی وەك آباء وأسلاف وأجدادیان محض بە تقلید، بێ فهم وشعور عبادەتیان کردوون! ﴿وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ بەشیان ﴿غَيْرَ مَنْقُوصٍ﴾ علی أکمل وَجْه. أصلاً نقصی تیا نیە!

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ (تورات)، بۆ إرشادو هدایَت وتوحیدی أفکارو

أعمال! ﴿فَاخْتُلِفَ فِيهِ﴾ عكس الأمل، كردیانە باعثی شقاق ونفاق وعداوەت وتكفیری یەك!! ئێوە ئاگادار بن ئەی أمّتی ئێمە إیجابە، بەو نوعە، إختلاف نەكەن!! ﴿وَلَوْلاَ كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِنْ رَبِّكَ﴾ حكمی إلاهی. ﴿لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾ وەك قضای قیامەتی ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِنْهُ﴾ لە كتاب ﴿مُرِيبٍ﴾ موجبی إضطرابی دڵە، دڵیان پێی مطمئن نیە! ﴿وَإِنَّ كُلاًّ﴾ لەوانە ﴿لَمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ﴾ لە یومی جزا ﴿إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ چی لێ بزر نابێ ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾ لە أمر لامەدە! لەو ڕێیەدا ثابت بە كە خوا بۆی نواندووی! بە شدّەتی مێلی دینی، فریفتە مەبە! ﴿وَمَنْ تَابَ مَعَكَ﴾ إیمانیان هێناوە، لە كفر گەڕانەوە، ﴿وَلاَ تَطْغَوْا﴾ بە إفراط وتفریط، تجاوز لە حد مەكەن! تەماشای نسبەتی نبّوەت كەن وەك بنی إسرائیلی إختلاف مەكەن بۆ ڕیاسەت! هەر یەك، فكرێ، مەزهەبێ، مشربێ، بنوێنێ!

ئەو إستقامەیە سهل بوو، گەرچی بعضێ بە نەزاعاتی (صوفیە) ئەوەندە باریكی كرد، لە إستقامەی إمكان دەرچوو! علاوةً مسڵمانان إختلافیان زێتر بوو لە جوولەكان! (إختلاف أمّتي رحمة)یان كردە زەهری هَلاهِلْ بۆ هەیكەلی إجتماعی، هەلاهەلا، هزل هزلی كرد!. بۆیە سورەیی (هود) پێغەمبەری پیر كرد ﴿إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ وەك عَمَلی بنی إسرائیلی ﴿بَصِيرٌ﴾ ئەبایە أمّەت زۆر ئاگادار بن، بەڵام لە دەست چوو! ﴿وَلاَ تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ ج ڕوأسای دینی ج جبابرە و عنیدەكانی دونیوی، إعتمادیان مەدەنێ! إستناد مەكەن بەلای وان!. معنای (ركون) بەو نوعە، مختاری (سیّد رَشید)ە! تفسیری بە میلی یسیر، قبوڵ نەكردووە. گەرچی (زَمَخشَري) تا (سیَدی آلوسی) قبوڵیان كردووە! ﴿فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ ناری تفرقە! بە ئاگری وان ئەسوتێنن لێك دەبن!

﴿وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ لەو حاڵەتەدا غیری خوا هیچ نصیرو معینتان نیە، ئەو ظالمانە سببی زێدە خسرانن! ﴿ثُمَّ لاَ تُنْصَرُونَ﴾ (بِوَجهٍ مِنَ الوُجوه) إلاّ بە إتّفاق نەبێ! ئەویش ڕۆیی!. تێ ناگەن؟ ﴿وَأَقِمِ الصَّلاَةَ﴾ خۆت

و(وَمَنْ مَعَكَ)، ﴿طَرَفَيِ النَّهَارِ﴾ لەم سەرو لەو سەری ڕۆژێ، ﴿وَزُلَفًا﴾ جمعی (زُلْفَة)یە! بە معنا (قُرْبَة) لێرە جوان نیە! وە بە قسمێ ئەڵێن لە شەو نێزیکی ڕۆژ، وەك وەقتی پاش غروب، وبساعاتٍ ﴿مِنْ اللَّيْلِ﴾ تفسیر کراوەتەوە، یعنی لە بعضێ أوقات، ئەفەرمون: إشارەی تیایە بۆ أوقاتی پێنج فرزە، ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ﴾ نوێژ لا شكَّ لە أعظمی حسناتە! ﴿يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ آثاری لە نفس دا نایڵن. کەوابێ نوێژ کردن لەگەڵ سیّئات، خۆی نی یە! عبادات وخیرات ئەگەر تأثیر لە دڵ نەکات، أخلاقی سیّئە نەگۆڕێ، بۆفە! ﴿ذَلِكَ﴾ ئەوەی ذکر کرا ﴿ذِكْرَى﴾ موعظەیە بە یادهێنەرەوەی چاکەو خراپەو پاداشیانە. ﴿لِلذَّاكِرِينَ﴾ بۆ ئەوانەی (مُتَّعِظ) بن، بە فکرو تأمُّل بن، بە بصیرەت وچاوی إعتبار تەماشای شت بکەن! گوێ دێر بن!. ئەڵێن مراد بە (سیّئات)، صغایرە! وەئەم ایەتە خوێندراوەتەوە دەرحەق پیاوێ، لە بعضێ روایات ناوی ئەبا بە (أبي البُسْرْ). ئەڵێن: (ئافرەتێکی ماچ کردوە، یاخود لە بێستانێکدا غَيْرِي (زِنا) ئەوەی خواهشی بووبێ، لەگەڵ ئەو ئافرەتەی کردوە. ئەو زاتە هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر ما جرای عرض کردوە، وەطلبی حدّی کردوە ئەوەی جەنابی رسالەت پەناە ئارەزو بکا. رسولی أکرم جەوابی نەداوە. پیاوەکە ڕۆیی. (فاروق) فەرموی: خوا بزری کردبوو، ئەگەر خۆی بزری کردبایە. پێغەمبەر چاوی لەدوو کابرا گێرا، فەرموی بیگێڕنەوە! ئەوجا ئایەتی(أقِمِ الصَّلاةَ)ی خوێندەوە.

لەو روایەتەدا ناڵێ دەربارەی ئەو نزولی کردووە، ئەمە باشە!. أمّتا لە گەلێکی ئەڵێ: دەربارەی وی نازل بووە! ئەمە خۆی نی یە!! (إنسجام) و(توالي) (آیات) (مجالي) (حکایَتي) (أبي بُسُرْ) لەناودا نادا!! ﴿وَاصْبِرْ﴾ یارسول الله! ﴿فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ تحمّل وخۆڕاگرتن لە ڕێی خوا بۆ إرشادی عباد، مداری حسناتە! صابر، مُحسنە! أجری صابِرْ، قط بە خۆڕایی ناڕوا! ﴿فَلَوْلاَ كَانَ مِنْ الْقُرُونِ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ بۆ نە بووە؟ بریا، بوویا!! ﴿أُوْلُوا بَقِيَّةٍ﴾ صاحِبْ رأي وعەقلَ صاحِبْ فَضْل، یعنی رجالی أخیار و وشیار

﴿يَنْهَوْنَ عَنْ الْفَسَادِ فِي الأَرْضِ﴾ ئه‌و جۆره رجاله‌یان نه‌بووه، بۆیه قوم به فساد چوو بوون! وه‌ك ئێستا كه‌س به كه‌س نالێ چی ئه‌كه‌ی! ﴿إِلاَّ قَلِيلاً﴾ كه‌مێ له‌وان، ئه‌ویش ناته‌وانا و بێ هێزن به نظر كثرَه‌ت وقووه‌تی قوم! ئه‌وانه‌ش ﴿مِمَّنْ أَنْجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ له‌گه‌ڵ رسولیان خوا نجاتی دان، مع الأسف زۆر ده‌وامیشیان نه‌بووه! ﴿وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ رواسای كه تركی نَهْیان كرد بوو، نه‌یان ئه‌كرد! ﴿مَا أُتْرِفُوا فِيهِ﴾ دوای لذائذ وشهواتی خۆیان كه‌وتبون له‌و نعمه‌تی ثروه‌ت وسامانێ، كه هه‌یان بوو!. خوایه ئه‌مرۆش وایه، ئه‌وه‌ی پاره‌ی زۆره، له نعمه‌ت دایه، خه‌ریكی به‌جێ هێنانی شهواتی خۆیه‌تی، دوشمنی ئه‌وانه‌ن كه أمر به معروف ونهی له فساد ئه‌كه‌ن! ئه‌وی خه‌ریكی إصلاحه، ناصحه، یه‌كی له‌سه‌ر دوو فلس كه‌وتووه بیدا به كولێره. بۆ به‌ربانگ!!. یاخود ئه‌وانه‌ی فاسق وفاجرن له كمالی روفاهیه‌ت دان، ئه‌وانی دیش محتاجی سَدّي رَمَقن! ﴿وَكَانُوا﴾ أساساً ﴿مُجْرِمِينَ﴾ له رێی جُرم وگوناه، پێ گه‌یشتن، بوونه صاحبی وظیفه.

﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ﴾ جَلَّ جَلالُهُ وعَمَّ نَوالُهُ ﴿لِيُهْلِكَ الْقُرَى﴾ مُحالة! نابێ! نه‌بووه! ئه‌و شارو دێهات و قومیات به هیلاك دا!! ﴿بِظُلْمٍ﴾ له طَرَف خوای، ظُلْم نابێ! یاخود به ظُلمی كه‌م، یا به كفر! ﴿وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ به أكْثَرِّتْ ملأ و أشرافیان روأسایان مُصْلِحْ بن منْعي فَساد بكه‌ن زه‌ره‌ریان بۆ بشر نه‌بێ، با كافر بێ! خوا باكی چیه؟ أمّا بۆ خاطری سه‌لامه‌تی بشر، ئه‌و أهلی فساده به هیلاك ئه‌دا!. یا رَبِّي یا رَبِّي یا رَبِّي عَنْ قَريب أصلي فَساد له كۆڵ كه‌یه‌وه!!.

﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ مَجْتَمَعْ له‌سه‌ر هیدایَتْ، یا ضلال، وه‌ك (ضَحاك) ئه‌فه‌رموێ: ("أُمیّونْ" ئه‌بومَیْل و فطْرَتْ، مُماثلْ بن)! ﴿وَلاَ يَزَالُونَ﴾ چۆن بووین، ناگۆڕێن! هه‌روا ئه‌ڕۆن! مُتَسَلْسلینه! ﴿مُخْتَلِفِينَ﴾ له‌به‌ر إختلاف خُلْقی، یه‌كێ زه‌كیه، یه‌كێ بلیده، یه‌كێ طَماعه، یه‌كێ قانعه. یه‌كێ ئازایه، یه‌كێ ترسنۆكه. وهكذا إلى ما شاءالله...، هه‌رچه‌ند رُسُل و مصلحین هه‌ن،

وێکڕا سعی بکەن بۆ إتحادی بَشَرْ، لەسەر هِدایَتْ یا ضَلال، قابِلْ نییە! تا إختلافیان هەبێ، لە خُلْق و إیجاد و ظروف بە ناوی هەر مَبْدأ و دینێ بێ، بێ فائدەیە! بەڵێ ئەوانەی مُصلِح بن قوەتیان هەبێ ئەتوانن، مُدّەیێ مُخالفە کەم کەنەوە. بەڵام ئەوەش وەك بورکان ڕۆژێ إنطلاق ئەکا دنیای ژێر سەرەو ژوور ئەکات! . ﴿إِلاَّ مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ﴾ جمعێ کەم، مُدەیێ کەم، إتفاق ئەکەن، دوایێ تێك ئەچێ! . حضرەتی رسول الله(ﷺ) ئەو سعیەی کرد تاکو مِلّەتە پیاوەکی پێکەوە نوساند، کەوەفاتی کرد، تێك چوون! (أبوبکر) تنظیمی کردەوە، (عمر) بە هیبەتی خۆی نەڕە شێرەکانی لە قفص کرد، کە ئەو چوو هەرکەس لە لایێ سەری بلّندکردوە، إختلافەکەیان پەیا بۆوە بە ناوی (خَلافَةْ) بە نوعێ کە لە أیامی جاهلیەتدا نەبوو.

﴿وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ بە خَلْقيْ مُتَّفاوِت، مُتَباينُ المذاهب والمآرِب وَالمَشارِبْ! میولێ لێك دوور، وەك بُعْدی مَشارِق ومَغارِبْ! ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ﴾ حُکمی تَکلیفی، ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ چۆن لە فِطرەت و طبیعەتدا بَعضێ أشیاء بۆ سوتاندن خلق کراوە، هەروەها لە عالەمی تکلیف و شریعەتدا، بَعضێ بالکلی ڕوو لە چاکە ناکا، مادەی فاسِدە بە فَسادی بردووە بە فَساد چووە موجبی فَسادە! علی الأکْثَرْ کِبْر، حَسَد و تَرَأس، وتَرفهیش، مُعینیەتی! وەبێ عەقلّی و بێ إنصافیش، دەخلی زۆرە!

﴿وَكُلاًّ نَقُصُّ عَلَيْكَ﴾ أیها الرسول! ﴿مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ﴾ کلّی خبرێکی بەسەرتا بگێڕینەوە لە أخبارو وأحوال وما جرای پێغەمبەرانی ڕابردوو. ﴿مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ﴾ ئەوەی دلّتیَ پێ ڕاگرین، بۆت نقل ئەکەین. زاتاً جەنابی حەق ئەوەی وحی ئەکاتە رسلان، عائدی هدایَتی بَشرە! خلاصەی أقوالی رسل وجوابی قوم بیان ئەفەرموێ بۆ (خاتم الرسل)(ﷺ) وصبرو ثبیّت وغیرەت وشجاعتیان بۆی نومایان ئەکا. بەجێ هێنانی وَعدْ وَعید، نجاتی مؤمنان وهلاکی کافران، خەبەر ئەداتە حبیبی خۆی. مُحَقَّقْ بزانە بۆ تۆش وابێ، دلّ لە

دڵ مەدە! خاطر جَمع بە! ﴿وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ﴾ لەم سورەتە.﴿الْحَقُّ﴾مُقَرَّر وثابتْ ومُطابِق.

﴿وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ وَعظ وتَذكیر بۆ مُتَّعِظان مُتَّفَكِران مُتَأثِران کەڵك ئەگریٚ! ئەوەی خۆی هەڵخەڵەتاند، گوێی ناداتیٚ! پەند بۆوی، فائدە نادا! ﴿وَقُلْ لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانەی بە عَدَدْ وعُددْن. ﴿اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ﴾ وەك سائری رسل پیٚ یان بلّیٚ:– (ئەوەی لە طوعتان دایە دەربارەی من، بیکەن!) ﴿إِنَّا عَامِلُونَ﴾ ئێمەش سعی ئەکەین لە تبلیغی ما أمر الله بە، دانامێنن! ﴿وَانتَظِرُوا﴾ ئێوە! ئێمە چ مان بەسەر دیٚ؟ ﴿إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ ئێوە چتان بەسەر دیٚ؟ ﴿وَلِلَّهِ﴾ وَحْدَهُ. ﴿غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ دیارە سکّانی سماواتیش شتیان لیٚ بزر ئەبیٚ، نایزانن! عاقبەتمان چی ئەبیٚ ئەو ئەیزانیٚ! ﴿وَإِلَيْهِ﴾ بەس بۆ لای ئەو! ﴿يُرْجَعُ الأَمْرُ كُلُّهُ﴾ أوّل وآخری کاران، هەر بۆلای ئەوە! ﴿فَاعْبُدْهُ﴾ وەك أمرت کراوەتیٚ! خالصاً مخلصاً لله! بیٚ شائبەی شرك و ڕیاو سمعە! ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ سعی بکە! ئومێدیشت بە خوا هەبیٚ! إعتمادی پیٚ بکە! نصرەتت ئەدا، سەرت ئەخا، دوشمنت لە کۆڵ ئەبنەوە! ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ هەموی! لە هەموتان! چی لیٚ بزر نابیٚ! ئەمەکی ئەمەك داران، ضایع ناکا! أمین بە سعیت مشکورە! عَدَدی أعدادْ مقهورە! داعی إلی الحَقْ بیٚ شبهە، منصورە![1]

1 ـ تەواو بوو تفسیری سورەتی (هود) قُبَیْلَ العصر ڕۆژی شەمو (١٦) رمضان، (٧)تشرینی ثانی ڕۆمی، (١٣٥٦)هجری قمری، جَنَّة مکان خلدآشیان مُفَسِّری أکمَلْ (سَیِّد رشید رَضا)پاش تەواوبونی تفسیری ئەم سورەتە خلاصەیەکی ذکر کردوە، زۆر مفیدە! تقسیمی کردوە بە شەش قسم. لە صحیفەی (١٩٨) تاصحیفەی (٢٤٩) گرتویەتی ؛ (رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) ئەگەر بەو منوالە تفسیری (رشیدی) تواو بووبان خێریٚ گەورە ئەبوو بۆ إسلام، بەلاّم بەد بەختی زەمانە مساعدەی نەکرد.

## سورەتی (یوسف)

﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾

بەناوی خوداوەندی أنام شروعمان کردە تفسیری (سورەتی (یوسف)). ژمارەیی ئایاتی (١١١)یە، هەمووی (مَكّية)، إستثنای سێ آیاتی صَدْری سورەت.

﴿الر﴾ گوێ بگرە (ياأيُّها الرَّسول)! سەرگوزەشتەیکت بۆ بیان ئەکەین! زۆر مناسبە لەگەڵ حاڵی توو! بە تەواوی بە دڵت ڕاگیر ئەبێ! کە عاقبەت بۆ تووە! تەماشای جەنابی رسالەت پەناه بکە کە فَتْحي (مكّه)ی کرد، دوای دوو رکعَتْ نوێژ لەناو (بَيْت) لەناو دەرکەی ڕاوەستا، ڕووی کردە قوم، خُضَّع الرِقاب نَواكسْ الأبصار، دوایێ فەرمووی: ئەوەی برام (یوسف) دەربارەی برایانی ووتیە، منیش دەربارەی ئێوە ئەیلێم! (لا تَثريبَ عَلَيْكُمُ اليَوْم! إذهَبوا! فَأَنْتُمُ الطُلَقاءُ!) لە سورەتی سابق، موژدە درا (إبراهیم)، بەبوونی (إسحاق) ودوای ئەو (یعقوب)، بەڵام بیانی کیفیەتی أدای رسالەتیان لە (قرآن)دا نی یە! دیارە تابعی حضرەتی جدّی أعلی (إبراهیم)(علیه السلام) بوین! دینی ئەویان تلقین کردوە، بۆلای تر نەهەنێردراون!

﴿تِلْكَ﴾ آیاتي آتیة! ﴿آياتُ الْكِتَابِ الْمُبِين﴾ إظهار حەق، درۆی إسرائیلیاتی دەر ئەخا! شَرَفي أنْجابي كِرامْ، مِنْهَم الكَريم إبنُ الكَريم إبنُ الكَريم إبنُ الكَريم ((یوسف) بن يَعقوبَ بنْ إسحاق بنِ إبراهيم) إظهار ئەکا ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ﴾ کِتاب ﴿قُرْآنًا عربيًا﴾ بەزوبانی (تازی) مادّەو هیئەت وشێوەی زوبانی (عەرەب). تَفصیلی (عَرَبْ، عَرَبيّ) لام وایە پێی ناوێ! ئەمەندە عرض ئەکرێ أصلی

(عَرَب) لە حضرەتی (إسماعیل) نیە! ئەوەیَ وتوویانە، بیَ أصلە! كَلماتی غَیْرە (عَرَبي) تیایە! یان نا، خِلافیە! أعلامْ نِزاعي تیا نی یە! مع أَنَّهُ هەموی (مُصحف)ە! عادەتی هەموو ألسنە وایە، ئەوەی لە أجنبی وەری بگرن! نەختێكی تێك ئەدەن، ئەیهێنە شێوەی خۆیان!!

﴿لَعَلَّكُمْ تَعقِلَونَ﴾ تیَ بگەن چ حكمەتێكە؟ چ إرشادێكە؟ ▪ خزنەێكی پڕ لە گەواهر وعلومی نافعەیە؟! ﴿نَحْنُ﴾ بلاذّاتْ! ﴿نَقُصُّ عَلَيْكَ﴾ ئەی بنی ذي شأن! ﴿أَحْسَنَ الْقَصَصِ﴾ واقعەییَ عبرەت ئامیَز، أوّلی حزن واخری مَسرَّت! أوّلي تفرق وآخری جمع! مُوافِق لەگەلّ حالّی تۆو قَوما وأقْرَبي أقاربانت! سەرگوزشتەێكت بۆ ئەگێڕینەوە، خۆشترینی گێڕانەوەیە، خۆشترین ما جرایە! ﴿بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ﴾ بە وَحی إلاهی، بیَ شائبە ﴿وَإِنْ كُنتَ مِنْ قَبْلِهِ﴾ پێش ناردنی قرآن. ﴿لَمِنْ الْغَافِلِينَ﴾ لە زومرەی غافلّ وأمیّان بووی! بیَ تأریخی مُدَوَّن، بیَ كتێب، لەناو قومیَ مشغل بە سیّیأتی خۆیی لەگەلّ خۆیی!.

(فی الحقیقە) تا بلّیَی دوور إنسانیَ وەكی (محمد)(ﷺ)، لەو نوعە قومە هەلّكەویَ ببێتە مَهْبَطي وَحي إلاهي، برجی نجومی قرآن، حَكیمی أنبیاء، نَبيٌّ حُكَماء، كە هەمو عاقلّیَ حتّا مستشرقین أورپایی، تیاي مُتَحَیّرن. ئەگەر (إن)ی مخففەش بیَ شأنی بۆ مُقدَّر بكریَ، هەروایە، كەوابیَ دیارە آیاتی قرآن، عمومی بە وَحی إلاهیە! تَعلیمُ وتَعَلُّمی تیا نی یە! ﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ﴾ ذكر كە ئەو وەقتە كە (یوسف) ووتی: ﴿لأَبِيهِ﴾ يَعْقوب! لە لِسانی أجنبی أصلی (یوسف) (ژۆزێف)ە، بعد التَّصحیف لە لسانی (عرب) مشهورە بە (یوسف). لە أسف ومسف نی یە، تا بیكەین بە بِنا فاعِل وبِنا مَفعول، أسفی خواردوە! (حقیقە) علمای إشتقاق سەیریان لایە!. حضرەتی یوسف عرضی بابی كرد ﴿يَاأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا﴾ ئەوەش سەیرە ئەلّێن ناویان (جَرَّبان، طارِق، ذویّال، قابِس، عَمُدان، فَلیق، مُصبِح، فَرَع، وَثَّاب، ذو الكَتِفَیْن، ضَروح)بووە، ناوی ئەم كوكبانە حتّا لە (تورات)یش دانی یە.

لە (جابر) روایەت ئەکەن کە (ثُنان)ی یهودی هاتە خزمەت پێغەمبەر وتی: (خەبەرم دێیە لە ناوی ئەو نجومانەی کە (یوسف) دیتنی؟)، (جبریل) نازل بوو خەبەری دایێ بەو ناوانە.

لە روایەتێ تر لە بَدَلْ (مُصبِح) نَطْحیان)ی ذکر کردوە، (حاکم) وتوویەتی: (صحیحە) أمّا گەلێ مەلا ئەفەرمون: (أبو زُرْعة) و(إبن الجَوزي) ئەفەرمون: (مُنْكَرە! مَوْضوعە).

﴿وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾ لەخەونا وای دیت یازدە ئەستێرەو رۆژو مانگ سجدەیان بۆ برد. ئەم سجدە چۆنە؟ ئەوەی لە خەوا دیتی، وای دیتوە، کە جهەتی عُلیایان بۆ ناوەتە سەر عەرد!. لام وایە بعضێ تصویری سَجْدَی کَواکب وشَمس وقَمَری پێ نەکراوە، بۆیە فەرمویەتی: برایان وداك وباوکی دیت سجدەیان بۆ برد، أمّا تأدّباً بە طریقي إستعارەی مُصرَّحة، تعبیری بە کَواکب وشَمس وقَمَر دایەوە، حقّاً ئەو قسەیە هیچە، أنّە ئەو زاتە خەوی دیتوە، خەون چی یە؟ عالەمێ تیای حەیرانە. لە هەنگامی نوستن خەون ئەبیندرێ، إنسان بێ داعیەیە بێ قووەی محاکمەیە! ئەبینێ خۆی لە ولاتێ دوور ئەبینێ چۆن هات؟ چی ئەکا؟ لە کوێ ئەبێ؟ کەی هات؟ کەی ئەچێتەوە؟ أصلاً بە خیالّی دانایێ! باوجودی غَیْری کەمێ لە دەماغی، هەمو أعضای تری بە خەبەرە! ئیشی خۆی (کما في الیقظة) ئەکات! لاشك ئەوەی لە ئانی خەوا ئەیبینێ، هیچ نیە! وەك (عَضُدْ) ئەفەرموێ: (باطلە!) أمّا أساسێکی هەیە! بعضیکی عینا دێتە جێ! بعضیکی بە مناسبە دەر ئەکەوێ! عادە بە أشکالی مُجَسَّمة وەکی أفلامی قدیمە، شت نیشانی إنسان ئەدرێ! ئەوەی ئاگادار بێ کە بەخەبەر هات، ئەیخوێنێتەوە! بعضیکیشي تێکەلاو پێکەلاو ئەبێ، نازانێ چی یە!. (مُتَکَلِّمین) نالێن بالکلّی خەون باطلە! حاشا! بەلْکو بعضێ لە أربابی حواشی فَهمی فەرمودەی (عَضُدَ الدین)یان

کردوه، إعتراضی لێ گرتوه. (عَبدالحکیم هندی) جوابی داوەتەوه بەو جۆره که إشارەمان بۆ کرد.

قسه له خەون زۆر کراوه، حیکایەتێ نوێتان عەرز ئەکەم: زاتێ بوو، مەلا، مەلایێ چاك! "مەلا مولودی هەولێری" وەللاش فەقێی بابم بوو، زۆری له خدمەت باپیرم خوێندبوو، هاته (کۆیێ) بەقاضیەتی، چەند جاران گفتوگۆمان ئەکرد. ڕۆژێ له حزمەت بابم چوینه (تکیەی بابه شێخ) (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ)، قاضیش تشریفی هات، فەرموی: (کاك محمد) إشکالێکم هەیه، حَدّم نیه عرضی بابت بکەم، أمّا عرضی تۆی ئەکەم، وه شەو ڕۆژێ، سێ شەو ڕۆژ، دوو هەفته مهڵەتت بێ ئەگەر جوابم بدەی! حقیقةً دڵم کەوته دەغدەغه، زاتێ وا مُدَقّق له قریحەی خۆی إشکالێ وا هەڵسێنێ، ئەبێ چ بێ؟ ووتم فەرموو! فەرموی: (معلومه هەموو کتێبێ حکمەت وکلام ئەڵێن: (حِسّي مُشْتَرَك) دَوْري مُدْرِكيه، خۆشی ئەیداته (خَیال)، لەوێ حفظ ئەکرێ! ئەمڕۆ له تفسیری (بیضاوي) دیتم ئەڵێ: (حِسّي مُشتَرَك) له (خَیال) وەرئەگرێ! ئەوەندەی دەست ڕەسم بوو له کتێبی حکمەت وکلام پشکنیم، چم نەدیت إشکالەکەم دفع بکا).

ووتم: (ناکا له تفسیری خەونی حضرەتی (یوسف)ت دیبێ؟) ووتی: (بەڵێ والله!). ووتم: (خوا عافوت کا ئەمه جێی إشکال نیه! بێ قضابی (بیضاوی) باسی خەون ئەکا، لەخەودا حَواسی ظاهر بێ کار ئەمێنن! ئەو وەقته(حسی موشتەرەك) له (خەیاڵ) وەرئەگرێ، له وەقتی به خەبەریدا له (حواسی ظاهره) سَمع وبَصَر وذَوق ولَمس وەرئەگرێ ئەیداته (خیاڵ)، فەرموودەی (بیضاوی) چ إشکالی تیا نیه!! وه مع هذا شێخی (رئیس) ئەفەرموێ: (قوای باطنة وەك مرایای متقابلن، لێك وەرئەگرن). که ئەو جوابم دایەوه بەو سوکی وئاسا نیه، مەلا زۆر مُنْفَعِل بوو ساکت بوو تاهەستاین، بابم فەرمووی: (ڕۆڵه ئەبا مساعدەی قاضی بکەی، ئەو زۆر إشکالەکەی إستعظام کرد، تۆش زۆر

بەبێ أهمیەتی جوابت دایەوە گەلێ متأثر بوو). ووتم: (قوربان بەخوای لای وابوو تۆش ناتوانی جوابی بدەیەوە، أمّا أدبی نواند، ئەو زاتە زۆر خەریك بوو من بشکێنێ، أمّا لە لطفی خودا بۆی ڕێك نەکەوت).

علمای طبیعیّون خەریکن، بەلام بۆیان حەل نابێ خەون چیە ئەو دیتنی قبل الوقوع مُؤَوَّل لەچیەوەیە؟! بە قواعدی طبیعەت چیان بۆ میسّر نابێ، ئەوەی ئەلێ خەون هیچ نی یە، ئەوەی لە ڕۆژ ئەیبینێ، لە خەو دێتە خەیالت، هذیان ئەکا! لەگەلێ خۆی ئەلێ، ﴿قَالَ﴾ باوکی فەرمووی ﴿يَابُنَيَّ﴾ ڕۆلەکە! کرۆلەکەم! ﴿لاَ تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ﴾ خەونت مەگێڕەوە بۆ برایەکانت ناویان لە (تورات) وگەلێ تفاسیری خۆمان نوسراوە!. ئایا ئەو نهیە لە قضا ئەخوازێ کە بۆ هیچیان حتّا بۆ (بنیامێن)ی برای گچکەی داك وبابی خۆی نەگێڕێتەوە؟ چ قەیدیە! ئەگەر لەبەر ﴿فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْدًا﴾ بلێی لە کیدی ئەو أمین بووە! بەلێ! أمّا لە گێڕانەوەی، أمین نەبووە! چ قەیدیە (بنیامێن) داخلی ساجدان بێ؟ بالە برایە فێرکەرەکانیش نەبێ. باجهەتی سجدەی وی، لەگەلێ جهەتی سجدەی ئەوانی تر یەك نەبێ. بعضە قسەیێ لەو مقامە کراون شایانە نەنوسرێ. ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ﴾ زاتی پیسی پڕ تلبیس! ﴿لِلْإِنسَانِ﴾ على الإطلاق حتّا بۆ (رُسُلان)، ﴿عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ خۆی بزرە أمّا عداوەتی ئاشکرایە! خاصّةً معيني داخليشی هەیە، کە (نفس)ە أعدی العدوّە. بەخوا ئەگەر نفسی خبیث نەبێ، شیطان چی پێ ناکرێ! باوجودی لێر ڕێشی هەیە. هەر عائلەیێ برا گچکەکەی بەهونەر تربوو، لای باوکی (تقدّمی) کرد لەسەر براگەورەکانی، ئەم عائلە ڕێك نابن. ئەگەر خوا بیدا گەورەیی فضائل بە گوێرەی گەورەی عمر بێ، زۆر باش ئەبێ. مُرجَّح لای أکثری علماء برایانی (یوسف)، (نبی) نەبوون! لا أوّلاً ولا آخراً. (مُجَدّد مصری) ئەفەرموێ: (إنسانی وا دلّ ڕەق لە حەق برای خۆیان، برای معصوم، برایێ بالاّ سوروش، (زوهوشمندی میتافت ستارەیی بلندی) قَط نابن بە پێغەمبەر. ﴿وَكَذَلِكَ﴾ بەو نوعە کە لە عالەمی روأیا تۆی

بلّند كرد وە(عظیم الشأن) نیشانی دای، ﴿يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ﴾ لە خارجی لە عالەمی بەخەبەری، بۆ أموری عظامی وگەورەیی. ﴿وَيُعَلِّمُكَ مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ﴾ رۆیاو غیرە رۆیا. حضرەتی (یعقوب) ئەمەی لە چی إستنباط كردوە؟ مسألەی (إجتبا) دیارە! (كَيْدِي إخوەت) لە طبعی بشری وەرگرتووە، خاصَّةً بەو وجهەی كە من إشارەم بۆ كرد. چونكی منشأی إستنباطیان نەزانیوە، (زُمَخْشَرِي) وأتباعی ئەفەرموون: (ئەم قسەیە سەر بەخۆیە، داخلی تَشبیهی مُستَفاد لە (كذلك)ە نی یە). بعضێ نوعە گێرەگێرەیێ ئەكەن. (سیّد رشید) خۆی هەلّداوەتەوە بە طعن لە (زُمَخشَرِي)، أمّا معَ الأسَف مَنْشَأي پێ بەیان نەكراوە. بەلّێ لە گەلێ جێ خۆو أستاذی رایان لە قَواعدی عَرَبی نی یە، (كأنّها) لە مخترعات ومختلفاتی مەلایەكانە! دیارە كەسێ واگەورە ببێ، وێنەی، یاعینی، ئەستیرەو ڕۆژ و مانگ، بۆی بكەوێتە سەر خاك، بەقوەی زەكای خۆی، عَواقِبي حوادث ووَقایع، چ لە خەو چ لە یقظەت نازانێ؟! ئەبێ بزانێ! زانینێ عملی، ئەگەر چارە پەزیر بێ، چارەشی بۆ بدۆزێتەوە.

لەعصری ئێمە (طیارة) إحداث كرا، لەوەخامەتی عاقبەتی، مُفَكّرین چارەی مدافعەیان بۆ دیتەوە. وەهەروەها (غازي مُخنِق)، بەلّێ ئەوانەی سَرامَدو مَدَبّر بن، ئەبێ لە أوّلی أمر لە آخری كار بفكرن! بە قووەی إستنتاج، بزانن ئەنجامی چی ئەبێ! ئەو خراپەی لێ ترتُّب ئەكا، چۆن دەفع ئەكرێ ؟ وە إلاّ مانگ وڕۆژ سجدەی بۆ نابەن! وەممكنە لە آثاری فطنەت و زرینگی حضرەتی (یوسف)، قووەی إنتقال وإنتباهی (یعقوب) تَفَرُّسی فەرمووبێ. شێخی رئیس (إبن سینا) لە رسالەێكی خۆی ئەفەرموێ: (من عهدم كردوە لەگەلّ خوا، بە خیالّیش درۆیان نەكەم، تاكو خەوم ڕاست بێ). وادەرئەكەوێ درۆ تأثیر لە خەویش ئەكا، ﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ﴾ عزو شەڕەف دونیاو دین قووەتی مُكَنَتي دونیا مُتَمِّمي دینە رسالەت بێ قدرەت شەعشەعەی نیە، خودایەتی بێ قووەت

وقودرەت ناكرێ (ما أحْسَنَ الدينَ والدُّنيا لَوْ إجتَمَعَا) رسالەتی شاهی رُسُل لەگەڵ رسالەتی صندوق مەندەقوقی وەك يەكە؟ ناوالله!

﴿وَعَلَى آلِ يَعْقُوبَ﴾ خێزان وعائلە، وأولادی وەأبنای بەگوێرەی توو سەر فراز ئەبن لە بداوەت دەچن بۆ حضارەت. ﴿كَمَا أَتَمَّهَا عَلَى أَبَوَيْكَ﴾ باپیرو باپیری بابت ﴿مِنْ قَبْلُ﴾ پێش ئەو عصرە یا پێش توو. ﴿إبراهيم﴾ جَدّی گەورە ﴿وَإِسْحَاقَ﴾ بابی بابت بە رسالەت و نبُوەت وە گەورەیی و ثروەت و سامان. لەپاشان زەحمەتیان، زیللەتیان لەدەست کەس نەدیت. ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ رۆڵە ﴿عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ بەرەحم وحیکمەتی خۆی بەگوێرەی مواهبی فطری کارت بۆ رێك دەخا. ئەو جەوهەرە ضایع ناکا. حضرەتی یعقوب هەرچەند جازم بووە کە ئەوانە دێنە جێ، لکن نابێتە موجبی بێ موبالاتی لە حفظي (يوسف) وە إعتنا پێ کردنی، بەڵکو بالعکس ئەبێ زێدە ئاگاداری بکا، ئەبێ دائماً چاوی لێ بێ، مەبادا خوا نەکردا أصعبەکی پێ بگا. نابینن ڕاهبی سوری چۆن تأکیدی کرد بۆ إرجاعی حضرەتی نبوی وە نەبردنی بۆ شام مەبادا یهودی کەیدێکی لە حەق بکەن. بەڵێ فەرمووی ئەترسم گورگ بیخوا، ئەوانیش گوتیان گورگ خواردی، أمّا بڕوای پێ نەکردن، ئومێدی نەبڕا، لە مانی (يوسف) مأیوس نەبوو. وا ئەزانم حضرەتی (يعقوب) نەیفەرمووە کە عینی خەونەکەت دێتە جێ داك وبابت برایانت سجدەت بۆ ئەبەن، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ﴾ آیاتێ زۆر! ﴿لِلسَّائِلِينَ﴾ ئەوانەی لە حقایق ئەکۆڵنەوە، نەك سەر سەری گوێ لە حیکایەت ڕاگرن، شتێ بوو هات ڕۆیی. زاتاً بۆ ئەو نوعە سائلانە، قیمەتی تأریخ بەدەرئەکەوێ.

(في الحقيقة) آیات وعِبَرْ لە ما جرای (يوسف) وبرایانی بوو، شَمس وقَمَر داك وبابی مُداخەلیان نەبوو. بەس بۆ (يعقوب) حُزن وگریە لە بزر بوونی (يوسف) ارتدادی بَصَری لە بۆنی (يوسف) بوو. وَمَعَ هذا ذکري ما جَراي سابِق زۆر موافقە مُقَدِمَەیە بۆ تفسیر، بەڵکو تفسیری آتی تَفسیری ئەو مجملەیە.

﴿إِذْ قَالُوا﴾ برایانی (لأبْ) بەکوردی زڕ برایان پێ دەڵێن ئەگەر داك وبابیان یەك نەبێ، بەبرای حەقیان نازانن. ئەمەش (في الحقيقة) ئیشی زڕداکانە ﴿لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ﴾ برای حەقی (بنیامین) ﴿أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا﴾ خۆشەویستترن بۆلای بابمان لەئێمە. دیارە ئەوانیشی خۆشویستیە، أمّا نەیاندەتوانی، تَحَمُّلیان نەئەکرد (یوسف) وبرای لەوان خۆشەویستتر بن. ئەیان ووت چۆن ئەبێ ئەوان کەم وگچکەو بێ هێزن ﴿وَنَحْنُ عُصْبَةٌ﴾ جمعێ بە قووەت ئیش گوزار. لاشك لە (عُصبَةُ الأَمَمْ) بە قووەت تر بووین.

﴿إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ لەبەر حُبّ نابینێ، مصلحەو مفسدە لێك ناکاتەوە، ئێمە بەکاری دێین، حەق وابوو ئێمەی زیاتر خۆشبوێ! (في الحقيقە) ئەو حکمەیان دوورە لە إنصاف. مداری خۆشەویستی أولاد بۆ زاتێ وەك (یعقوب) قووەتی بەدەن وئیش کردن نیە، مع أنە ئەوەی ئەوان ووتیانە موجبی زێدە لطفە لەحەق (یوسف) و برای. بابی أصیل منداڵی بێ داکی خۆشتر ئەوێ لە گەوران، خصوصاً کە داکیان مابێ، لەبەر بێ ڕەحمی زڕ داك زۆر شفەقەتیان لە حەق ئەنوێنێ. سُبحان الله برایەکم هەبوو (کاکە بهاء الدین)، دایکی پلکم بوو، کە وەفاتی کرد، بابم داکمی خواست، عمرم سێ چار ساڵانی بوو، دایکم مرد، باوکم بەخێوی کردم، زۆری خۆشدەویستم، (کاکەباو) تووڕە ئەبوو حتّی گەلێ جار ئەیگوت (کاك حەمەد) وەك (یوسف) وەهایە ڕقی لێم ئەبۆوە، مەیلی خوێندنی نەبوو، من ئەمخوێند، بابم زێدە إعتنای پێ ئەکردم، ئومێدی بە قووەت بوو ببمە مەلا. لە سایەی لطفی خواو إعتنای ئەو لە حیاتی ئەودا بوومە مەلا چەند إجازەم لە حضووری وی دا. خوایە بۆ حورمەتی ئەو دوو بابە،( علمی آلی جَلی) نەکوژێنیەوە تا أبد، لەگەڵ دەوڵەت وعززەت، عالمی گەورە لە أولادو أحقابی من نەبڕێ، إلاهی خۆت ئەزانی عصر زۆر نامساعدە بۆ ئێمە ئیتر خۆت و مەرحەمەتت.

لە ایەت وادەرئەکەویٚ تعروضیان بۆ خوونی، یا درکردنی برایەکەی نەکردیە. زیادە هەنجەتیان بە زێدە مَحَبَّتي براشی گرتیە، بەمە ضلالی باوکیان ئاشکرا تر ئەکەن. ﴿اقْتُلُوا يُوسُفَ﴾ ئەو بڕوا برای بیٚ ئەهمیەتە. ﴿أَوْ اطْرَحُوهُ أَرْضًا﴾ مداوەلەی قسەیان ئەکرد، بعضيٚ وایان ئەووت، بعضيٚ نوعیٚ تر. یاخود یەکیٚ لەوان مُخَیَّری ئەکردن یا بیکوژن یا فرێی بدەنە أرضيٚ دوور.

﴿يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ﴾ ڕوو هەر لە ئێوە ئەکا ، زاتاً تَوَجُّهي تامّی هەر بۆ (یوسف) بوو. ﴿وَتَكُونُوا﴾ بە(جَزم وحَذفِ نون) (جَوابي أمرە) وەك (معطوفٌ عَلَیهِ) ﴿مِنْ بَعْدِهِ﴾ پاش فەوتانی ئەو ﴿قَوْمًا﴾ گرۆهیٚ ﴿صَالِحِينَ﴾ بیٚ حَسَدو دەغدەغەی قلب وإعتراض گیری لە باب، موجبی فسادمان نامێنیٚ، خزمەتی بابمان زۆر باش ئەکەین بیٚ خودگیری گەلیٚ وجهی خوایی پەیدا بووە، خالّی لە أکدار نەبووە.

﴿قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ﴾ (یهوذا)یە، یایەکێکی تر لەوانە، تعینی مقصود نیە. تفسیری مُبْهَماتی قرآن لای گەلیٚ لە مفسرینان مهمە وەك تفسیری مُبهَماتی غیری قرآن، لکن قیاسیانم مع الفارقە، مُبهَماتی حدیث لازمە زانینیان تاکو بیانناسین، ئایا مقبول الحدیثە، یان مردودە؟! أمّا مُبهَماتي قرآن وانیە، تعین وإبهام وەك یەکن. بەلاّم بعضيٚ مبالەغەیان کردووە تفسیري مُبْهَمات مَنع دەکەن تأسیاً بالقرآن، أمّا (في الحقیقة) دەلیل منع نیە.

لای حقیر نە لازمە نە ممنوعە! ﴿لَا تَقْتُلُوا يُوسُفَ﴾ مەیکوژن! مەیهاوێنە ئەرزیٚ دوور، بیٚ مرور و بیٚ عبور، ﴿وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ﴾ بیهاوێنە بنی چاڵێکی قووڵ. (جُبّ) بیری هەڵنەنراوە، ئەگەر هەڵنرا ئەوجا بە عەرەبی پێی دەڵێن (بِئْر). (غایَةُ الجُبّ) لابرێکە وەکو طاق وئەشکەوت دایدەبڕن لەناو بیر لە هەوراز ئاو. ئەو بیرە سەر ڕێیە هاموشۆی بەسەردا دەبیٚ. ﴿يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ﴾ هەڵی ئەگرنەوە بعضيٚ لەقافلّە یا بعضيٚ لە ڕێبواران وەك منالّیٚ فرێدراو ئەیبەن لەگەڵ خۆیان. قِراءَتي حَسَنْ بە (تیٚی) تأنیث لام زۆر جوان

نیە! غیابات وە غِیّابات یە جَمْع وتَخفیفی یاتشدیدی إحتیاجی بە تأویل هەیە؟ نازانم! زۆر کەیفم بە قرائاتی مختلف نایە!! ﴿إِنْ كُنتُمْ فَاعِلِينَ﴾ صَواب ئەوەیە ئەگەر ئەیکەن ﴿قَالُوا﴾ بلّێم برایانی (یوسف) یاکوڕانی (یعقوب) یائەوانەی تدبیرو مشاوەرەیان ئەکرد لە فەوتاندنی (یوسف). أنْسَبْ بە ﴿يَاأَبَانَا﴾ کوڕانی (یعقوب)ە غیری (بنیامێن). ئەی بابی ئێمە ﴿مَا لَكَ﴾ سببی چیە؟ چ بۆ توو ڕوویداوە کە ﴿لاَ تَأْمَنَّا عَلَى يُوسُفَ﴾ أمین نی لە ئێمە، جارێ إذن نادەی (یوسف) لەگەڵ ئێمە بێتە صحراء پێکەوە بگەڕێین. ﴿وَإِنَّا لَهُ لَنَاصِحُونَ﴾ لەسەر ئەو حاڵە کە ئێمە بۆ وی ڕەهبەری ئەکەین، ڕێی باشی پیشان ئەدەین، نایەڵین بێ تربیە ببێ. ﴿أَرْسِلْهُ مَعَنَا﴾ بینێرە! أنَّهُ لە قَفَصْ دایە، بەڕەڵڵای کە لەگەڵ ئێمە بێتە دەرەوە ﴿غَدًا﴾ سبەینێ ﴿يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ﴾ لەگەڵ ئێمە بلەوەڕێ لە میوە وگیاو گوڵ، خواردنی پیفوك وگێزبەلەی ناو عەردی، گەمان بکە بەهەوەسی خۆی غاردا ئەمسەرو ئەوسەر بکا. ﴿وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ ئاگاداری ئەکەین ئەگەر گەمەو مەمە بکەین، بۆ کەیفی وی ئەیکەین، مقصودیان کەیف وخۆشی وییە. ﴿قَالَ﴾ باوکیان، من لە ئێوە ئەمینم ئەزانم ناصحێ مُشفِقْن ئاگاداری ئەکەن! بەلام ﴿إِنِّي لَيَحْزُنُنِي أَنْ تَذْهَبُوا بِهِ﴾ لە فراقی عاجز ئەبم هەر ئەوەندە کە بیبەن لەگەڵ خۆتان من محزون ئەبم. ﴿وَأَخَافُ أَنْ يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ﴾ ئەترسم گورگ بیخوا ﴿وَأَنْتُمْ﴾ ئێوە لەبەر گەمەو گاڵتە ﴿عَنْهُ﴾ لە (یوسف)ی ﴿غَافِلُونَ﴾ ئاگاداری نەبن ﴿قَالُوا لَئِنْ أَكَلَهُ الذِّئْبُ﴾ خوا نەخواستە ئەگەر گورگ بیخوا ﴿وَنَحْنُ﴾ برایانی وی أولادی توو ﴿عُصْبَةٌ﴾ جماعتێ قەوین أنە وەك (عُصْبة الأمم) بۆ حفظی حقوقی ضعیف تشکیل کراون.

﴿إِنَّا إِذًا لَخَاسِرُونَ﴾ خُسران لەوەندە زیاتر ئەبێ جمعێ وا منالێکیان لە گورگ پێ حِفظ نەکرێ؟ تێ شکان هەر وها ئەبێ! ﴿فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِ﴾ باوکیان بە قسەیان إقناع بوو إذنی دا لەگەڵ خۆیان بۆ صَحراءْ. بنا لە (تَوْراة)ی شَریف

حضرەتی (یعقوب) خۆی أمری کردیتە (یوسف) بڕوا بۆلای برایانت کەلەلای (شَکیمْ) حیوان ئەلەوەڕێنن خەبەری سەلامەتی برایان ومێگەلم بۆ بێنەوە، ئەویش ئەچێ، برایانی لەوێ نامێنن بەپرسیار ئەزانێ چووینە (دۆثان)، (یوسف) بە دوایاندا ئەچێ، ئەچێتە (دۆثان) ئەوجا لەوێ دەیهاوێنە ناو بیر، وەهەم وائەزاندرێ لە (تَوْراة) کە (یوسف) خەونەکەی گێڕاوەتەوە بۆ بابی، بابی تووڕە بووە، وا دەرئەکەوێ پێی ناخۆش بووە، أمّا خۆی گرتیە. ئەیهوو، تەماشای قسەی بێ معنا بکەن حقّاً فرق زۆرە لەبەینی (قرآني عظیم الشأن) و (تَوْراة)ی جوولەکان.

﴿وَأَجْمَعُوا﴾ برایانی حَسّادی زۆردار گردبوونەوە إتّفاقیان کرد ﴿أَنْ يَجْعَلُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ﴾ إیي معهودی سەرەڕێ! بعضێ دەڵێن سێ فَرْسَخْ دوور بووە لە جێی (یعقوب) لە (کَنعانْ). دیارە بیرێ نێزیك بووە لە دێی حضرەتی (یعقوب)، لە چوون وهاتنەوەی أولادانی دەزاندرێ لە ڕۆژدا، بە کمالی بێ ڕەحمی هاویشتیانە ناوبیر ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ﴾ بۆ (یوسف). جەنابی حەق هاویشتیە دڵی بێ شك وإشتباه بوو ﴿لَتُنَبِّئَنَّهُمْ﴾ برایانت. ﴿بِأَمْرِهِمْ هَذَا﴾ بەو کارە کە کردیان ألآن بەچاویاندا دەدەیەوە ﴿وَهُمْ لاَ يَشْعُرُونَ﴾ لەبەر تبدّلی حالْ وهَیْبة وجَزم بە نەمانت نازانن ئەو زاتە تۆی! ئەم وەحیە وەحی رسالەت ونبووەت نەبوە، حاجەت بە ماندوو بوون نیە. سُبحانَ الله بعضێ ضمیری (اِلَيْه) بۆ (یعقوب) ئەنێرن، چەند دوور و بێ معنایە. سۆي فَهم وإعتقاد چی بە إنسان ئەکا! لە هەندێ هەنگاما وەقتێ شِدَّتْ ومأیوسی ئەکەوێتە قلبی هەندێ زەوات کە نجاتی ئەبێ وەنائلی موقیعێك ئەبێ کە نایێتە خیالێ. ئەو وەحیە پەکی لەسەر صلاح وگەورەیی ناکەوێ. بە ڕەحمەت بن (مصطفی پاشا) کە لەناو تورکان بە (مصطفی نمرود) مشهور بوو، شێخ الإسلام (إبراهیم حەیدەری) تصدیقی فەرموو سببی ئەو ناوەم لێ پرسی پاش جوابی ووتی: (لە أثنای محاکمەی عسکری کە خەریك بوون قراری إعدامم بدەن هاتە دڵم ووتم

ئەی خورشید پاشا رئیس مُحَقّق بزانە هەفتەیێ تر من لەسەر ئەو کورسیەی دادەنیشم ئێوە محاکمە دەکەم. صنادید إتحاد وترقّی هەر دەئاوەسم، (فی الحقیقە) وەها دەرچوو. لە عومری مبارەکیان خلافیان هەیە، دوازدە، حەڤدە، هەژدە، أمّا لای (ضَحّاك) شەش سالّی بووە، لام وایە دوورە، ئەبێ زیاتر بووبێ! ﴿وَجَاءُوا أَبَاهُمْ عِشَاءً﴾ وەقتێ معلوم بەینی نوێژی مغرب ونوێژی خەفتنان.

بعضێ قراءَت نَقل ئەکەن لە (حَسَنْ) زۆر بێ وجهن خۆیان بۆ توجیهی ماندی دەکەن، حملی کلامی خوا ئەکەنە سەر مبالغاتی بێ جێ. ئەوەندەیە هاتنەوە لای بابیان لەو وەقتە ﴿يَبْكُونَ﴾ ئەگریان بە گریەیێ درۆ، دَمعي کذبیان ئەرێژا. چی پێ ئەوێ بلّێین ئەمەندە گریابوون چاویان کۆر بوو بوو. خۆ مُدّەی ئەوەندە نەبوو بەو گریانە چاویان کۆر ببێ! بەلّێ مقصدیان زۆر مبالەغەیە لە زۆر گریانیان، بێ لزومە. قرائتێ ڕاست وڕەوان، معنای خۆش وظاهر، عدول بۆ؟ ﴿قَالُوا يَاأَبَانَا إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ﴾ غارمان ئەدا لێك پێش کەوین بعضێ حورمەتیان زێدە ئەگرن ئەیکەنە مسابەقەی تیر ئەندازی ئاگایان لێ نیە کە حضرەتی رسالەت پەناە لەگەلّ حەرمی صدیقی کچی صدّیقی ئەو نوعە مسابەقەیە کردیە. ﴿وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِنْدَ مَتَاعِنَا﴾ لباس وخواردەمەنی، ئاگامان لێ برِا. ﴿فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ﴾ گورگ خواردی. وادەرئەکەوێ بعضێ (ضمیر)یان راجعی (متاعی) کردیە. ئەگەر مَقصَدیان حفظی ئەو زاتانە بێ لە درۆ، ئایا ڕاست بووە گورگ زادی خواردینە؟ ئەدی لە (دَمٍ كَذِبْ) چی ئەلّێن؟ خلاصە لاڕێیەکی بێ وجهە! ﴿وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا﴾ بڕوامان پێ ناکەی ﴿وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ﴾ (بالفرضِ والتّقدیر)یش قطعیاً پێمان بڕوا ناکەی. ﴿وَجَاءُوا عَلَى قَمِيصِهِ﴾ کراسی (یوسف). ﴿بِدَمٍ كَذِبٍ﴾ زۆر لطیف وجوانە دەبِستی تێ نەدەن خوێنەکە عینی درۆیە (بِکَذب) یا (مکذوب) بیان خوێنەوە (کدباً) یا (کدِب)، بە دالی مهملە، خۆی نیە! ولو منقول عنە وەکان زۆر گەورەبن. ئەوجا خۆ ماندی

کەین بە معنای (کَذِب)ی توخوا لێی گەڕێ با ئەم (دَمٍ كَذِب)ە بە کراسی (یوسف)ی یەوە وەبمێنیٚ! ﴿قَالَ﴾ باوکیان فەرمووی ﴿بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا﴾ گورگ نەیخواردیە، نفستان شتێکی بۆ زینەت داوە، شتێکی منکر وناشیرینی بۆ ئێوە جوان کردیە، ماوە بۆ من ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ ئیش صبری جمیلە، خۆگرتنی باشە، پەلە پەل بۆ هیچ لایٚ نەکەم، بەس ڕوو لە خوا ئەکەم، ئەو سرەی هەڵمالێ ﴿وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ﴾ یاوەر ومعینە. ﴿عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ لەسەر ئەو درۆیە، کە بەدەریخا، وە إعانەم بدات لەسەر تحمّلی فراقی (یوسف). ﴿وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ﴾ لە طرەفی (مَدْیَنْ) قافلە ئەچوون بۆ مصر. (تَوْراة) ئەڵێ لە بنی إسماعیلیان بوون! ﴿فَأَرْسَلُوا﴾ بۆلای بیرەکە. ﴿وَارِدَهُمْ﴾ ئەوەی دێتە سەر ئاو، ئاویان بۆ ئەبا ئەویان ، بۆ ئاو نارد. ئەڵێن ئەو شخصە (مالکی بنی دُعُری خَزاعی) بووە، والله أعلم! ﴿فَأَدْلَى دَلْوَهُ﴾ دەولکی خۆی نارده خوار بۆ ناو بیر. (یوسف) خۆی بە دەولکەکەوە نووساند دەستی پێوە گرت. ﴿قَالَ﴾ کە (یوسف)ی دیت بانگی کرد ﴿يَابُشْرَى﴾ لە خۆشیان بانگی نفسی بشارتی کرد. (سدّي) بۆ صحەتی نداو هێنانە دەری ئەڵێ: (بُشْری) ناوي یەکێك بووە لە کاروانیان هاواری کردیتێ یارمەتی بدا بۆ هەڵکیشانی، بەڵام ئەو (یا)یە حقیقەتی ندای پیٚ مقصود نیە! ئەگەر مقصود بێت منادای بۆ مقدر ئەکریٚ. ئەی قافلە باشی ئەی یارانی سێرو سفَر! ﴿هَذَا غُلَامٌ﴾ أمّا چ غلام! کافیە بلێی (یوسف)! ﴿وَأَسَرُّوهُ بِضَاعَةً﴾ أهلی قافلە لە بینی خۆیان (یوسف)یان دانا بە کوتاڵ، وەك کوتاڵ بفرۆشن ئەمەشیان لە (یوسف) پەنهان کرد. ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ ظاهر ومَنْوِیّاتیان لە حەق (یوسف)ی، یاخود مُطْلَقاً! قافلە بەڕیٚ بوون چوونە مصر ﴿وَشَرَوْهُ﴾ (یوسف)یان فرۆشت لە مصر ﴿بِثَمَنٍ بَخْسٍ﴾ قیمەتیٚ کەم. ﴿دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ﴾ ئا! شەش حەوتیٚ، هەشت نۆی، عددیٚ بە سوکی بژمێردریٚ، تعینی مقداری معلوم نیە! ﴿وَكَانُوا﴾ أهلی قافلە، ﴿فِيهِ﴾ لە حەق (یوسف)ی ﴿مِنَ الزَّاهِدِينَ﴾ بیٚ فێڵ بوون

لەگەڵی، ئەیانزانی کەڵکی وان ناگرێ، بۆ کاروان کردن دەست نادا، وەحُسْن وجَمالي جالبي فتنەیە لە طرف خانمان. لە قرآن إشعار نیە برایانی بە قافڵەیان فرۆشتبێ، پاشدان ئەوان لە مصرێ فرۆشتبیان! لە تقدیرێ بووبێ (سیّد رشید) ئەڵێ: (ئەوە ادماجە، وە لە دقایقی ایجازە) أنّە بۆ کورتی عیبارەت دوو بیع وشرای تێك ناوە! بەڵام وەك عرض کرا، لە قرآن فهم ناکرێ، ئەگەر روایەت صحیح بێت بابڕوا بە (سَفَرِي تَکوین=توراة) قسەم لێ نیە! أمّا روایات وحکایات مبالغە ئەکەن لە قیمەتی (یوسف) کە لە مصر فرۆشرا. ﴿وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْ مِصْرَ﴾ کێ بووە؟ رئیسي شُرطەی گوندەر هاتوو یعنی (خەسی) بووە؟ ئەدی چۆن دەڵێ ﴿لِامْرَأَتِهِ﴾ پیاوی (خەسی) ژنی بۆ چیە؟ ژن ژنێکی هکذایی بووبێ چۆن وا راضي ئەبێ؟ لە تفسیری (رشید)ی ئەزاندرێ کە نقّادانی مَهَرە توجیهیان بۆ کردیە، أمّا توجیهێ بێ فَرّ بێ قووەت! ئەوزاتە وەزیرو عزیزی مصر بووە!. ئەوزاتە ﷺ لە مصر (یوسف)ی کڕیبوو بە خێزانی خۆی ووت ﴿أَكْرِمِي مَثْوَاهُ﴾ حورمەتی مقامی بگرە، مَقامی مادّی ومَعنَوی، لات گەورە بێت، نەوەك عَبْدان وخزمەتکاران ﴿عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا﴾ خصوصی بۆ شئونی ماڵ، یاعمومی بۆ خزمەتی دەوڵەت ومیلەت.

لە مخائلی (یوسف)ی دەرکی کرد کە زاتێ گەورەی لێدێتەوە. ﴿أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا﴾ وادەرئەکەوێ ولدیان نەبوە نەنێر نەمێ. نازانم بۆیە ئەڵێن (خەسی) بووە! یابۆیە ئەڵێن شەیتان خۆی ئەدا بەر لە وەقتی معاشرە! یالەبەر حورمەتی (یوسف)ی کە آخری بوویتە خێزانی، بڵێم چی؟؟!

﴿وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ﴾ لەبەرچاوی قافڵەچیانی خست، لای عزیز عزیزی کرد ئەو مکان ومکانەتەی بۆ رێك وپێك کرد. ئەو تمکینە هەم لەبەر خۆی ﴿وَلِنُعَلِّمَهُ مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ﴾ وقایع. ئەگەر لە ماڵی وەزیری گەورە نەبا، تدبیری ملکی بۆ مُیَسَّرْ نەدەبوو. لەلای باوکی با مُحَبَّتي باوکی ئەیکردە عَطَلە وبێ عمل، لەلای کاروان چیان با بالکُلّي ضایع دەبوو، مَوهوب

مُكتَسَبي ڕێك نەدەكەوت. سبحان الله حَتّا لە علمایانی ئێمەش ئەوی تماسی لەگەڵ سیاسەتی ڕاست وإدارەی دەوڵەت بوبێ گەلێ فەرقی هەیە لەگەڵ ئەوانی دوور بوین خصوص گۆشە نوشینی لادێیان. كەسێ تأویلی واقعی بەخەبەری نەزانێن تعبیری حوادثی خەونیش نازانێ.

(موسی) ئەگەر لە ماڵی (فرعون)ی بەخێو نەكرابا، نەدەبوو ئەو مەردە جبّارە، قويُّ الجَنان، شَديدُ القُوى! ﴿وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ﴾ ئیش وكاری خۆی ئەزانێ، چۆن ئەبێ، چۆن ئەكرێ. بەڵێ أمری ئەو (كُنْ فَيَكونَ)ە أما كاری بە تدبیرو تیسیری أسبابە. وەأمری (یوسف)یش أمرێكە، كارێكە لە كارانی ئەو. تەماشاكەن (یوسف) لەناو بیرو چاڵ هێنایە سەر كرسی إدارەی مصر. (ناپلیون) چ بوو؟ بووە چی؟ چۆن بووێ ؟ تەماشای تأریخی بكەن إنسان دەهشەت ئەگرێ! وە هەروەها (مصطفی كمال أتاتورك) و (رضا شاهی پهلوی).

﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ گەلێ لەوانە هەر إنكاری خوا ئەكەن وەزۆر كەس لە أهلی إیمان أبداً تەماشای أسباب ناكا. بعضێ أسباب ومسببات لێك دوور ئەبینن مناسبەی نازانن ئەڵێن إستیعقابە! ئەم لە دوای ئەو بووە و بەس! لام وایە ئەوانیش بەبەر ئەو مضمونە ئەكەون. لە گەلێ جێ (سیِّد رشید) ئەفەرموێ: (سنُّتي خوای وا جاری بووە رَدّی مُسَبَّبآت بە أسباب بدات. ظاهری (سُنَّةِ الله) لە عامَّةُ الله (أشاعِران) لائەدا. بەلاّم لای من لادانێ بێ هودەیە، زێرا ئەو أسبابە ئەگەر حقیقەً أسبابن، ئەبێ مسببات بەوان ربط بدرێ، بالمجبوريّە! فَاِذا معنای ئەمە ( سُنَّة الله)ي یە هەروەكو (عادَةُ الله)ی یە! ئەگەر أسباب نین هەروا جەنابی حەق كردوونی بە أسباب و عللی ظاهری، دیارە خَلقی مُسَّبَبآت دوای ئەو أسبابە ظاهریە (حَسب العادة والسُّنة)! كەوابێ سُنَّة الله (رَشید) عەینی ( عادە الله)ی (أشاعرە)یە. وَمَعَ هذا زۆر طعنی ناشیرینیان لێ ئەدا تۆڵەی (حَنابیلَ)ەو (شێخی إبن تَيْمِيّة) ئەكاتەوە. خۆزیا

ئەو مەیلەكەچە لای مەلایان نەمابا. ئەوی مەلای ڕاستیبا، مەلای موسوڵمانان با، ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ﴾ (یوسف) لە عذابی برایان و هاتو هۆی كاروانیان قورتاربوو، عَزیز و مُحتَرم ومُكوَّم لە ماڵی عزیزی مصر بە خۆشی و لەزەت و بێ تَعبْ گوزەرانی ئەكرد. لەو حاڵە كە گەیشتە قووەتی خۆی بوو وە ئەو نەو جەوانە، لەم حاڵە بێ دەردو بەلایە ئەبێ چ قووەتێ بێ؟ لێی ئەوەشایەوە وەك شاعر ئەڵێ:

(إنَّ الشَّبابَ وَالْفراغَ وَالجِدَّة

مَفْسَدَةٌ لِلمرءِ أيُّ مَفْسَدَة) !

ئەوەی هەواو هەوەسی بێنێ، بێ پەروا بیكات! زەمانی قووەتی إنسان لە چەندی تا چەندیە، گفتوگۆ یان لێ كردیە. نَظَر بە حاڵی مَعكوسْ جەنابی حەق ئەفەرموێ ﴿آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ چ حكمێ؟ چ علمێ؟ حُكم و علمێ كە ضبطی خۆی پێ بكا لە مقامی كە أنْدَري شیوخ خۆیان پێ مَنع ئەكرێ. كَمالي نَفس وَضعي هەر شتە لە موقعی زانینی (مالَهُ وما عَلَيْهِ) وە (إستنباط و إستنتاجی فكری)! حَقيقَةً إنسان خوا قووەتی إنتباهی بداتێ خۆی شت بزانێ دَرْكي مَدارِك بكا خواص وحَقایقی إشیای بۆ كشف ببێ، گەلێ چاكترو بە قووەت ترو فائدە ترە، لە پێو و دەست و خوێندنی زۆر،خوێندنی زۆر مَسأله زانین، نَظَرْ بە قووەی إستنباطْ، هیچە. سەرامەدانی إختراعْ لەو عَصرە تَحصیلیان كەمە، تَتَبُّعاتي خۆیان زۆرە، حَدَثُ و إنتِباهیان زۆر توندە. مەلایانی (لُغَةْ) با هەر خەریك بن بە بەیانی لَفظي (أشُدْ) صیغەی (أشُكّ) تەماشای قاموس و (روح المعانی) (سَیِّدی آلوسی) بكە. علی كل حال مَقْصَدْ لە حُكم و عِلم، رسالەت نیە، سُبْحانَ اللهُ الحال (یوسف) چ ئاگای لە رسالەت نیە، مەلایەكان زۆری بۆ بەتالوكن. ﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ مەیلی خۆیان صرف ئەكەن بۆ چاكە، فطرەتی پاكی خۆیان پیس ناكەن. أهلی صفوەت ئەڵێن تصفیەی نفس تجدیدی ذهنی لە غفلات كافیە بۆ إضافەی حكمەت و علم لە طرف فَیّاضی

مُطْلَق. حَقًّا ئەگەر بیئە، تربیەی سوءْ لێی بگۆڕێ، زەواتی نادر المثال گەلێ زۆر ئەبن. جەنابی حەق بە گوێرەی پاکی، چاکیان دەربارە ئەکا، تەرەقیان پێ ئەدا، کەوابێ حاجەت نیە تفسیری (مُحْسنینَ) (بالصّابرین علی النَّوائب) بکەینەوە وەکی (ضَحّاكْ) کردویەتی. بەندەی حقیر لە یادمە پێش. دەساڵی لەناو منداڵان خۆم ئەگرت بە بَعضێ حرکاتی نا مناسب بە خۆم ئەگوت: من وەکی وانە نیم، کوڕی (حاجی مەلا عبدالله)م، نەتەوەی (مەلا عبدالرحمن جەلیم)، ئەوانە لەمن ناوەشێتەوە. لە دەیە بەو لایەوە گەلێ کارم ترك ئەکرد ئەمگوت: (إنشاء الله کە بوومە مەلا خُطبەم بۆ موسڵمانان خوێندوە، وعظم بۆ دان، ئەو وەقتە ئەبێ چیم پێ بڵێن؟ خۆ لە فکری نەمایە خۆی چی کرد. وە ئێستاش چی ئەڵێ! ئاوا بووین لە اَوَّلي نَشْأة، بەلاّم جَرّي جِوارْ تێکی دا ڕەفیقی سوءْ گەلێ خراپە! تەماشای (خاتَمُ الرُسُل) بکەن کە لە آخِرْ نَفَسي ئەیفەرموو: (الرَّفیقُ الأعلی الرَّفیقُ الأعلی) حُکمي (یوسف) عِلمي ((یوسف)ي)، ئەو حکمە بوو، ئەو عِلمە بوو کە لە وەقتی ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الأَبْوَابَ﴾ بَعضێ روایەت ئەڵێ دەرکەکانی وا پێکەوە دابوو لە ترسی بینینی و فراری (یوسف) کە بە مُعْجزە نەبێ نەکرێتەوە. ﴿وَقَالَتْ﴾ بێ پەردەو حجاب بێ مانع و ڕەقیب﴿هَيْتَ لَكَ﴾ (یوسف)ی وەك کێوی (ئەلبورز) ڕاگرت ثابت القَدَم مُطْمَئِنُّ القَلب ﴿قَالَ﴾ لە جوابیا ﴿مَعَاذَ اللَّهِ﴾ خۆم ئەپارێزم بە خوای ﴿إِنَّهُ﴾ رَبُّ الدّار ﴿رَبِّي﴾ گەورەمە سَیّدمە ﴿أَحْسَنَ مَثْوَايَ﴾ چاکی دامەزراندیمە، بەخێری هێنایم، مکان و مکانەتی بڵند کردیمە،حاشا حاشا، مقابلی ئەو چاکەیە، من دەربارەی وی، ئەو ظُلمە بکەم! تخونی نامووسی بکەوم! وەی وەی لەو بێ مروەتیە، لەو غدرە، لەو ظُلمە! ظُلمێ بێ ئەندازە. ﴿إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ خصوصی ئەو نوعە فُوزیاب نابن، ناگەن بە هیچ. هەزار ئافەرین ئەی کریم إبن الکریم! لەسەر ئەو قووەت و شبابە ئافرەتێ وا حیلە بکا بیخاتە ژێر دەست بە فێڵان بیباتە جێیێ وەا چۆڵ، دەرگەکان پێوە

بدات، ڕێی عوزر و بەهانە ببەستێ، بێ پەردە بە صریحی بێ کینایەت بڵێ فەرموو ئامادەم بۆ تو.﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ﴾ بەو عشق و غرامە﴿وَهَمَّ بِهَا﴾ (یوسف)یش بەو مەیلە لە کۆنگەرەی قووەت و شبابا، مەیلی دا. ﴿لَوْلاَ أَنْ رَأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ خوای ئیجاد، یا ربّی بەخێرهێنان و بەخێوکردنی حاڵی، ئەو برهانە غَرَضْ رِعایەتی حەقی وَلِيُّ النِّعمة و ئەمەك داری بوو. ئەوەیە ئایەتی، عیبرەتێ عظیم بۆنێك سروشتیان، کە لەماڵە گەوران بەخێو ئەکرێن، وەك أولادی خۆیان تەماشایان ئەکەن. بە پەیڕەوی (یوسف)ی صدیق لە بێ نمەکی و بەد ڕەوشتی خۆیان بپارێزن. کانیێ ئاویان لێ خواردەوە بەردی نەهاوێنێ. ئەگەر ئەو برهانە نەبا تَذَكُّرِي نەکردبا، (مَعاذ الله) شتێ خراپ ڕووی ئەدا. ئەگەر حضرەتی (یوسف) مەیلی تەواوی نەبا، خۆگرتنی لەو موقعە هیچ هونەری نەبوو. باز هەزار ئافەرین کەلەو حاڵە بەو حاڵە خۆی گرت دەربارەی (وَلِي النِعمَة) نمەك بە حەرامی نەکرد. ئیتر ئەوەی عرض کرا لە گوێی بگرە! گوێ مەدەنە قصّاصان، ئەو ئایەتەی ئەوان ئەیلێن، نەك زاتێ وەك (یوسف)، بەڵکو فاسقێ بێ چاوو ئابڕو وە زۆر بێ شەرم، پێی مەنع ئەبێ! وەفائدەشی بۆ ئێمە نامێنێ ڕووحی ئایەتەکە ئەبات.

(سیّد رشید) لێرە تفصیلاتێ غەریبی هەیە أما نازانم بڵێم چی! قسەکانی لام خۆش نیە! ئەگەر هی (یوسف)ی بۆ دفع بوبێ، معنای (لَوْلا أنْ رأی بُرْهانَ ربِّهِ) چۆن ئەبێ؟ ﴿كَذَلِكَ﴾ بەو جۆرە بوو ﴿لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ﴾ مُطْلَقاً، یا خیانەت لەگەڵ سیدی، ﴿وَالْفَحْشَاءَ﴾ زینا. مسألە معاذ الله قَبیح ئەندەر قبیح دەبوو، ئەگەر بووبا. ﴿إِنَّهُ﴾ (یوسف) ﴿مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾ بە (فَتحي لامي) بە (کَسري لامي) جەنابی حەق ئەوی إختیار کردبوو فطرەتاً وهکذا لە (تلویثیشي) حفظ کرد. خۆشی مخلص بوو إختیاری جهەتی خوای لەسەر هەموو شتێ داگرتبوو. ممکنە مراد لەو عبادە آبای کرامی بێت (فَهوَ مُخلِص منَ المُخلصین). ئافرەتەکە إصراری کرد (یوسف) زاناندی ڕاوەستان لەو موقعە

مهلەیەکە هەڵات بۆ لای دەرگە، ئەویش بە دوای کەوت ﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ﴾ غاریاندا هەریەکە قوەتی ئەدا خۆی پێش ئەویتر بگاتە دەرگە. رَبَّةُ الدار گەیشتە (یوسف)ی پەنجەی لێ گیرکرد ﴿وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِنْ دُبُرٍ﴾ لەلای پشتەوە. ظاهر وایە لە ڕاکێشانی کراسەکەی دڕا بێت، یاخود ڕاپسکاندبێ. بەڵێ قمیصی (یوسف) بە پەنجەی ئاهینی گورگ نادڕێ و جنجروبنجر نابێت، أمّا بە پەنجەی سیمەنی نازەنینی، بەسەرە نینۆکی وەك هیلالی عید، ئەدڕێت.

﴿وَأَلْفَيَا﴾ یعني (وَجَدا) ﴿سَيِّدَهَا﴾ سَیّدي سَیّدین! گەورەی رَبَّةُ الدار. ﴿لَدَى الْبَابِ﴾ لەکن دەرگەی دەرەوە. دەڵێن ئامۆزایەکی لەگەڵ بووە، لام وایە مقصدیان وایە بیکەن بە شاهد، أمّا پەك ناکەوێ لە شاهد! قرآنیش إشارەی بۆ إبن عم وخزمی خاوەنی ماڵ نیە، کە تووشی سیّدی بوو ﴿قَالَتْ﴾ گوتی. ﴿مَا جَزَاءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوءًا﴾ حتّا قُبلەێك بە خیانەت جزای چیە؟ جزای نیە ﴿إِلَّا أَنْ يُسْجَنَ﴾ حەبس بکرێت. ﴿أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ دارکاری بکرێت مثلاً. خاصَّةً کەسێکی وها چاکەت لەگەڵ کردبێت، تەماشای حیلەی لە عیبارەتدا حیایێ وای نواندووە کە أصلاً تَصَوُّري بێ ئەدەبی لێ نەکرێت، زاتاً مەکری ژنان نایێتە قەڵەم، ﴿قَالَ﴾ حضرەتی (یوسف) گوتی لە رَدّي (وَلَنِعمَ ما قال) ﴿هِيَ رَاوَدَتْنِي عَنْ نَفْسِي﴾ مطالبەی لێ کردم ئەمن بریم لە فعلی سوء لە خیانەت. ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ﴾ پیاوێ خەبەر دار وەك حکّامی ماهر کە لە دلائل وأمارە مُجْرِم دەرئەخەن. ئەگەر منداڵی ناو لانکی با خوا ئەیفەرموو (وَشَهِد صَبّي یا طِفلٌ في المَهد). ﴿مِنْ أَهْلِهَا﴾ إی خاتوون، کوڕی خاڵی یا کوڕی خوشکی بووە. بەڵێ قسمێ ئەڵێن منداڵ بووە، أمّا زۆر قسەێ دوورە، ئەوی مەیلی منداڵانی نەبێ قبوڵی ناکا! إی لە قرآن بە صریحي ثابت بووبێت، بەس حضرەتی (عیسی)یە بە منداڵی (في المهد صَبیاً) قسەی کردیە بۆ خاطری بَراءَتی دایکی کە مُستَلزِمە بۆ براءَتي ساحەی رسالەت، بەڵکو بۆ بَراءَتي رَبُّ الأنام مُرْسِل الرُسُلْ لە إختیاری أولاد الزِنا بۆ رسالەت. بەبێ حضرەتی (عیسی) بە منداڵی قسەی کرد

بۆ بَراءَتي دايكي بۆ بَرائَتي مرسل الرُسُل، ئەمە لەبەر زێدە فضلیەتی نەبوو، تابڵێن: ئەدی خليل الرحمن؟ ئەدی حبیب الله پێغەمبەری آخری زەمان چۆن ئەبێ لەناو لانکدا قسەیان نەکردبێ؟ ئەمە باوابێ! کەچی خاتم الأولیاء (شێخ محی الدین العربی) چۆن قسە نەکا؟ بۆ چی بیکا؟ چی پێ ئەوێ؟ بێ معنا بێ لزوم. چی بکەین ئەوا وایان هەوەس پێدێت.

(إبن الجرير) لە طَرَفَیْن روایەت نقل ئەکا خۆی إختیاری ئەمە ئەکا کەمنداڵ بووبێ لەبەر روایەتێ کەلە (إبن عباس) نقل کراوە، مع أنه باز لەوی نقل کراوە کە ئەو شاهدە پیاو بووە. کەوابێ روایەت لە خەبەر مختلفه. هەرچی بووە (فی الحقیقه) دەلیل وأمارەی نیشان داوە، شاهدە کراسی دڕاوە بوو، شکافە شاهدی ئەدا کە (یوسف) هارب بووە نە طالب! دەلالەتی لەبەر وضوح، شهادەتە! وەك (شێخ رضا) ئەڵێ:

شکافی کە بینی دەرئەیوان کرا

دە نێست گوید بقانیست کرا

(إبن جریر) نقل ئەکا گۆیا ووترابێ (شاهد من أهلها) کراسەکە بێ، أمّا ئەوە دوورە، ڕەنگە ئەوەی ئێمە عرضمان کردن مرادی بێ، نەك لەو عبارەتە ئەو کراسە مقصودە! ئەوەی نەختێ عبارەتی عەرەبی بزانێ ئەو قسە ناکا. دەلیل وأماری وادەرخست ﴿إِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِنْ قُبُلٍ﴾ لە طرفی پێشەوە ﴿فَصَدَقَتْ﴾ أمرأة العَزیز، بانووی حەرەم ڕاست ئەکا. ﴿وَهُوَ﴾ (یوسف). ﴿مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ لە مدافعە. ﴿وَإِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ﴾ لای پشتەوە. ﴿فَكَذَبَتْ﴾ خانم درۆ ئەکا. ﴿وَهُوَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ هەلاّتن وملاقاتیان لەگەڵ سیّدی ما بەینەکی نەبوو، إحتمالی حیلە کای (یوسف)ی هەبێ. حقاً ئەو کلامە لە إنسانێ دانیشمەندو عامر ئەوەشێتەوە. ئەگەر منداڵ با ئەیووت: ((یوسف) ڕاست ئەکا، یاخود خاتوو درۆئەکا). ﴿فَلَمَّا رَأَى﴾ سیّدی محترم عزیزی مصر. ﴿قَمِيصَهُ﴾ إیی (یوسف). ﴿قُدَّ مِنْ دُبُرٍ﴾ لە حەق وحەقیقەت گەیشت. ﴿قَالَ

﴿إِنَّهُ﴾ ئەو کارە ئەو نەیرەنگیە ﴿مِنْ كَيْدِكُنَّ﴾ فروفێڵی ئێوەیە، ایی ژنان، تۆو أمثالی تۆ، بەڵێ خاصّە ئەوانی لە رفاهی عیش دان بۆ ئەو جهەتە فێڵان زۆر ئەزانن، فێڵی گەورە، بەرز ﴿إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾ نایتە بیان. تحریر وتقدیری گەورەیی کیدیان. لە (فاكِهَةُ الخُلفاء) حکایەتێ ئەکا دائر بە مەکری ژنان. خلاصە:( زاتێ أدیب ولبیب خەریك ئەبێ شار بە شار دێ بە دێ ئەگەڕێ مەکری ژنان ئەنوسێتەوە. ڕۆژێ لە ڕۆژان ئێوارە، ڕۆژ لە زەردان لەپەلەکۆیان ڕێی ئەکەوێتە ماڵی کوێخوای، خاوەنی ماڵ لەوێ نابێ، ژنەکەی زۆری چاك بە خێر ئەهێنێ طعامی باشی بۆ دروست ئەکا. پاش نوێژی عیشا (میرزا) کتێبی لە جەلبەندی دینێیەتەدەر تەماشای ئەکا. خانم ئەڵێ: قوربان ئەمە چیە؟ ئەڵێ کتێبێکە لە مەکری ژنان عُمرێکە خەریکم گەلێکم لە مەکریان کۆکردیتەوە. خانم ئەڵێ: کاکە لەوە گەڕێ زل زلەکانی هەڵبژمێردرێ! قەترە لە بەحر ناژمێردرێ؟! ئەڵێ: خێر تا نهایەتی عمرم دەستی لێ هەڵناگرم! ژنەکە سکوت ئەکا، دوای چەند دەقیقە خانم دەست ئەکا بە گرشمەو غەنج ودەلال وقسەی بەنازوو نوزو ناسك ودلڕوبا پەلاران بۆ مەلا، بۆ کاتب، بۆ ئەفەندی ئەهاوێ نَظَرِي جَلبْ ئەکا دڵی ئەڕفێنێ، ئەویش بالمقابلە أشعاری غرامی ئەخوێنێتەوە. نهایەت ئیش لە کنایەت دەرئەچێ ئەکەوێتە بابی صراحەت، بەڵێ ئەمشەو تا سەحەر بە عَیْش ونۆش ومەیل وهەوەس بەسەری ئەبەین! خانم ئەفەندی ئەهێنێتە سەما. لەوەقتەدا طەق یەکێ لە دەرگە ئەدا، ئامان ئەوە کێیە؟ لاشك مێردی ئەو ئافرەتەیە. ئەفەندی مُشَوَّش ئەبێ چیبکەم؟ صندوقێ لەوێ ئەبێ ئەیخاتە ناو صندوقەکە، دەرگەی قفل ئەدا ئەچێ دەرکە لە مێردی ئەکاتەوە دەست لە ملانی ئەبێ، ئامان بۆ وا درەنگ هاتیەوە؟ ئاە ئەگەر ئێستا نەهاتبایەوە عُشرەتێ خۆشم ئەکرد بەکەیف ئەمشەو ڕامئەبوارد! مێردە گوتی لەگەڵ کێ؟ ووتی: لەگەڵ مێوانێکی أدیب ومحبوب ولبیب وشیرین وناسك ونازدار خەریکی دەستە ملان بووین، تۆ

لەدەرکەت دا، ئامان کوو وا ئەبێ؟ ئاگری غضبی هاتە جۆش، چی لێ هات ئەو میوانە خائنە، بێ ئەمەکە، بۆ کوێ چوو؟ ووتی ئەوا لەناو صندوق دایە. صندوقەکەم لەسەر کلیل دایە، کوا کلیل؟ ئەوەتە. ئابدە! ها وەریگرە، مەلا ئەوا ئەلەرزێ دڵەکوتکەی لێ یە لە ترسان وەقتە بەخۆی دا بەمیزێ. پیاوەکە کلیلی لێ وەرئەگرێ، ژنەکە لە هەراو چەپڵە ئەدا، دۆڕاندت دۆڕاندت، خەی خەی دۆڕاندت، نەتگوت لە بیرمە! پیاوە سست بوو کلیلی بەعاردیدا دا ووتی: دەك بەلات لێدا لەخۆت و لە مکرەت! توومەزانە چەڵەمە شکاندیان کردبوو. شتاقیان نەیدۆڕاندبوو. أنّە بەو درۆیە بە نوعێ ڕقی مێردی هێنایە جۆش، هۆش وگۆشی نەما لە خۆی بێ ئاگاو خەبەر بوو گرەوی لە فکر نەما، کلیلی وەرگرت نەیگوت لەبیرمە، ژنەکە بە قاقا پێکەنی، ئەفەندی ناو صندوق کەوتە بحری حیرەت ئەمە چ حیلەێ بوو؟ ئەمە چ مەکرێ بوو؟ مێردەکە جلکی گۆڕی چوو بۆ لای قَدَمْ خانە. خانم میرزای هێنایەدەر ووتی:" ئەی سیّدی سەروەر، ئەو مەکرەش بنووسە لەناو دەفتر" وتی:" تۆبە حاشا، قلم ودەوات ئەشکێنم، کتێبەکە ئەسووتێنم..".

(في الحقيقة) کیدی شیطان نظر بە کیدی ژنان بێ هێزە! ئەگەر نفسی سۆو ژن نەبا، شیطان چی پێ ناکرێ، بۆیە ﷺ مأیوس بوو، دەست بە دامەنی ژنانەوە ئەگرێ. ﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا﴾ لەو ماجرایە باسی مەکە بە مکری مەخەڵەتێ لێی مەترسێ. ﴿وَاسْتَغْفِرِي لِذَنْبِكِ﴾ أيّتها الأَمْرأةُ! ﴿إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ﴾ لێی گەڕێ لە جمعي مُذکر ومؤنث کە من الخاطئين بوو، نەبووە نێر، ناشکری نەبێ ئەئەری بێ غیرەتی وأنوثەت لە هیکلی عزیزی مِصر تَجَسُّم ئەکا، ئێمەش خەریکی تَوْجيهي جَمعي مُذَكّرين!. (سَيّد رَشيد) لە بحری (أبو حيّان) نَقل دەکا: خاکی مصر سستە یعنی قووەتی ذکورەتی تێدا نیە، لەبەر ئەو سستیە، شێر لە خاکی مصر دانابێت، ئەگەر لەلاڕا بیچێتێ، تێیدا نازێت. من ئەڵێم تەماشا (شێرکۆ) مامی (صلاح الدين) لە مصر کەم ژیا چەندی پێ نەچوو

بە ڕەحمەتی خوا چوو، ئەبێ ئەمە لەبەر ئەوە بێت؟ (سیّد رشید)گەرچی (بۆقلمونیُّ الأصله) أمّا زۆر لە مصر دا بووە، غیرەتی ئەو قسەیە قبولّ ناکا ئەڵێ: (خاکی مصر بێشە و غاباتی وای نەبووە شێر تێیدا بژیێ وەنشأت بکا). ئێستا تەماشا کە شێرو فهدو پڵنگ لە حدیقەی حیوانات لە موقعی (جیزە) دەژێن تناسُل ئەکەن. من ئەڵێم: خاکی مصر بۆتۆی لایدە زۆر بە قووەتە زۆر مُنْبِتە، کوردو تورك وعەرەب کە لە لارِا چووینە وێ، چاك هەڵکەوتینە، بوینە رجالێ زۆر عظیم وناودار قیمەت دار. شێری شێران، شێری مەیدان برزو لەبەر ئەو خفاوو سەرگەردان (صلاح الدین الأیوبي) لە نەتەوەی کوردان تیای ژیاوە حیاتی إسلام وإسلامیانی محافظە کردیە. (فی الحقیقە) شێری حدایقی علم (شێخ محمد عبدە)، بەبری غابە وجەنگڵستانی سیاسەت (سعد زەغلول) عەیبی یان لە خاکی مصردا إزالە کرد.

(توراة)ی شریف دائر بە قمیصی (یوسف) چی وای تێدا نیە شایانی ذکر بێ. دیارە ئەو ماجرایە لە شاردا بڵاوبوویتەوە ژنە أکابیرەکان بیستوویانە ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ﴾ (جَمعُ التکسیرة للقلة) یا (اِسم الجَمعه)، هەرچی هەیە! (مُقاتِلْ) ئەڵێ: پێنج بووین، أمّاکێ؟ ژنە وزەراو أعیانی مملەکەت؟ نەخێر! ژنی خبازو ساقی کە هێشتا ناویان لە کوولەکەی تەڕدا نیە، ژنی بوّابی، ژنی سجّانی، ژنی صاحب الدّواب ئەبێ مدیری اِصطبلي وەزارەت پەناهی بووبێ؟ ئەوانە، بڕواناکەم دەربارەی ئەو نوعە سیّدی خۆیان بتوانن هەزەیان بکەن! وە خێزانی عزیزی، بەو نوعە، إهتمام ناداتە قسەی ئەوانە. (کَلْبي) خواخێری بنووسێ ژنی بوّابی إسقاط کردییە. (إبن جریر) چەند بووین، ژنی کێ بووین، باسی ناکا (ڕەحمەتی لێ بێت). وادەرئەکەوێ (سیّدي آلوسي) لە تفسیری کبیری وەرگرتبێ مقصد وفائدە لە ﴿فِي الْمَدِينَةِ﴾ چیە؟ ئەبێ ئەوانە لە شاری مصر موقعیان بووبێت! ژنی خبّازو ساقی لەوانە نین، جێی قسەی بدویّات نیە تا بڵێین قسەی ژنە شارستانیانی لا ناخۆشتر بووە! ئایا بدوویّات چیان دیتیە؟

باوەڕ مەکە! خەیاڵە! بۆ نوکتەی بلاغەتی ووتیان ﴿امْرَأَةُ الْعَزِيزِ﴾ وەزیری أعظم. صەد حەیف وصەد مخابن بۆ ئەو ژنە! جێی بڵندە، بە هۆش وگۆشە، خانم وخاتوونە! ﴿تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَنْ نَفْسِهِ﴾ کوڕێ جوان وجمیل نەرم وناسك. أمّا قەد کەسێ، کچێ، ئەوە کوو دەبێ؟ ئەو ژنە طلبی ئیشێکی وا لە خزمەتکاری خۆی بکات؟ وەیش لەو بێ ئابڕوویەتیە، لەو دنائەتە! ﴿قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا﴾ أنّە مُحبّتی چوویتە ناو غلافی دڵی شەقی کردووە، یابوویتە غلافی ڕێی لێکدانەوەی لێ گرتیە، ئاگای لە خۆی نەماوە. (شَعَفاً) هەرچەند لە حضرەتی (علي) منقولە، إحتیاجی بە تأویل زۆرە. ﴿إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾. ئاشکرایە، لە ڕێی لادایە. ئەو خاتوونانە ئەو قسەیان لە جهەتی کردیە، إجلالي فضیلە، إذلالی رذیلە، نەفرەت لەو نوعە دنائەتە! لە ﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ﴾ دەرئەکەوێ لە ڕووی حیلەبازی ئەو قسەیان کردییە. بەڵێ مەکرو قسەی مەکر کەران ئەزانێ! دیارە طعنەیان لێداوە، بۆ دفعی لوم، (یوسف)یان نیشان ئەدا. بۆیە ﴿أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ﴾ بانگی کردن لە دوای ناردن ضیافەتی بۆ کردن ﴿وَأَعْتَدَتْ﴾ پێش هاتنیان ﴿لَهُنَّ﴾ بۆ ئەو ژنانەی لۆمەیان کردبوو. ﴿مُتَّكَأً﴾ پاڵپشت. أما تفسیری بە طعام خۆی نیە! بەڵێ ﴿وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ سِكِّينًا﴾ دەلالەت ئەکا طعامێ وای بۆ داناون بە کێرد بیبڕن. ظاهر وایە میوە بوبێ وەکو سێو هەرمێ کە بەدەستەوە بگیرێ ویە سیکارد کوز بکرێت، نەك مراد لە (مُتَّكئاً) ئەوەبێ، (أبو عُبَيْدة) (مُعَمَر بن مُثَنى) إمامی لُغة ئەفەرموێ: قەومێ زەعمیان بردیە، موراد لە (مُتكئاً) (أترەجە)، بنا بە فەرمودەی (سید رەشید) (أترەج – کەباتە). (إبن الموثنی) ئەفەرموێ : ئەمە (أَبْطَلُ باطِلٍ في الأرض). (أبو عُبَيْد قاسم بنِ سلام) نقلی کلامی (أبي عُبَيْدة) ئەکات دوایی ئەڵێ: فقهاء بە تأویل زاناترن، بۆیە (إبن جریر) تصویبی فرمایشی (أبو عبید)ی دەکا. خلاصە إیجازی قرآنی وە نزاهتی گەلێ جار ئەبێتە باعثی خلاف وتأویلاتێ دوور، ئەوی ڕووحی مسألەیە قران إعتنا بەو دەکات، مقصد ئارایشی

مجلس ومێـزی طعـام نیـە، خورشـەکە چـیە؟! مقـصد ئەوەیـە لـەو وەقتـەدا ﴿وَقَالَتْ﴾ إمرأة العزیز، پێی ووت ﴿اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ﴾ بەسـەریاندا بـڕۆ دەر. دیـارە لە ژوورەوە بووە. ﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُ﴾ چاویان پێ کەوت ﴿أَكْبَرْنَهُ﴾ إحترامیان گـرت تعظیمیان کرد بە ڕەسمیّ ملووکانە. بعـضیّ بـە مـەلایان تفسیری بـە (حِـضنْ) ئەکەنەوە یعنی حیضیان پێدا هات، مُلَوَّث بێ معنایـە. بـۆ جـوابی (إبـن جریـر) ئەڵێ: (هەیە کە بگەنە هەر سەکتەیێ) دوور تـرو چـروکترە. ﴿وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ لە جیاتی خواردەمەنیەکە کێردیان بـە دەسـتی خۆیانـدا کـرد برینـداریان کـرد. ﴿وَقُلْنَ﴾ کە دیتیان ﴿حَاشَ لِلَّهِ﴾ ئەمـە فَتِـيٌّ وعەبـدو خزمـەتکارو کۆیلـە نیـە. حتّا ﴿مَا هَذَا بَشَرًا﴾ فضل لە خزمەتکاری کەی بشر وائـەبێ؟ ﴿إِنْ هَـذَا إِلاَّ مَلَـكٌ كَرِيمٌ﴾ رَبُّ الجَمال تَمَثّلي کردیە حـەقی ئـەو زاتـە معبودیـە هیکلـی بـۆ بکرێـت، مفادی ئایەت ئەگەیێنیّ ملك زۆر جوان وبەشەوکەت بن. لە جهەتی حسن وجمـالْ ترجیحی مَلَكْ لە سەر بشر، موجبي تَفضيلي مَلَكْ لە سەر إنسان نیە! عجایب لە عقایدو، چ بەمەلایان دەکا؟ مع أنە ئەوانەی مَلَـكْ بـە أربـاب ئـەزانن یابـە بنـاتی خوایان حساب دەکـەن، نَظَـر بـە مَلَـكْ، بـشر بـە هـیچ نـازانن. دەسـتی بڕاویـان زوبانی برین بە کمالی جسارەت ﴿قَالَتْ﴾ إمرأة العزیـز. ﴿فَـذَلِكُنَّ الَّـذِي لُمْتُنَّنِـي فِيهِ﴾ ئەوە بوو کە ئێـوە یەکجار چـاوتان پـێ کـەوت چیتان بەسـەر هـات لـە دەستی؟! هکذا ئێوە واتان بەسەر بێ، من ئەبێ حـاڵم چـۆن بـێ؟ أكثـر لەبـەر چاومە، تا تەماشای ئەکـەم لام جـوانتر دەنوێنـێ دڵـم زیـاتر بـۆی دەچـێ. بـێ شەرم محابە دەڵێم: ﴿وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَنْ نَفْسِهِ﴾ طَلَبم لێ کرد پاڕامەوە لَطائف لـە حیلەم نواند، چەند دوای مەکرم بـۆی دانـاوە، کـەڵکی نـەگرتم، مـەرامی بـەجێ نەهێنام! ﴿فَاسْتَعْصَمَ﴾ خۆی گرت خۆی حفظ کرد، زمامی إرادەی لـە دەسـت خۆی نەدا. قَـسَمْ بـە مُقدَّسـاتی خـوای دەخـوا ﴿وَلَـئِنْ لَـمْ يَفْعَـلْ مَـا آمُـرُهُ﴾ لـە معاشرەی بە ڕاستی بابزانێ ﴿لَيُسْجَنَنَّ﴾ حەپس دەکرێ.

﴿وَلَيَكُونَنَ مِنَ الصَّاغِرِينَ﴾ لە بێ حورمەت وقەدران دەبێ. شارەزای بوو چ عالی هممەته بە تحقیر ترساندی! ﴿قَالَ رَبِّ﴾ ئیلاهی! خالقی! مُدَبِّری! مالك أمری! ﴿السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ﴾ معلومە سجن زۆر ناخۆشە، مَعَ هذا لام خۆشترە. ﴿مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ﴾ طبیعی ئەو دەست بڕاوانەش دەست هەڵناگرن لە هەمو لایێ حیلەكاریم لەگەڵ ئەكەن. ئەمە كلامێ متداولە لە بینی أهلی مصائب ئەڵێ مردنم پێ خۆشترە لەو حاڵە. حاڵەكەیان لا ئەوەندە ناخۆشە، نَظَر بەو، مردن شتێ خۆشە، وەلەخۆشان خۆشترە. دیارە ئەو حاڵەی بوجه من الوجوه، لا خۆش نیە! ئیتر حاجەت بە ماندوو بوون ناكات. ﴿وَإِلاَّ تَصْرِفْ﴾ یاربّي! ﴿عَنِّي﴾ لەمن. ﴿كَيْدَهُنَّ﴾ مەكری ئەو ژنانە لە من لانەدەی. ﴿أَصْبُ إِلَيْهِنَّ﴾ مەیلیان ئەكەم. (صلَی الله عَلَيْك یا (یوسف) یاصدّیق)! ﴿وَأَكُنْ﴾ والعیاذ بك ﴿مِنْ الْجَاهِلِينَ﴾ سفهاء. بنۆڕە ڕاستی ئەو زاتە محترمە (حَسیب ونَسیب ونَبیە ونَبیل وجَلیل وشَریف النَّسَبْ) إنسان لە أوڵەوە خۆی ئەگرێ، كەسێ گوناهی نەكردبێت، لای گەلی ـــ ـه، بە خیاڵ لێی گرژ ئەبێ، خصوص ئەوی بدو یاجێی وەك بدو مثلاً (كوێسنجق) نَظَر بە (بغدا) زۆر شت هەیە كە ئەیبێ تۆڕە ئەبێ، چ بێ مروەتی چ بێ ناموسی، إنسان كوو ئەو جۆرە كارە دەكا؟ ئەوە بهیمیە، حیوانیە! لكن كە وردە وردە ئولفەتی پێ گرت، مەیلی ئەكا، كە چێژای دەمی لێ هەڵناگرێ. وای لێ دێت أحواڵی بداوەتی لا ئەبێتە حماقەت. ئاگات لەخۆ بێ! خۆت بپارێزە لە مواقعي سوء بەلاف وگەزافی صۆفیان مەخەڵەتێ، گوێیان مەدەرێ. مستغرقی جمال وجلال مەحوە لای گشت (أزوَرَقي كَوْن ومَكان نَقْشي وجود) خۆی نیە! كە مەیل هاتە جۆش وخرۆش ئەو هایهویە نامێنێ، بەس قَضای وتَر! ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ﴾ دوعای قبوڵ كرد. ﴿فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ﴾ لێی لادا ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ سرتە دەبیێ، ئاگای لە سرّو علن هەیە! بانەزانم صبرو علم ماهیەتیان چیە، واچاكە إنسانیش بەهۆش وگۆش بێت تێ بگا بَشَرِيَّتْ دەفتەری دوو قسمە، قسمێ سیەڕووز،

ذەوق تاڵ، بێ شت گرژ، دڵ پڕ لە غەم، لێو بێ خەندە، نە لە جهەتی طبیعەت نە لە طرف فاطری جمالی وەحسنی زینەتی شیرینی لە عالەمدا نابینێ، علی الإطلاق تەماشای جهەتی قبحی دەکا (أتعَبَ کُلُّها الحَیاة)، ئەوانەی پێیان دەڵێن متشائم. قسمێ هەن خۆش مەشرەب، دڵ پڕ سرور، بە فرشتە ڕووگەش، لێو بە تَبَسُّم، لە کائنات غیری جهەتی حُسنی نایێتە نَظر، یانایخاتە بەر نَظَر، ئەمانە إلاهیّون ۞ طبیعیّون خۆش ڕادەبوێرن. (نفسی میزنم أسودە وعمرێ بسَرارَم)، قرآنی کریم ئەو ڕێیەی نیشان دەدا. (یوسف)یان هاویشتە چاڵ لەگەڵ ۞ موژدەێ بەیانی کرد بە خریداری وکوێلەیی کەوتە ماڵی (عزیزی مصر) (کذلك مَکنّا) ئەفەرموێ قراری حەپسی ئەدەن ئەیهاوێنە زیندان ئەیکاتە دوعا قبولێ بوون وصرفی کیدی ژنان. (أفرَحَ کُلُّها الحَیاة!) ئەو نوعە پێیان دەڵێن (متفائل)!. من هەرچەند سعی دەکەم ببمە (متفائل)، بەڵام توالی آلام لێم ناگەڕێ، خێرا بۆ لای (تشائم) دەبا لە هەموی ناخۆشتر وەك برینی کول، بە شتێ کەم زۆر متأثر دەبم، وە درەنگ زەوالی دەبێ. نُشستی إسلام وبەد أخلاقی بشریش علاوە زللەتی علم وعلماء علاوەی فوق العلاوە، ئیتر پەنا بەلای خوای کریم لەلەزەتی آخرەت محروم نەبین.

﴿ثُمَّ﴾ پاش ئەو ماجرایە ﴿بَدَا لَهُمْ﴾ بۆیان ئاشکرا بوو وایان باش دیت ﴿مِنْ بَعْدِ مَا رَأَوُا الآيَاتِ﴾ لەسەر براءتي (یوسف). ئەز جوملە أخلاق وتربیەو جرأتی خانم وبێ مبالاتی. ﴿لَيَسْجُنُنَّهُ﴾ (یوسف)ی حەپس کەن. ﴿حَتَّى حِينٍ﴾ بێ تعینی مدّە. زێرا محاکمە نەکرابوو جریمە ثابت نەبوبو، تا بەو گوێرەیە جزای بۆ تعین بکرێ. ئەوەندە بوو تێگەیشتن (یوسف) لەبەر چاوی ژنی عزیزی لانەدرێ بە نوعێ کە نەیگاتێ، ئارام ناگرێ، تا نائلی مرام دەبێ ئابڕوویان دەبا. یاخود حسب الظاهِر بَینَ الناس قەباحەت ڕوو دەکەنە (یوسف)، سَتْري خانمە فەندی بکەن وتاوەقتێ ئەو چیرۆکە دەبڕێتەوە لە فکر دەچێ (یوسف) لە حەپس دابێت. قرار إجرا کرا (یوسف)یان خستە زیندان. ﴿وَدَخَلَ مَعَهُ

السِّجْنَ فَتَيَانِ﴾ دوو لاو دوو غلامی مَلِكْ، یەكی مطبخ چی مؤتەمەنی شاهی لەسەر أطعمە وخواردەمەنی ناوی مبارەكی (بُنا)، لە تفسیری (إبن جریر)(مجْلَثا) بووە. ئەویتر ساقیێ ملوكانە بووە ئاگاداری أشربەی قراری بووە ناوی (بَنو) بووە. لەسەر چی حەپس كران؟ لەسەر قصدی خیانەت دەربارەی حَیاتي مَلَکی! بەدخواهانی پادشاە ڕیشوەتیان دابونێ کە طعام وشرابی بۆ زەهردار بکەن، ساقی نەیکرد، خَبّاز کردی. ساقی لێی ئاشکرا دا. تا نتیجەی تحقیقات هەردوکیان حەپس کران. ﴿قَالَ أَحَدُهُمَا﴾ ساقی، کەچوونە مَحْبَس، یاپاش بینینی بَعْدَ التَّعارُفـ إیجازي قرآنیە. ئەڵبەتە فراصتێکیان لێ دیوە کە خەونی بۆ بگێڕنەوە، وە طلبی تعبیری لێ بکەن. ﴿إِنِّي أَرَانِي﴾ خۆم لە خەودا دیت ﴿أَعْصِرُ خَمْرًا﴾ شەرابم دەگوشی ترێ یەکی داندرابێ بۆ شراب کە وەقتی خۆی هات لەناو تەشتێکدا دەیگوشن ئاوەکەی دەبێ بە شراب، وەإلاّ دەگەڕێتەوە دەبێتە سرکە. ئەو ترێیە بە إعتباری مایؤل إلیە خَمري پێ دەگوترێ. بعضێ دەڵێن لە لغەتی (غَسّان) وە لغەتی (أَذرُعانْ) لە (عَمّان) بە عِنَبْ دەڵێن (خمر) یعني بێ تَجَوُّزْ! حتّا لە قراءتی (ابیە) و (إبن مسعود) (عِنَباً) بووە لە بدل (خَمراً) لَعَلّە تفسیر بووە، گۆڕاوە بە متن. ممکنە لە خەوندا دیبێتی کەشرابی تصفیە کردیە. ﴿وَقَالَ الآخَرُ﴾ طاهی. ﴿إِنِّي أَرَانِي﴾ خۆم دیت لە خەو ﴿أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا﴾ لە مصحفي (إبن مسعود) (ثریداً) بووە. بێ ئەدەبی نەبێ ڕەنگە حەزی لێ بووبێ دائم لە خیاڵی بووبێ یاخود سیّد الطّعامي لایەقی خبّازی ملوکان نەدیوە کە لەسەر سەری دانێ. هەرچی هەیە رضواني خواي لێ بێ. ﴿تَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْهُ﴾ لە نانەکە. (إبن مسعود) قسەی لێ نەکردیە لە چ نوعە طیرێ بووە. هەریەك عرضیان کرد تأویلي خەونیان بۆ لێ بداتەوە. ئیی هەردوکیان بە إجمال دەبێتە ﴿نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِ﴾ خەونەکە پێمان بڵێ تعبیری چیە؟ ﴿إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەو قسە دەلالەت دەکا پاش طولی صحبەت خەونیان عرض کردیە وەتأویلیان لێ

خواستيه ليّ يان مشاهده كرديه صاحبى علميّ نافعه به لُطفه بەحُسنى معاشرەو حُسنى خُلقه، ئەگەر ژنيان داخلى دەعوەت بوبن ڕەنگه به نەوعيّ جوان باسيان كردبيّ لاى مێرديان وممكنه له ماجراى إمرأة العزيزيش خەبەريان بوبێت، عرضيان كرديه به إحسانى خوّت خەبەرمان دەيىّ به تأويلى خەونەكەمان. حضرەتي (يوسف) لەو قسه تفرسّى كرد ئەمانه طالبى علمن حەزبه زانينى أشياء دەكەن فەرموى: ﴿قَالَ لاَ يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ﴾ لەخەو، ياله بەخەبەرى؟ ﴿تُرْزَقَانِهِ﴾ لەوانه بيّ كه له غذاى ئێوه حساب بكريّ. ﴿إِلاَّ نَبأتكُمَا بتَأْويله﴾ ئەگەر مەيلتان ليّ بيّ، به تعبيرى خەونى يا تعبيرى أوصافى. ﴿قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَكُمَا﴾ پێش ئەوەى خەونەكەتان بێته جيّ، ياپێش ئەوەى طعامەكەتان بگاته جيّ، ياخود هيچ طعامێكتان بۆ ناىّ كه بيخۆن، إلاّ ئەمن پێش هاتنى ئەم خواردەمەنيه تعبيرى ئەو خەونانەى كه لێتان پرسيار كردبوو دەدەمەوە ! ئەو تأجيله لەبەر نزانين نيه، بەڵكو بۆيیه لەو بەينەدا ئێوه هەنديّ علم وحەقيقەت وەرگرن وإدّعاى زانين له نجوم گەرى وتظاهرەوه نيه ! بەڵكه ﴿ذَلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّي﴾ فطرةً قوەتى إنتباهى پيّ داوم، مناسبه له بينى أشياء دەزانم وكَذا له بينى خەون و خاوەنى خەون. مفسّرين لێرە دەڵێن له علمى رۆيادان دوايّ هەر يەك بەنەوعيّ تعبير له فەرموودەى (يوسف) دەدا. (إبن جرير) كلاميّ له (إبن جريح) نقل دەكا حقيقةً به أضغاثُ أحلام دەچيّ ! لام وايه (يوسف) ناتوانيّ تأويلى بكا، گەرچى (سيّد رشيد) نَوعاً ما به چاوى ڕەضا تەماشاى دەكا. دركي أشياء به غرائزو مواهبي فِطري كەتێك نەدريّ، چەند بيّ غەشه بيّ تَرَدُّدو دەغدەغەيه.

﴿إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ﴾ دين وئاينيّ ﴿قَوْمٍ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ مُنْكِر يامُشرِك، بيّ ناموس وغيرەت وبيّ مبدأ. ﴿وَهُمْ بِالآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ﴾ كه إيمان به خوا نەبيّ، إيمان به آخرەت نابيّ، ئەگەر إيمان به خوا بيّ، وه بەآخرەت نەبيّ، يابەتەواوى نەبيّ، هەرگيز ئەو ملەتانه چاك نابن. تزكيەى نفس ناكەن. يازۆر

دَني دەبن، وەك عبادی أبلیس وسەگ وپشیلە، یا زۆر تێ دەپەڕن سەر بۆ کەس داناخەن. حقّاً إیمان بالله والیَوم الآخر مَداري صَلاحی ظاهر وباطنە. ئەوی إیمانی بەخوا نەبێ، إیمانی بە خۆشی نیە، مُتَحَیّرە ﴿وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي﴾ رُسُلي کرام أنبیای عِظام ﴿إبراهیم﴾ جَدّی أعلی. ﴿وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ﴾ باپیروبابم. ﴿مَا كَانَ﴾ محالّە ﴿لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللَّهِ﴾ فضل لە إنکاری ﴿مِنْ شَيْءٍ﴾ چی بە خیالّ وتصوّر دابێ لە أحقر تا أعظم. نە شمس، نە قمر، نە جِنْ، نە مَلَك، نە بَشَر، نە رَئیس! ئەوەی لە دائرەی إمکان دابێ، محالّە بە شریکي واحدی حقیقیی واجب الوجودی بزانین.

﴿ذَلِكَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ عَلَيْنَا﴾ بە هدایەتی فِطری بە فکر ونَظَر لە ملکوتي سماوات وأرضي إیمانمان بە وحدانیەتی کبریائی هێناوە. ڕوومان لەوە! فطرەتمان نەگۆڕاوە. ئەوەش زێدە إحسان وإنعامە، خوا لە حەقی ئێمەی کردیە. ﴿وَعَلَى النَّاسِ﴾ ئەوانە لەوپایە بەرەژێر ترن رسالەت بۆ بشر پێویستە، بێ رسولی إلاهی، هدایەتی ڕاستی ممکن نیە. دواکەوتنیان مایەی سعادەتە. زێرا ئەوی چاك بێ أمرمان پێ دەکەن، ئەوی خراپ بێ نهیمان لێ دەکەن چونکی بێ مەیل وبێ محابێتن، خراپە بە چاکە، لێ یان ناگۆڕێ. دین بۆ إنسان وەکو ئەوان دەیلّێن، بووین بالطبع زۆر لازمە. ڕووحی حیاتی إجتماعیە، خاصّە بێ ڕوو و ڕیاو مەیلی ملّی. دینی إسلام ئەوەی لە ڕسول وکتابی وەرگیرایە خالص وبێ غەل وغەشە. لە جبالی کوردستان صەد هەزار باغ هەبوو، خۆیان وصاحێبیان لە سایەی دین دەژیان. دین سست بوو أثري إیمان بێ هێز بوو، هەمو باغەکان بەرەللّا بوون، گەلێ صاحێبیان کوژران. ئەوەی دەلّێ عەقلّ مغنیە لە بعثەتی رسل یان زۆر بێ عەقلّە یان زۆر مُفسدە، کوا ئەو عەقلّە عوام الناس عقالْ بکا بیان بەستێتەوە؟! (في الحقیقة) دین نعمەتێکی گەورەیە ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ بەلّکو ئەوەی مەیلی شقاوەت وفسادی بێ، یاسیاسیێ مائلی إستلا بێ، دین بە بەلاّ و مصیبەت ونقمەت دەزانێ. دین سدّی

هەواو هەوەس دەكا. دەڵێن مانعي حُرِّيّتە! بەڵێ روأساي أديان دينيان تێك دا، جهەتي وەحدەتيان كردە مايەي تفرقە، رێي علومي طبيعيان بەست، دەرگەي كرامەتيان كردەوە، هێزيان لە أمّة بڕي، دينيان كردە مانعي تەرەقي علم، على الأكثر رابطەيان لە بيني كائنات دا پساند، (مليّون) بوونە دوشمني ديني وخووني. هەرچەند بەناو مُوَحِّدن، أمّا إلاهيان لە حَدّ وعَدْ بەدەرە. ﴿يَاصَاحِبِي السِّجْنِ﴾ ئەي دوو برادەر و رەفيقي حەپس وحەپسخانەم. قابلە پێشدان، نەشي ديتبن، ولو ژنيان پارەپارە بووبێ، ﴿ءَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ﴾ زۆر و بۆروو بێ دەسەلات لە أعمال. ئەوە إلاهي حَربە، ئەوە إلاهي سلمە، ئەوە ربّي أحزانە، ئەمە خوداوەندي أفراحە، ئەوە ربّي صعودە ئەمە خواي نحوسە! ﴿خَيْرٌ﴾ بۆ سعادەتي بشري. إتفاقيان؟ يەك فكريان؟ يەك غايەيان؟ حُرِّيّتي ضَميريان؟ إستقلاليەتي فكريان؟ عزّەتي نفسيان؟

﴿أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ خواي تەنهان واجب الوجود، واحد لە زات وصفات، غالب وقدير تامّ القدره. ديارە شرك أساسي لە تَوَهُّمي ضِعفە، يعني زاتێ واحد، ناتوانێ إدارەي ئەو عالمە مختلفە بكا. قومێ مبدأي فيضيان يەك نەبێ، تعبيري خەونيش نازانن! لەبەر آلهەي متفرقە، رأين فكريان جمع نابێ. لە بيني مناسبێتي مختلفە، بە مقصد ناگەن. ﴿مَا تَعْبُدُونَ﴾ ئێوەو قومتان. ﴿مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا﴾ ناوێكي بێ ناوك. ﴿أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ﴾ يعني آلهەي قديمە وآلهەي جديدە. خەيالێكتان كرديە، صورەتێكتان بۆ كێشايە، هەڵكەنديە، ناوێكتان لێ نايە، حەيوانەكتان مەيل كرديە، پەرستيتانە، بە إلاه يابە ممثلي إلهتان زانيوە. وەك ماسي، پشيلە، سەگ، وكەر! گەورە گەورەي ئێستا لە مؤمن وغيرە مؤمن نازانم بۆ مەيموون ناپەرستن؟ مع أنە دەڵێن أصلمان (قرد) بووە!!؟ ئێمەش إلاهمان زۆرن! بەلام بالعكس بەناو إلاه نين، أمّا بە مَعْنا فَوْق إلإلهن.

خوایە خۆت دەزانی نسبەت بە مقامی ألوهیەت ومزایاو خواصی ألوهیەتن جبریل وقطبي فَردو عیساو ثورو هەیکەلی بەردی، چ فەرقیان نیە. ﴿مَا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ﴾ نە شرعی نە طبیعی، بەڵکو هەردوو موافقن لەسەر نەبوونی ئەو آلهانەو بێ قیمەتیان، نەك إلاە، حتّا مَلَكْ وجِن لە عالەمی تکوین دلیلی وجودیان نیە! وامەزانە ئەگەر رەسول دائر بەوانە شتێ بلّێ، قبولّە! حاشا تاوەکو دیانان بگەڕێن بە درۆ لە کلامی نبوّەت شتێ بدۆزینەوە (بإسم الأبِ والإبن وروح القدس). کەسێ وا بلّێ لە نَظَر عقلَ مُتَّهَمَه! أمّا چی بکەین کە عەقلێ بە فساد چوو بە ترس زەبوون کرا، بێ هێز دەبێ، چی پێ ناکرێ! ئایا ئەو إلاهانە قووەتێ، إتّحادێ، سلطانێ، علمی، برهانی، دینی، شرعی، قانونی، نِظامی، رابطەیێ، دەدەن بە ئێوە؟ لە قووەتی خلق وإیجاد و تَوالد و تَطَوّر چی زیاد دەدەن؟ کوویان هەوەس لێ بێ واتا تَصَرُّف تێ دەکەن. ﴿إِنْ الْحُكْمُ﴾ قووەتی قضائی وتشریعی وإیجادی، ﴿إِلاَّ لِلَّهِ﴾ هەر بۆ ئەوە کەسی تر حاکم نیە. عەقلّیش وامشوّەش کراوە لەلەندەرە ئاگای لە خۆی ناماوە، چیە؟!

یارو یاوەری خراپی بێ ناموسی، داخلی وخارجی، زۆرو، بەدەستگیری روسول نەبێ قوتار نابێ. (حقیقە) رەسولی حَقیقي مُخلِص، عقلّە! ﴿أَمَرَ﴾ بەهەر أمرێ دەیلّێن ﴿أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ تەماشای خۆ بکەن خۆتان وا خلق کراون، بە خوایێ وا، ئارایش دراون، کە بۆ پرستکاری، غَیري واجب الوجود، کەس لە فوقی ئێوە نیە. بنۆڕن (إبلیس) هیچ، (فرعون) ئەگەر قووەتی خوای نەبێ، چیە؟ ﴿ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ راست، بێ خوارەکەو پێچەکە. ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ سوادی أعظم لێ یان گۆڕاوە، گۆڕدراوە، ئەگەر دەعوەتیان بکەی بۆ توحیدی ڕاستی، بە کافرت دەزانن!

کفرو شرك وڕەنگێ وای گرتیە لباسێ وای لەبەر کراوە، ممکن نیە إزالە بکرێ، مەگەر یەزدان چارەی بکا! خصوصاً ئەرجومەندەکانی نافذ الکلمة

مشهوري بَيْن الأنام به صدق وصَفا وایان عقلَ سَلب كرد جاریّ تر نایێتەوه ناو دلّ ودەماغی سوادی أعْظَم، تێشیان ناگەن وەكی مێردەزمووكه بۆ كێندەریان دەبەن، بێ خەبەرن. ﴿يَاصَاحِبَيِ السِّجْنِ﴾ ئەی برادەرانی زیندان. پاش ئەو وەعظ ودەعوەتی بلیغه هاته بیان بۆ تعبیری خەونەكەیان بانگی كردن به عنوانی سابق. ﴿أَمَّا أَحَدُكُمَا﴾ دیاره مُخاطَبْ ساقی بووه. ﴿فَيَسْقِي رَبَّهُ﴾ خاوەنی خۆی. ﴿خَمْرًا﴾ وەك جاران دەچێتەوه سەر وَظیفەی خۆی. ﴿وَأَمَّا الآخَرُ﴾ خبّاز. ﴿فَيُصْلَبُ﴾ لەدار دەدرێ. ﴿فَتَأْكُلُ الطَّيْرُ﴾ طیری گۆشت خۆر. ﴿مِنْ رَأْسِهِ﴾ له گۆشتی سەری ﴿قُضِيَ الأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ﴾ جێ بەجێ بوو إنفاذ كرا چاره نەما. تعبیریش نوعه فتوائیكه!

﴿وَقَالَ﴾ (یوسف) (علیه السلام) ﴿لِلَّذِي ظَنَّ﴾ ئەو كەسه كه ﴿أَنَّهُ نَاجٍ مِنْهُمَا﴾ له صاحبی السجن به تەواوی بڕوای نەكردبوو، لەسەر ئەو حالّەی كه له (یوسف)ی دیتبوو، ظَنّیكي پەیدابوو بوو به نجاتی! أكثر (ضمیر) دەدەنه (یوسف)، بۆیه تفسیري (ظَنًّ) به (عَلِمَ) كراوەتەوه. (سیّد رشید) به نوعێ تر توجیهی دەكا! ﴿اذْكُرْنِي عِنْدَ رَبِّكَ﴾ مُحقَّق بزانه نجاتت دەبێ. بەگومانی مەزانه! كه چوویەوه لای (مَلك) شرابت دایێ ناوی من بێنه لای (مَلِك) خۆت! بەیانی معذوریەتم بكه. كه چووه دەر له حەپس خانه گەیشتەوه سەر وەظیفەی خۆی، لەبەر خۆشی خۆشیان ئاگای له (یوسف) نەما. ﴿فَأَنسَاهُ الشَّيْطَانُ﴾ لەبەر طَرَبْ وعَیْش وخۆشی ساقی گەری، مَجلس أُنسی مَلَكی، شیطان له فكری بردەوه، ﴿ذِكْرَ رَبِّهِ﴾ ناوی (یوسف) لای سیّدی خۆی بێنێ. دیسان لێره بعضێ (ضمیر) بۆ (یوسف) دەبەنەوه، پلاریان به (یوسف) دا داوه. پاش ئەو دەعوەته بلیغه كوو خەیالّ دەكرێ (یوسف) به تصویری شیطانی، خوای خۆی له فكر بكا؟ شیطان لەناو زیندان (یوسف) بەچی فریفته دەكا خوای له یاد دەباتەوه؟! سُبحان الله له تَفَكّري گەلێ كەس! ئەو بێ چارەیه له هەموو بەلایێ نجاتی بوو، له چەنەبازی بعضێ ناقلان قورتار

نەبوو! تووڕەگەیان پڕ لە حدیثی موقوف ومُرْسَل وبێ سَنَد وثَبْت! رەحمەت لە (سیّد رشید) قەلب وقوللابی بەدەرخستون، کتێبی نقدی باشی لابووەوە، مع الاسف من نیمە. جا پاش تەواو بوونی ئەو جزئە، من بۆ نقدی حدیث ئەزیەت دەخۆم! ئەو بە رەحمەتی خوا شادبوو کەسی ترمان نەبیست لە مصر بەو نَهجە إکمالی تفسیر بکا. حەیف صەد حەیف. ﴿فَلَبِثَ﴾ کەس نەبوو بێ بە غەمخواری ماوە لە حپس خانە ﴿بِضْعَ سِنِينَ﴾ چەند ساڵێك.

ماوە تَوَرُّطي نَقّالان، بعضيّ زۆر بێ رەحمی دەکەن بە دوو بضعان تفسیری دەکەن یەکی حەوت حەوت، حەوتێ پێش (أُذكرني عِنْدَ رَبِّكَ)! حەوتێ جزای إعتمادی لەسەر غیری خوا. پاش ئەو قسە یەکێ تر دەڵێ: پێنج لە پێشدان، حەوت پاشدان، جمعاً دوازدە! دەبێ دوو فتایەکانیش مُدَّەی پێشوو لە حەپسا مابنەوە. ئەمانە دوورن، مشهور حەوت ساڵە، لکن تعینی مدّە بێ لزومە، یەکی معنای آیەتی لەسەر نەکەوتووە. پاش ئەمە کە (یوسف) هاویشترا حەپس، باسی عزیزو خاتوونی لە قرآندا طَيْ کرا. مَقْصَد عِبْرەت وآیاتي (یوسف) وبرایانیەتی. ئەگەر تەماشای شُعَبي قِصّة بکەین، وازوو نابڕێتەوەو دەبێ بە حکایەتێ بێ عبرەت لە غایەی بحث دەردەچێ. ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ﴾ پادشاهی مصر، ناوی چیە؟ نایزانم! چی پێ دەوێ؟ ریّانە عَطشانە؟! جَمْعيّ لە برادەرانی علماء دەفەرموون: دروست نیە بە کافر بلێی (مَلِك). بەلێ دەتوانن لە پەنای کۆلەگەی مزگەوت ئەو تەرزە قسانە بکەن. ئەمڕۆ لەباتی مَلِك، پێیان دەلێن (امپراطور)! ئەگەر ئەوان بە یەکێکی ئێمە بلێن مَلِك، سجدەی شُکر بۆ خوا دەبەین! جهالەتی ئەو خنگە مەلایانە بوو ئێمەی خستە رەزالەت. تۆ بلێی ونەلێی، ملکە، قوراله، امپراطورە، رەئیس جمهورە. ﴿إِنِّي أَرَى﴾ لەخەو دیم. ﴿سَبْعَ بَقَرَاتٍ﴾ رەشە ولاغ. لە کوردی بۆ گاو مانگا إستعمال دەکرێ، ولو زەردو سوورو بەلەکیش بێ. ﴿سِمَانٍ﴾ قەلەو. ﴿يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ﴾ حەوتی دی لاوزی چلمنی رەق وتەق دەیانخواردن، لاوازەکان قەلەوەکانیان لووش

دەدا. ﴿وَسَبْعَ سُنْبُلَاتٍ﴾ حەوت گوڵە دەغڵ، (گەنم-جۆ). ﴿خُضْرٍ﴾ سەبز. ﴿وَأُخَرَ﴾ حەوتی دی ﴿يَابِسَاتٍ﴾ هیشك، پێ گەیشتی. دەڵێن بە دەوری سنبلەکاندا پێچرابوون، زەردوسیسیان کردبوون، نازانم! لە قرآن إشعاری پێ نیە! ئەگەر وابا، ممکن بوو بڵێ: (الْتَفَتْ عَلَيْهِنَّ أُخَرُ يابسات). جا وەرە لەو مقامە تەماشای نَحْویان بکە ئەگەر ئەو تفننە لە عیبارەتی مصریان دابوویا، حضرەتی (یوسف)ی لەبەر إشتغال بە حلّی ترکیبی عبارەت، ئاگای لە تعبیر نەدەما. ﴿يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ﴾ ئەوانەی حاضری مجلسی مَلِك بن، طبیعی أشراف و وزرا و أدبا دەبن. ﴿أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ﴾ حُكمی چیە؟ چی بڵێن؟ ئەگەر خراپ بێ چارەی نجات نیە! بۆیە (یوسف) پێشدان فەرمووی (قُضِيَ الأَمْرُ) چارە نیە. ﴿إِنْ كُنْتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ﴾ ئەگەر مُعَبِّرن دەزانن گەلێ جار خەوتنان بۆ گێڕدراوەتەوە خەیاڵتان تَوَسُّعي کردیە فکرتان پەیدا بووە، أتّە نوعە ملکەیەکیان بۆ حاصڵ بوو بێ. ﴿قَالُوا﴾ مَلَأ لە جوابی مَلِكْ. ﴿أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ﴾ ئەو خەونە خەونی تێکەڵاو پێکەڵاوە ئاڵۆزە لێك ناکرێتەوە ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ الْأَحْلَامِ﴾ عَلَى الإطلاق، یا ئەو نوعە. ﴿بِعَالِمِينَ﴾ دەوڵەت نیە، دەبێ وابێ؟! ﴿وَقَالَ الَّذِي نَجَا مِنْهُمَا﴾ لە صاحِبَيِّ السِّجن. ﴿وَادَّكَرَ﴾ بەیادی کەوتەوە بە فکری هاتەوە. ﴿بَعْدَ أُمَّةٍ﴾ پاش زەمانێ دوور ودرێژ، (امّة) بە معنا (نِعْمَة) لێرە ناگونجێ، (أَمَه) بە معنا (نسیان) باشە، أمّا (لِدّكَرَ) إیجاب دەکا نوکتەیێ بۆ ذکری (أَمَة) بدۆزینەوە. لام وایە بە (أُمَّة) راضی ببین باشە، مَعَ أنّە قراءَتی جَمهورە، قابلی إنکار نیە. ﴿أَنَا أُنَبِّئُكُمْ بِتَأْوِيلِهِ﴾ لەمەولا راستی وەردەگرم خەبەرتان دەدەمێ، لازم ناکا بڵێ خۆم تعبیری لێ دەدەمەوە، تاکو نەبێتە درۆ بخوێنینەوە (آتیکم) بەڵێ (رَسمُ الخَط) هەڵ ئەگرێ. ﴿فَأَرْسِلُونِ﴾ بمنێرن بۆ لای زیندان بۆ خزمەت زاتێ لە زیندانی عَظَمەت وشاهی دایە! شاهم أمر کە روخصەت بدە بچم. روخصەت درا چوو عرضی کرد ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ﴾ زۆر ڕاست و ڕاستگۆ قَوْل وفِعل موفِقْ. أما بعضە معنایەکی (صدّیق) کە

صۆفیە فەرموویانە (ئەو شخصە لە خەویدا نەیدیتوە وە نەیزانیوە). باوڕ ناکەم (یوسف)ی صدّیقیش زانبێتی! ﴿أَفْتِنَا﴾ لام وایە طَلَبي تَعبیری رؤْیا لەگەڵا خواستنی تدبیرو احضارات، هاتنی اطلاقی استفتای دەکرێتە سەر. ﴿فِي سَبْعِ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنْبُلَاتٍ خُضْرٍ﴾ باسی پێچرانەوەیان بە ﴿وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ﴾ نیە! تعبیرم پێ بڵێ ﴿لَعَلِّي أَرْجِعُ إِلَى النَّاسِ﴾ (سیّد رَشید) دەڵێ:(أولی الامر وأهلي حلّ و عِقد). من دەڵێم ئەو ساقیە، قاصدە! بۆ (یوسف)ی إظهار نەکردیە کە ئەو خەونە، خەونی مَلِکە، لە طَرَف مَلِكْ روخصەت دراوە، هاتووە طلبی تعبیری رؤْیای مَلَکی، بەناوی مَلِكْ بکا! وا دەزانم شەرمی کردیە، نەك بە چاویدا بداتەوە کە بۆچی هەتا ئێستا ناوی منت لە لای مَلِكْ نەهێناوە؟! وە زاناندویەتی ئەو خەونە تَعَلقی بە زَراعەت و فَلاحەتی عامّە هەیە. بۆیە دەڵێ: بگەڕێمەوە لای ئەو خەڵکە فتوایان پێ بڵێم!! ﴿لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ علميَ نافع و علمی و چارەسازی. ﴿قَالَ﴾ لە جەوابی إستفتای خەونەکە. ﴿تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ﴾ دەچێنن هەرچی مَتَداوَل بێ حەفت ساڵان. ﴿دَأَبًا﴾ مُتَوالي بِلا فاصلە، ساڵ لە دوای ساڵ خێروبەرەکەت دەبێ دەغڵ و دانەوێڵە بێ ئافات چاك پێ دەگات! (خوایە ئەو ساڵ بۆ ئێمەش وابێ!) ﴿فَمَا حَصَدْتُمْ﴾ ئەوی درووتانەوە گێرەی مەکەن ﴿فَذَرُوهُ فِي سُنْبُلِهِ﴾ حَبَّەکە لەناو گوڵی دا بمێنێ، وا چاکتر دەمێنێ. خصوصی گەنم کەلێ ساڵ لە دەشتی دزەیی بووە خەرمانیان ماوەتەوە قوڕیان دایە لەبەر باران، ساڵی آتی گێرەیان کردیە، وە زۆر باش بووە، مَعَ أَنَّهُ دەغڵیان لەناو چاڵیش زۆر دەمێنێ. رەنگە خاکی مصر وەك خاکی دەشتی هەولێر نەبێ! (حَقیقَةً) أي وولاتی (کۆیە)ش دەغڵی لەناو چاڵ بەبێ عەیبی دەوام ناکا. ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ بە نسبەت ئەوەی دەمێنێتەوە. ﴿مِمَّا تَأْكُلُونَ﴾ مجبوراً ئەوی تصفیە دەکەن بۆ نان و سائری لوازماتی دی. ﴿[illegible]﴾ ئەوي بَیان کرا. ﴿[illegible]﴾ قاتی، مَزروعات خراپ دەبن لەبەر کرم و سنو وکیسەڵە، کلۆ و، پێکبڕەو مشك

و ژەنگ و هەورو گەرما. خەرمان سوتانیش لە وولاتی ئێمە لە هەموی مُصیبەت ترە!

﴿يَأْكُلْنَ﴾ ئەو ساڵە ناخۆش و تەنگ گرژو توندانە دەخۆن ﴿مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ﴾ ئەو زەخیرەی پێشوو کە بۆتان دانابوون. (حَقيقَةً) (يَأْكُلن) لە (تَأْكُلُونَ) چاکترە. ﴿إلاَّ قَليلاً مِمَّا تُحْصِنُونَ﴾ بۆ تۆو ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَلكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ﴾ بارانیان بۆ دەبارێ، (نیل) بە مُنتَظَمي رجعەت دەکا چونکی لەلای سەروچاوی کە بلادی (سودان)ە باران زۆر دەبارێ بۆ أهلی مصر دەبێ بە همداد. ﴿وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾ طبیعي لەو نوعە ساڵانە وەکو حیوانات بێ شیر دەبن، دارو درەختیش کەم بەر دەبن، ئەو بەری بیبێ چاك نابێ، خاصَّةً باغێ فێرە ئاو بێ، بەلکو أغلبی داری هیشك دەبێ. لەو ساڵەدا میوەش باش دەبێ ساقی موژدە! کووپەی خەمرت پڕدەکەی! (یوسف) ی صدیق ما بَعْدي ئەم (ثُمَّ)ی لەچی وەرگرتیە؟ ئایا لەخەونەکە هیچ أشعاری تێدایە لێی إستفادە بکرێ؟ لە وَحي و إخباري بِالْغَيبْ؟ لە عادةُ الله؟ (في الحقيقة) دیتمان گرانی قَحْطيێ هائل قاتی أرزاق چووە دەرەجەیێ نە بیستراو لە سالِفُ الأيّام. ساڵی دوایێ بارانی متوالی بەجێ، دەغڵ و دانەوێرە زۆر عجایب هات، ئەوەی بە گوشری و نەگوشری، زۆر چاك و بە بەرەکەت بوو حَتّا لە مانگی (شُباط) لە خزمەت مرحوم (حەماغای گەورە) بریانی بەرخمان لەگەڵ حاکمی سیاسی بریطانی خوارد، لەو جهەت ساڵێ گەلێ بە فَيّض و ڕێژەوبوو!! وام لە خاطرە نَقل لە شێخی کبیر (إبنُ العربي) ئەمەی لە ناقلی خەون (ساقی) وەرگرتیە. بِناءً عَلَيهِ خەون گێڕەوە دەخلی هەیە لە تعبیردا، ئەمەش دِقّەت وتأمُّلیکی پێ دەوێ. خلاصە شتێکی دیتوە لە ماجرای خەون، ئەو حکمەی لێ إستفادە کردبێ. بِنا لە (تەورات) أولا حەوت گایەکانی لە خەونا دیوە، باز نوسیتیەوە حەوت (سُنْبُلْ)ەکانی چاو پێ کەوتیە، أما تعبیرەکەی لەگەڵ تعبیری قُرآن لە

طَرَفِ (یوسف)ەوە، شتێ ترە! عیبارەتی ترجمەکانیان زۆر بێ تام و پڕ لە حشوو دووروو درێژی بێ فائدەیە.

ئەگەر بە گوێرەی عیبارەتی أصلی بێ حقیقە هەروەکو معنای هیچە، لَفظەکانیش پووچە. دیارە خەونی ڕاست پەکی لەسەر دیانەت نەکەوتیە! أمّا لە (شێخی إبن سینا) وەك لە عهدنامەی دەفەرموێ: کە عهدی کردییە بە خیالّیش درۆ نەکا تاکو خەونی ڕاست بێ، وەدەگیرێ، درۆ تأثیر دەکا، خەون دەگۆڕێ، ڕاستی، بۆ ڕاستی خەونیش باشە. ساقی تعبیری وەرگرت گەڕایەوە بۆلای مَلِك بۆی گێڕایەوە، وە گوتی ئەمە لە طَرَف زاتێ هکذاییە، ئەوە لەبەر ظهوری، بۆ إختصار طَي کراوە!

﴿وَقَالَ الْمَلِكُ﴾ ئەوجا ملك فەرمووی: ﴿ائْتُونِي بِهِ﴾ بۆمی بێنن. ﴿فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ﴾ ئەوەی لە طرف مَلِكْ ناردرابوو بۆ لای (یوسف)ی زیندانی مُعَبِّرْ. ﴿قَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ﴾ تۆ بگەڕێوە لای ملك، من ئێستا نایێم. ﴿فَاسْأَلْهُ﴾ لە طَرَف منەوە. ﴿مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللَّاتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾ تحقیق بکا ئەو ژنانەی دەستی خۆیان پارەپارە کرد حالّ و شأنیان چیبوو؟ بۆ دەستی خۆیان وا بڕی بریندار کرد؟ ﴿إِنَّ رَبِّي﴾ خواي من، یَعني رَبُّ الأنام، نەك رَبّي توو! یاخود سیدی من کە عزیزە ﴿بِكَيْدِهِنَّ﴾ بە فێلّی ئەو ژنانە. ﴿عَلِيمٌ﴾ خەبەرداره أما ملك ئاگای لێ نیە! دەبێ حقیقەتی حالّ بەدەرخات ﴿قَالَ﴾ ملك. خۆی ممکنە إستجوابی کردبن. ﴿مَا خَطْبُكُنَّ﴾ شأني ئێوە چبوو؟ ﴿إِذْ رَاوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَنْ نَفْسِهِ﴾ (یوسف) مقابلی طلب چی کرد؟ ئەو هجومی کردە سەر ئێوە دەستی ئێوەی بریندار کرد؟ ﴿قُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ﴾ (معاذ الله)! ﴿مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِنْ سُوءٍ﴾ أدْنا مەیلێك. لاشَك (یوسف) مَقصَدی ظهوری أمر بووە لە طَرَف خانمی عَزیزی مصر ﴿قَالَتِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ﴾ ئاشکرا بوو لە درۆو دەلەسەو نیرەنگی خاوێن بۆوە، کَفني کذبي فرێدا. ﴿أَنَا رَاوَدتُّهُ عَنْ نَفْسِهِ﴾ ئەو ژنانە هیچ مُراودَیان نیە! وە(یوسف)یش پاکە لە هەمو سیّئە! ﴿وَإِنَّهُ لَمِنْ

الصَّادقِينَ﴾ كە بە مێردی وی گوت: (هِيَ راوَدْتني). ﴿ذَلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ﴾ (ئەو قسە بنا لەسەر تفسيری (أبن جرير) وسائری مفسّرينی ديكە، قسەی (يوسف)ە!) بۆيە پێم داگرت تاكو لای سيّدم معلوم بێ كەمن لەپەنادا خيانەتم لە حەقی نەكرديە، بە أدنا سۆئێ تعرضّي ناموس وشەرەفی نەبوويم! ژنەكەی فێری كرد منی لە نَظر سَيّدم مُتَّهَم كرد، تاوای كرد بە حەپيس كردنی دام. ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي كَيْدَ الْخَائنِينَ﴾ سرپيان هەڵدەماڵێ، خيانەتيان تَبَيُّن دەكا، مُتَضَحْ دەبن. بنا لە تفسيری (سيّد رشيد) قسەی إمرأة العَزيزە، يعنی ئەو إقرارو شهادەتم بۆيەيە تا (يوسف) بزانێ لەو وەقتەوە كە حەپسە لێم بزر بووە خيانەتم لەگەڵ نەكرديە، وەلای ژنەكانيشم لە وەقتی خۆی لە حضوري وی پێ لێنايە كە من مراوەدەی وی كرديە، وە ئەو إقرارەش لە حضوری مَلِكی لە غَيْبی (يوسف) دەكەم. هەرچەند ئەو عبارەتە لە عيبارەتی إمرأة العَزيز نێزيكە، أمّا ئەو معنايە دوورە! مَعْنای جَمهوری مَفهوم ومَعقولە. ئەمە باوابێ قسەی بێ معنا ئەمەيە! قسە قسەی (يوسف)ە! أمّا ضَميري (لِيَعْلَمَ) راجعی خوايە، يعنی بۆيە خۆم گرت وطلبی إظهاری حاڵی نسوەم كرد، تاخوا بزانێ من عصيانی خوام نەكرديە، توخوا ئەمە قسەيە؟ كەسێ إيمانی بە علمی خوا هەبێ چۆن ئەم قسە دەكا؟ وەلەو مقامە أصلاً فهم ناكرێ. حاصڵی قسەی جاهلانەيە، ئەگەر خائنانە نەبێ.

(سيّد رشيد) وجهێ تريش دەفەرموێ باز قسە قسەی إمرأة العزيزە ضميری (لِيَعْلَمَ لَمْ أَخُنه) راجعن بۆ عزيز، بە كوردی خيانەتی نەكرديە يعنی جماع نەبووە. گۆيیا ئەوەی كرديتی خيانەت نەبووە! (بەڵێ شەل نيە أمّا پای شكاوە)!، ئايا رێك نەكەوتنی هەلاونەكەی بە مەيلی خانم بوو تابڵێ (لَمْ أَخُنه)؟! وەكەسێ أدنا إنصافی هەبێ، دەزانێ.

# ناوەڕۆكی بەرگی چوارەم